## دکتۆر ئەحمەد ڕازی

د. ئەحمەد موحەممەد ڕازی، لەدایکبووی ساڵی (١٩٩٢)
- بڕوانامەی ئیجازەی مەلایەتی لەلایەن مامۆستا شێخ موحەممەدی بەرزنجییەوە (٢٠١٠). بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زانستی فەرمووده بە پلەی نایاب لە زانکۆی مەدینە. بڕوانامەی ماستەر لە بەشی ڕۆشبیری و بانگەوازیی ئیسلامی بە پلەی نایاب لە هەمان زانکۆ. بڕوانامەی دکتۆرا لەسەر ڕۆژهەڵاتناسان. بڕوانامەی (قراءة الحفص و الشعبة و ابن كثير و أبو جعفر). لەگەڵ دەیان ئیجازاتی پەرتووکە موسنەدەکانی وەک بوخاری و موسلیم و هەر چوار سونەنەکە و چەند پەرتووکێکی تر بە ئیجازەی (خاصة من معين لمعين في معين) لەلایەن گەورە موسنیدانی هیند و خەلیجی وەرگرتووە.

**پەڕتووکە نووسراوەکانی:**

- سەڕابی ئیلحاد - ئیسلام و ڕۆژئاوا

لەگەڵ پێنج پەڕتووکی چاپنەکراو بە زمانی کوردی و عەرەبی. هەروەها خاوەنی چەندین نووسینی زانستی و وتاری فەلسەفییە.

**وانە هزرییەکانی:**

١- وەڵامدانەوەی مولحیدان/ ١٠ تراک
٢- ماسۆنییەت چییە؟/ ٤ تراک
٣- ڕۆڵی میدیا و ئیعلام لە شێواندنی وێنەی ئیسلام/ ٢ تراک
٤- ئافرەت و مافەکانی لای ئیسلام و نەیارانی/ ٢ تراک
٥- وەڵامێک لەسەر شوبهە و گومانی کۆیلە و کەنیزەک لەناو ئیسلامدا/ ١ تراک
٦- مارکسیزم/ ٣ تراک
٧- نووسین بە لاتینی لەنێوان چەپۆکی ئیمپریالیستەکان و نەزۆکی کورد و نیشتیمان ویستەکان/ ١ تراک
٨- ئیمپریالیستناسی/ ٣ تراک
٩- مێژووی فەلسەفەی یۆنانی/ ٩ تراک
١٠- سیکیۆلارزم ناسی/ ٤تراک
١١- یەزیدییەکان کێن؟/ ٤ تراک
١٢- فەلسەفەی فەلسەفە/ ٩ تراک
١٣- وەڵامی پرسە فەلسەفییەکان/ ٥ تراک
١٤-ڕۆژهەڵاتناسی و زانستی فەرموودە/ ٩ تراک

لەگەڵ دەیان وتاری جیاواز لەسەر بیردۆزە جیاوازەکانی وەک: داروین، سیگمۆند فرۆید، دیکارت و فەلسەفە ماتریالیزمییەکان و یۆنانییەکان.

**شیکردنەوەی وانە زانستییەکان:**

١-پەڕتووکی (نظم الورقات) ١٥ تراک
٢-پەرتووکی (الجزرية) ١٧ تراک
٣-پەرتووکی (الرحبية) ١٨ تراک
٤-پەرتووکی (ألفية العراقى) ٨ تراک
٥-پەرتووکی (مائة المعانى) ١٦ تراک
٦-پەرتووکی (شذور الذهب) ٣٥ تراک
٧-پەرتووکی (إظهار) ٨٠ تراک
٨-ڕەوانبێژی لە قورئانی پیرۆزدا/ ٩ تراک

لەگەڵ شیکردنەوەی پەرتووکی: (منهاج الطالبين، ألفية ابن مالك، جواهر البلاغة، مغني الطالب و ... هتد.)
هەروەها چەندین وانە و سیمیناری تر بە زمانی عەرەبی.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

لە کۆتاییەکانی ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیدا، دواکەوتوویی لە تەواوی بوارەکاندا بەرۆکی جیهانی ئیسلامیی گرتبوو. لە سەروو هەموویشیانەوە دواکەوتوویی سیاسی و سەربازی کە دەرئەنجامەکەی کەوتنی خەلافەتی عوسمانیی لێ کەوتەوە، دواتریش تەواوی زەوییەکانی نێو ئەو ئیمپراتۆرییەتە بوونە بەشی وڵاتانی خۆرئاوای داگیرکەر لە پێش هەموویانەوە بەریتانیا و فەرەنسا. خۆرئاواییەکان وەک هەنگاوی یەکەم سەرکەوتووبوون لەوەی لە رووی سیاسییەوە شکۆی موسڵمانان بشکێنن. لە سەروبەندی ڕووخاندنی خەلافەتی عوسمانیدا، جیهانی ئیسلامی کەوتە دۆخێکی مەترسیدارەوە. لاوازی لە تەواوی بوارەکاندا بەرۆکی جیهانی ئیسلامیی گرت، ئیمپریالیستی خۆرئاوایی لە پاڵ داگیرکاریی سەربازی، تەواوی هەوڵە هزری و ئایدیۆلۆژی و ڕاگەیاندنەکانی لەپێناو سەرخستنی ئامانجەکەیدا خستە گەڕ. لە ڕێی خۆرهەڵاتناس و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەوە کاریان دەکرد لە سەر ئاوەژووکردنەوەی ڕاستییەکان و لێڵکردنی شوناسی موسڵمانان.

دوای سەرهەڵدانی شۆڕشی بەلشەفی و هاتنەپێشەوەی شیوعییەکان، دۆخی موسڵمانان لە تەواوی ڕووەکانەوە مەترسیی گەورەی بە خۆیەوە بینی. هاوتەریب لەگەڵ خۆرئاوا، یەکێتیی سۆڤییەت هەنگاوی گەورەی دەنا بۆ لاوازکردنی ئیسلام بەتایبەتی لە ناوچەکانی بەلقان. دوای ڕووخاندنی

بلۆکی خۆرهەڵات، خۆرئاوا سیستەمێکی جیهانیی نوێی بە سەرکردایەتیی ئەمەریکا ڕاگەیاند کە تێیدا کاری لە پێشینەیان لاوازکردنی موسڵمانان و دوورخستنەوەیان بوو لە جیهانی ئیسلامی. ئیتر تەواو دەستکراوە بوون بۆ لێدانی جیهانی ئیسلامی. زایۆنییەکانی جیهان توانای دارایی و لۆجیستییان خستە خزمەتی ئەو پڕۆژەیەوە، بە تەواوی پلانیانەوە لە سەر چەندین خاڵ کاریان دەکرد، بە تایبەتی بابەتی بڵاوکردنەوەی بێڕەوشتی، بەو پێیەی دروست لەوە گەیشتبوون ئەوەی بە چەک و هێز ناکرێت، دەکرێت لە ڕێگەی تێکدانی ڕەوشتەوە ڕوو بدات، وەک دەڵێن: (كأس وغانية يفعلان في الأمة المحمدية مالا يفعله ألف مدفع) «پێکێک و گۆرانییەک کارێک دەکات بە ئومەتی موحەمەد کە هەزار تۆپ ئەنجامی نادات.» دواتر لە ڕێگەی تۆڕێکی فراوانەوە، بزووتنەوەی مژدەدەران بە لەبەرچاوگرتنی دۆخی لاوازیی ئابووری و هزری موسڵمانان چالاکییەکانیان چڕ کردەوە. لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکیی بزوتنەوەی مژدەدەران بانگەواز نەبوو بۆ مەسیحییەت، هێندەی پلانێک بوو بۆ دوورخستنەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەیان، وەک زەویمەر سەرۆکی کۆمەڵەی مژدەدەران لە کۆنگرەی قودسدا دەڵێت: (إن مهمتكم - أيها المبشرون، ليس بإدخال المسلمين في النصرانية، فإنهم لن يدخلوا بهذه السرعة، إن مهمتكم أن تفصلوهم من الدين) «مژدەدەرانی بەڕێز، کاری ئێوە ئەوە نییە موسڵمانان بکەن بە نەسرانی، ئەوان بەم زووییە نابنە نەسرانی، کاری سەرەکیی ئێوە بریتییە لە دوورخستنەوەیان لە ئایینەکەیان.»

لە دوو دەیەی ڕابردوودا، مەترسییەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی کەوتنە قۆناغێکی تەواو مەترسیدارەوە. لە ڕووی سەربازییەوە، ئیمپریالیستی نوێ لە بەرگێکی نوێدا دەرکەوت، بنکەی سەربازییان لە تەواوی جیهانی ئیسلامی دامەزراند، بانگەشەی هزریی نەتەوەیی و عالەمانییەت وەک جێگرەوەی شەریعەت و پەیوەندیی ئایینی بەرەوپێشچوونی گەورەی بە خۆیەوە بینی.

پیلانەکان لە ژێر پەردەی مافەکانی مرۆڤ و مافی ئافرەت و ئازادیی تاکەکەسی و مافی کەمەنەتەوەیی و ئایینییەکان تا دەهات زەقتر دەبوونەوە.

لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ڕاگەیاندنی بیستراو و بینراو و خوێنراو و بڵاوبوونەوەی بە ئاسانی بە نێو تەواوی جیهاندا ماکینەی ڕاگەیاندنی نەیاران بە شێوەیەکی مەترسیدار لە دژی ئیسلام و موسڵمانان کەوتە کار، بە سەدان ناوەندی زەبەلاح لە سەرانسەری دونیادا شەو و ڕۆژ لەم پێناوەدا کار دەکەن و زایۆنییەکان دەستێکی باڵایان لەم بوارەدا هەیە.

بابەتی مافەکانی ئافرەتان، یەکێکە لەو بابەتانەی بە هۆیەوە زۆرترین هێرش کراوەتە سەر ئیسلام. هەوڵ دەدرێت خێزانی ئیسلامی وەک خێزانێکی دیکتاتۆر و دڕندە و دژە ئافرەت وێنا بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەیش سەدان ڕێکخراوی هەمەچەشنەیان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی دروست کردووە.

بابەتی مافی کەمەنەتەوە و ئیتنیکییەکان یەکێکی ترە لە و دەلاقانەی کە نەیاران لێوەی هێرشی ناڕەوا دەکەن، بە ئومێدی ئەوەی ئیسلام جگە لە خۆی و لایەنگرانی، هیچ ڕەنگ و بیرکردنەوەیەکی جیاوازی قەبووڵ نییە، سەدان ڕێکخراو لە ژێر پەردەی ئەم بابەتەدا لە جیهانی ئیسلامیدا کار دەکەن.

لە پاڵ هەموو ئەمانەدا لە سێ دەیەی ڕابردوودا، بابەتی لکاندنی تیرۆر و تۆمەتبارکردنی موسڵمان بە تیرۆر زۆرترین گرنگیی پێ دراوە، بە تایبەتی دوای ڕووخانی یەکێتیی سۆڤییەت و یەک جەمسەریی دەسەڵاتی جیهانی بە سەرکردایەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەڵەمان نەکردووە ئەم هەنگاوە بە پڕ مەترسیترین هەنگاو دژی موسڵمان هەژمار بکەین کە بە هۆیەوە لە سەرانسەری جیهاندا هەزاران موسڵمان کوژران و چەندین وڵات بەم هۆیەوە داگیر کران و تەواوی چالاکیی ڕۆشنبیری و بانگەوازی موسڵمانان کەوتنە دۆخێکی مەترسیدارەوە.

لەم پەرتووکەدا هەوڵمان داوە بە شێوەیەکی زانستیی ورد پیلانی هەمەڕەنگ و هەمەچەشنی خۆرئاواییەکان لە نموونەی گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن، زیندووکردنەوەی هزریی نەتەوەیی، مەترسیی ڕاگەیاندن و تەواوی بابەتەکانی پەیوەست بەم بوارە و چەندین بابەتی گرنگی تر کە لە ئێستادا پێویستە موسڵمانان لە هەموو کات زیاتر هۆشیارییان بەرانبەری هەبێت، بە تایبەتیتر کۆمەڵگەی کوردی وەک بەشێکی دانەبڕاو لە جیهانی ئیسلامی.

ئەحمەد موحەممەد ڕازی

مەدینەی پیرۆز - پایزی ٢٠١٩

٠٠٩٦٦٥٦٨٣٤٩٠١٩

Ahmadalrazi7@gmail.com

# دەروازە و مێژوو

مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان خۆرئاوا و ئیسلام، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام. تەماشاکردنێکی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی ڕوم ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە موسڵمانان لەگەڵ کەمیی ژمارەیان و نەبوونی کیانێکی سەربەخۆ، کەچی بە وردی و دوودڵییەوە ڕوانیویانەتە ڕووداوە جیهانییەکانی ئەو کات کە خۆی دەبینییەوە لە کێبڕکێ و دەسەڵات و هەیمەنەی هەردوو ئیمپڕاتۆرییەتی ساسانی و ڕۆمانی، لە پاڵ موسڵماناندا، هاوکات موشریکەکانی مەککە بە هەمان شێوە چاودێریی دۆخی ئەو کاتەی جیهانیان دەکرد.

دیارە هەر یەک لە موسڵمانان و موشریکەکان خاوەنی تێڕوانینی تایبەت بوون سەبارەت بە لایەنگرییان، بۆیە هەر یەکێک لەو دوو هێزە جیهانییە موسڵمانەکان وەک سروشتی ئایینی خۆیان، پێیان خۆش بوو لەو کێبڕکێ جیهانییەدا تەرازووی هێز لە بەرژەوەندیی دەوڵەتی ڕۆمانی بێت، بەو پێیەی ئەوان خاوەن پەرتووک و ئایینێکی ئاسمانین، خاوەنی چەندین خاڵی هاوبەشن لەگەڵ موسڵمانەکاندا. لە هەمان کاتدا دەبینین موشریکەکان پێیان خوش بوو و بەرژەوەندییان لەگەڵ سەرکەوتنی ساسانییەکاندا بوو، دیارە ئەم پێخۆشبوون و پێخۆشنەبوونە هەر وا شتێکی سادە نەبووە، بەڵکوو دابەشبوونی کۆمەڵگە بووە بۆ دوو قوتابخانەی بیروباوەڕی جیا لە یەکتری. سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی هەر یەکیان واتای قورسی و سووکیی تەرازووی هێزی ئیمان و شیرک، سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی هەر لایەکیان سنووری جوگرافیای بەزاندبوو. دەبینین دواتر خوای گەورە لە ئاسمانەوە هەواڵی داهاتووی ئەم کێبڕکێ

جیهانییە بە موسڵمانان دەگەیەنێت، هەواڵی ئەوە بە موسڵمانان دەدات کە ڕۆمەکان دوای چەند ساڵێکی تر سەر دەکەون بە سەر فارسەکاندا وەک قورئان ئاماژەی پێ دەکات ﴿غُلِبَتِ الرُّومُ ۞ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ﴾[الروم: ۲ – ۳]

لە دوای هێرشی خاچپەرستان و بەربەرییەتی ئیمپریالیستی نوێ، موسڵمانان بهرهنگاریی خۆرئاوایەکی دوژمن و داگیرکەر بوونەوە کە دەیەوێت هەموو شت لە ناو بەرێت. دەیەوێت سیاسەتی تەنیا من پەیڕەو بکات، ژیان و ماف و ئازادی و خۆشگوزەرانی و هەموو شت بۆ خۆی ڕەوا دەبینێت. جگە لە خۆی، کەس مافی ژیان و گوزەرانی نییە. ئیتر هەر لەو کاتەوە تاوەکوو ئێستا خۆرئاواییەکان تەواوی هەوڵی سەربازی و سیاسی و بازرگانی و ڕاگەیاندنیان بەرانبەر موسڵمانان خستووەتە گەڕ و لە هەوڵی ئەوەدا بوون موسڵمانان وەک هێزێکی دڕندە و داگیرکار بناسێن. هەر بۆ ئەم مەبەستە چەمکی (Pan Islamism) هێنایە پێشەوە. بە گشتی ئەم چەمکە بەرهەمی دەستی سیاسەتمەدارانی خۆرئاوایە، ئەوان هەمیشە گەلانی خۆیان لە مەترسیی گەلانی ئیسلامی ئاگادار دەکەنەوە، بە بیانووی ئەوەی گوایە گەلانی موسڵمان گەلانێکی دڕندە و نەخوێندەوارن و بە ناوی ئیسلامەوە کۆدەبنەوە بە مەبەستی لەناوبردنی شارستانییەتی خۆرئاوایی مەسیحی. سیاسەتمەدارانی ئەورووپا ئەوکات و ئێستایشی لەگەڵدا بێت هەمیشە وایان پیشانی میللەتانی خۆیان داوە کە موسڵمانان خەڵکانێکی دڕندە و توندڕەون، گەر دەسەڵاتیان هەبێت، دێن و خەڵکانی ئەورووپا دەخۆن و پارچەپارچەیان

دەکەن. هەر لەم دیدگایەوە سەرۆکی ئەمریکا (ڕیتشارد نیکسون)[١] دەڵێت[٢]: "موسڵمانان هێزێکی خوێناوین لە ڕێگەی هێز و شمشێرەوە بڵاو بوونەتەوە، گەر لێیان بگەڕێین دەبنە هێزێکی جیۆپۆلۆتیکی توندڕەو." تۆمەتێکی لەم شێوەیە لە کاتێکدا خودی ئەمریکا بووەتە مایەی کوشتنی چەندین ملیۆن کەس، گەر بە شێوەیەکی سەرپێیی بەراوردکاری بکەین لەنێوان ئەو کەسانەی بە هۆی سیاسەتی دوژمنکاریی ئەمریکاوە لەناو چوون، ئەوە ژمارەیەکی بێ ئەندازەیە بە بەراورد بە ژمارەی کوژراوانی سەردەمی پێغەمبەر ( ﷺ. گەر ژمارەی تەواوی کوژراوانی سەردەمی پێغەمبەر( ﷺ کۆ بکەینەوە، بە باوەڕدار و بێباوەڕانەوە، ناگاتە چوار سەد کەس.[٣]

لە بەرانبەر تۆمەتبارکردنی ئیسلام و موسڵمانان بە کۆمەڵکوژی، دەکرێت بپرسین بۆچی هەمووان بێدەنگن لە بەرانبەر کۆمەڵکوژییەکانی ستالین کە بووە مایەی لەناوچوونی نزیکەی چل ملیۆن کەس و هیچ کەس بە ئەنجامدانی تیرۆر تاوانباری ناکات. بەڵام هەر موسڵمانێک لە جێگەیەکی ئەم دونیایە بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات، ڕاستەوخۆ تۆمەتی تیرۆری دەدرێتە پاڵ. دەکرێت بپرسین، تیرۆریست کێیە؟ لە سەرانسەری دونیادا کێ تیرۆر ئەنجام دەدات؟ دەپرسین کاتێک تەقینەوەیەک یاخود کارێکی تیرۆریستی ڕوو دەدات، ڕاگەیاندنی ئەورووپی چۆن بەو خێراییە دەیدەنە پاڵ گرووپێکی ئیسلامیی دیاریکراو و زیاد لەمە تەواوی وردەکارییەکانی پەیوەست بە کارە

---

(١) ڕیچارد نیکسۆن ماوەی ژیان: ٩ی کانوونی دووەمی ١٩١٣ تاوەکوو ٢٢ی نیسانی ٢٠١٤. ٣٧ەمین سەرۆک کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، لە ماوەی ١٩٦٩ تاکوو ١٩٧٤. ڕیچارد نیکسۆن تاکە سەرۆک کۆماری ئەمریکایە کە وازی لە پۆستەکەی هێنابێت.

(٢) الفرصة السانحة: ڕیچارد نیکسون، ترجمته الى العربية أحمد صدقي مراد، طبعة القاهرة ١٩٩٢، ص ٢٨، ١٥٢، ١٥٣.

(٣) الدرر في اختصار المغازي والسير. لابن عبد البر. الناشر: المجلس الأعلى للشؤن الإسلامية بمصر_القاهرة. سنة ١٩٦٦ ص ٧٧.

تیرۆریستییەکە بڵاودەکەنەوە، بگرە زۆر جار نییەت و ویستی پێشوەختەی کارە تیرۆریستییەکانیش بڵاو دەکەنەوە. هەموو ئەم زانیارییە وردانە پرسیاری گەورە لە هزری هەر کەسێکی عاقڵدا دروست دەکەن. لەم چوارچێوەیەدا دەکرێت پرسیاری ئەوە بێتە پێشەوە، ئایا وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمریکا «هیلاری کلینتۆن» ڕاستگۆ نەبوو لەوەی کە دەڵێت: داعش لەلایەن ئەوانەوە دامەزراوە؟ «ترامپ» ڕاستگۆ نەبوو لەوەی کاتێک ڕایگەیاند کە داعش لەلایەن «ئۆباما»وە دروست کراوە؟ حاڵی ئەورووپایش لەم لایەنەوە هێندە باش نییە. دیموکراتخوازانی ئەورووپا لە ئێستا و ڕابردوودا زۆرترین پێشێلکارییان ئەنجام داوە لە هێرشی خاچپەرستان و قۆناغی دواتر لە سەردەمی ئیمپریالیستی نوێدا، هێرشێکی دڕندانەیان کردە سەر خۆرهەڵات، چەندین وڵاتیان داگیر کرد و بە سەدان هەزار کەسیان کومەڵکوژ کرد و زمان و کەلتووری خۆیان بە سەر تەواوی ناوچەکەدا زاڵ کرد، بە تایبەتی سەپاندنی زمانی خۆیان بە زۆر بە سەر دانیشتوانی ئەو وڵاتانە لە چوارچێوەی داگیرکارییەکاندا. وڵاتێکی وەک شانشینی بەریتانیا بە تەنیا ٢٠٠ وڵاتی داگیر کرد و توانیی هەموو جیهان، جگە لە دوو وڵات بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. فەڕەنسای باوکی دیموکراتییەت و لە ژێر ناوی جیاجیادا نزیکەی ٣٢ وڵاتی داگیر کرد و تەواوی خێر و بێر و سەرچاوە داراییەکانی ئەو وڵاتانەی بە تاڵان برد و کاریگەریی نەرێنی لە سەر ئەو وڵاتانە بە جێ هێشت. بە شێوەیەک تاوەکوو ئێستایشی لەگەڵ بێت دانیشتوانی ئەو وڵاتانە لە ژێر کاریگەرییەکانی ئەو داگیرکارییە دەناڵێنن، بە تایبەتی هێرشە ئیمپریالیستییەکانی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٣٥٤–١٩٨٠ز)، بە جۆرێک لە سەرەتاوە توانیی ژمارەیەک لە وڵاتە لاوازەکان بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، دواتر لە ڕێی ئەو داگیرکارییانەوە ئیرادەی وڵاتانی زلهێزی لە بەرانبەر خۆیدا لاواز کرا. لە کۆتاییدا، بە هۆی کێشمەکێشمیان لەسەر داگیرکاری و هەژموونی سیاسی و سەربازی و ئابووریی

خۆیان لەگەڵ بەریتانیای گەورە، بەریەککەوتنی گەورە لەنێوانیاندا ڕووی دا. دواتر ساڵی ١٩١٦ هەردوو لا ڕێککەوتن لە سەر دابەشکردنی میراتیی دەوڵەتی عوسمانی، ئەوەی کە ناسراوە بە پەیماننامەی سایکس بیکۆ[1] لەنێوان هەردوو دیبلۆماتکاری فەرەنسی «فرانسۆ جۆرج بیکۆن» و «مارک سایکس» دواتر ئەم ڕێکەوتننامەیە نەهامەتییەکی گەورەی بە دوای خۆیدا هێنا. بە هۆیەوە وڵاتانی ئیسلامی پەرتەوازە بوون، نەهامەتی بەرۆکی هەموو لایەکی گرتەوە، جەنگێکی ئابووری و هزرییان دژی ئەو وڵاتانە دەست پێ کرد. لەو کاتەوە تا ئێستایشی لەگەڵ بێت تەواوی بەرهەڵستکارانی سیاسەتی خۆرئاوا بە تیرۆریست ناو دەبەن. باشووری کوردستانیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لە وڵاتانی ناوچەکە کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو جەنگە سەربازی و هزرییەوە، بە شێوەیەک لە چوارچێوەی دابەشکارییەکانی ناوچەکەدا، کوردستان کرا بە چوار بەشەوە. دوای ئەم زنجیرە نەهامەتییەی سەر شانی کورد دەبوو گوتاری کورد ڕوو لە ستەمی خۆرئاواییەکان بووایە بەرانبەر کورد، بەڵام بە شێوەیەکی سروشتی باس لە ئیسلام و مێژووی ئیسلام دەکەن.

تەنیا بەریتانیا و فەرەنسا نین کە وڵاتانی ئیسلامیان داگیر کردبوو، بەڵکوو لە پاڵ ئەم دوو وڵاتەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە وڵاتانی تری خۆرئاوایی لە نموونەی ئیسپانیا و هۆڵەندا و ئیتاڵیا و پورتوگال، زۆرێک لە وڵاتانی ئەفریقا و ئاسیایان داگیر کرد. زیاد لە هەموو ئەمانە داگیرکاریی ڕووسی کە

---

(١) ڕێکەوتننامەی سایکس-پیکۆ کە بە فەرمی ڕێککەوتننامەی ناوەندی ئاسیایە، ماوەی ڕێککەوتننامە: ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩١٥ تاکوو ئازاری ١٩١٦، ڕێککەوتننامەیەکی نهێنیی بەریتانیای گەورە بە ئێرلەنداوە لەگەڵ فەرەنسا، هەروەها بە ڕازیبوونی ئیمپراتۆری ڕووسیا بوو. ئامانجی ئەم ڕێککەوتننامەیە، دابەشکردنی خاکی ئەو وڵاتانە بوو کە لە ژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون. ئەم خاکانە دران بە هەر یەکە لە ڕووسیا و بەریتانیا و فەرەنسا. ناوی ئەم ڕێککەوتننامەیە لە ناوی مارک سایکس ڕاوێژکاری دیبلۆماتی بەریتانی و فرانسوا جۆرج پیکۆن سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە لەندەن وەرگیراوە.

بە خوێنڕێژترین داگیرکاری مێژوو ناسراوە، بە دەیان میللەت و کەمەنەتەوەی چەوساندووەتەوە، هەمیشە سیاسەتی پاوانخوازیی لەسەر حیسابی ئەوانی تر پەیڕەو کردووە. بە شێوەیەک لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، پانتاییەکەی یەک ملیۆن کیلۆمەتر بووە، بەڵام ئێستا پانتاییی ئەو وڵاتە ١٧ ملیۆن کیلۆمەترە، جگە لەو وڵاتانەی کە داگیری کردوون بە زەبری ئاگر و ئاسن چەندین میللەتی ناوچەکەیان ناچاری ویستی خۆیان کردووە، لە کاتێکدا ئەو وڵاتانە نەک هەر پێچەوانەی کەلتوورن، بگرە ئایین و ڕەگەزیان تەواو جیاوازە لە وڵاتی داگیرکار. لە نموونەی کۆمارەکانی: تاتارستان، شیشان، داغستان، ئەنگۆشیا، کازان، سیبریا، ناوچەکانی بەڵقان، شەرکەسیا و ... زۆرێکی تر لەو ناوچانەی کە بە زۆرەملێ بە دەوڵەوتی ڕووسیاوە لکێنراون.

هەموو ئەمانە وەک سەرەقەڵەمێکن لەبارەی هەژموونی داگیرکاریی ڕووسی و ئەورووپی، دواتر هەوڵ دەدەین بە درێژی لەم بارەیەوە بدوێین. هەموو ئەمانە لەپێناو ئەوەی تاوەکوو ئەوانی تر بە دروستی لە تیرۆری کرداری و هزری ئەورووپی بگەن. هەڵبەت سەلماندنی ئەم بابەتە بۆ کەسانێکی بێئاگا لە مێژوو یاخود کاریگەر لە ژێر هەژموونی شارستانیەتی خۆرئاوا کارێکی دژوارە[١] دەکرێت ئەوانی تر کاتێک لەم بابەتە تێ بگەن کە کار و هەنگاوەکانی ئەوان پێچەوانە بکرێتەوە و بدرێتە پاڵ ئیسلام، واتە دەکرێت بپرسیت ئەوە وڵاتانی ئیسلامی بوون یان موسڵمانەکان بوون ٢٠٠ وڵاتی دونیایان داگیر کرد؟ ئەوە موسڵمانان بوون نزیکەی پەنجا دەوڵەتی دونیایان بەزۆر خزاندە سنووری جوگرافیای خۆیانەوە؟ ئەوە موسڵمانان بوون ئەمریکایان داگیر کرد و سنووری دەستکردیان لەنێوان وڵاتانی ئەمریکای باشوور و باکووردا دروست کرد و لە ڕێی هێزی سەربازی و بە هاوکاریی دەسەڵاتدارە بەکرێگیراوەکانەوە، ئەو

---

(١)هەڵبەت کاتێک باس لەو ئەورووپا دەکرێت، مەبەستمان پێی سیستمی سیاسی و دەسەڵاتدارەکانە، نەوەکوو میللەت و گەلانی ئەورووپا.

سنوورەیان بە سەر خەڵکدا چەسپاند و بە زۆر زمان و کەلتووری خۆیان بە سەر دانیشتوانی ئەو ناوچانەدا سەپاند؟ یاخود موسڵمانان وڵاتانی ئەورووپایان داگیر کردووە و بنکەی سەربازییان تێدا بونیاد ناوە؟ گریمانەیەکی لۆژیکییە، دەبێت ئەو کات لەبارەی موسڵمانەوە چی بگوترایە، ئەو کات تەواوی ڕاگەیاندنەکانی دونیا دەهاتنە سەر خەت و دونیایان پڕ دەکرد لە هەڵا و ئەو کات سەد بەرانبەری ئێستا دژایەتیی ئیسلامیان دەکرد. ڕەنگە گومانی ئەوە بورووژێنرێت کە ئەم بەراوردکارییە گریمانەییە نالۆژیکییە بەو پێیەی پاڵنەری تیرۆر و توندڕەوی لای موسڵمانان خودی ئایینە، بەڵام بە پێچەوانەوە پاڵنەری ئەم بابەتە لای خۆرئاواییەکان، سیاسەت و بەرژەوەندییە. هەڵبەت ڕوانینێکی لەم شێوەیە پێچەوانەی واقیع و ڕووداوە مێژووییەکانە، بەو واتایەی هەمیشە پاڵنەری ئایینی زاڵتر بووە بە سەر پاڵنەری سیاسی و بەرژەوەندیی ئابووریدا.

لە کۆتاییدا ئەوەی گرنگە و مایەی سەرکۆنەکردنە، خودی ستەم و ڕەشەکوژییەکەیە، ئیتر پاڵنەرەکەی هەر چی بێت جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. دیسانەوە دێینەوە سەر ئەو بابەتە و دەپرسین ئایا خۆرئاواییەکان تەنیا بە پاڵنەری سیاسیی جیهانی ئیسلامیان داگیر کرد؟ پاڵنەری ئایینی یەکێک لە بەهێزترین پاڵنەرەکانی هێرشی خۆرئاواییەکانە بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لە سەروبەندی جەنگی جیهانیی یەکەم. «لوید جۆرج» وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی بەریتانیا جەنگی یەکەمی جیهانی بە جەنگ و هێرشی خاچی دووەم ناو دەبات. هەر لە چوارچێوەی ئەو پاڵنەر و کاردانەوە ئایینییانە دوای داگیرکردنی دیمەشق لە ساڵی ١٩٢٠، ژەنەڕاڵ «گۆرۆ» چووە سەر گۆڕەکەی «سەلاحەدین» و شەقێکی لە گۆڕەکەی هەڵدا و بە جۆرێک لە خۆشحاڵییەوە گوتی: «ئابینی سەلاحەدین ئەوە ئێمە گەڕاینەوە.»[1]

---

(١) بڕوانە: احذروا الاساليب الحديثة في مواجهة الإسلام: الدكتور سعد الدين صالح، مكتبة الصحابة ١٩٩٨. ص ٢٩-٣٠.

نەک هەر لە سەر ئاستی ناوەندە فەرمی و سیاسییەکانیان هێرش کراوە، بەڵکوو ناوەندە ئایینییەکانی خۆرئاوا دەورێکی کاریگەریان بینیوە لە ڕێکخستن و ئەنجامدان و سەرپەرشتیکردنی ئەو هێرشانە. لەوانە هەوڵەکانی کڵێسای بیزەنتیی خۆرهەڵاتی ئۆرسۆدۆکسی بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لە ساڵی ٩٧٢ز بە سەرکردایەتیی «یۆحەنا تزیمکس» و چەندین ناوچەی جیهانی ئیسلامییان داگیر کرد، لەوانە شاری «نسیبین» ئەمە جگە لە هێرشی خاچپەرستیی یەکەم کە لە ساڵی ١٠٩٥ بە هاندانی «بابا ئاریانی دووەم» کوشتارێکی گەورەیان دژی موسڵمانان ئەنجام دا و دواتر هێرشی خاچپەرستیی دووەم کە تێیدا قودسیان داگیر کرد. تەنیا لە قودسدا نزیکەی ٧٠٠ هەزار کەسیان کۆمەڵکوژ کرد.[١] هەر لەم چوارچێوەیەدا نووسەری فەرەنسی «جان جاک ڕۆسۆ» دەڵێت: "ئەوانەی کە جەنگی خاچپەرستییان ئەنجام دا، جەنگاوەری قەسیسییەکان و هاوەڵانی کڵێساکان بوون، لەپێناوی کڵێسادا جەنگاون."[٢] «یوجین ڕۆستۆ» ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا «جۆنسۆن» لەم بارەوە دەڵێت: "پێویستە چاک بزانین جیاوازی و ناکۆکیی ئێمە لەگەڵ عەرەب لە سەر دەوڵەت نییە، بەڵکوو ناکۆکیی ئێمە لەگەڵ ئەوان ناکۆکییە لەنێوان شارستانییەتی ئیسلامی و شارستانییەتی مەسیحیدا."[٣] بەیەکدادانی موسڵمانان لە تەواوی ناوچەکانی دونیا بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە کە بە هۆیەوە هەزاران کەس بوونە قوربانی، دواتریش کە دەیانەوێت کۆچ بکەن بەرەو ئەورووپا، ڕێیان لێ دەگرن و بە ناچاری لە ڕێگەی قاچاخەوە هەوڵی گەیشتن بە ئەورووپا و خۆرئاوا دەدەن و هەزارانیان لە ڕێگە لەناو دەچن و دەخنکێن.

دەکرێت بپرسین، هۆکاری نەهامەتییەکانی وڵاتانی ئیسلامی چییە و

---

(١) الشيخ محمد الغزالي هموم الداعية، ص ٣٥. ب: دار القلم. سنة ٢٠٠٦.

(٢) قاده الغرب يقولون دمروا الإسلام و أبيدوا أهله، جلال العالم الطبعة الأولى ١٩٧٤ ص ٢٨.

(٣)قادة الغرب يقولون، ص ٢٨.

ئەو ڕێژە زۆرەی هەژاری لە وڵاتانی خۆرهەڵات و ئەفریقا، بۆچی و لەپای چی؟ ئایا خۆرئاواییەکان ناتوانن لەو دۆخە دەربازیان بکەن؟ جێگەی تێڕامانە خۆراک و پێداویستی و هاوکارییەکان ناگات، بەڵام سەدان جۆر چەکوچۆلی ئەمریکی دەگاتە سووریا و عێراق و یەمەن و وڵاتانی تری ناوچەکە، بەڵام هیچ هاوکارییەک ناگاتە ئەو وڵاتانە. سیاسەتێکی دووفاقیی نارەوشتی، دەسەڵاتدارانی ناوچە ئاڵۆزەکان ڕێگە دەدەن بنکەی سەربازیی خۆرئاواییەکان لە ناوچەکانیان دابمەزرێت، بەڵام ناتوانن هاوکاری و پشتیوانی بگەیەنن بە جەماوەر و هاوڵاتییانی تر، یان ئەوەتا هەموو لایەک هاوکاریی یەکترن لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان. لەم چوارچێوەیەدا فەیلەسووفی فەرەنسی بەناوبانگ «گاروودی» ڕوو دەکاتە خۆرئاواییەکان و دەڵێت: «دەپرسین لەکاتێکدا خێر و بێری زەوی بەشی تەواوی دانیشتوانی جیهان دەکات، لەپێناو چیدا ئەمریکا، وڵاتانی تر ناچار دەکات لە سەر بەهەدەردانی لە سەدا پازدەی زەوییەکانیان، تاوەکوو نرخی دانەوێڵەی ئەمریکی وەک خۆی بمێنێتەوە»[1] پرسیاری ڕاستەقینە ئەوەیە کێ بەرپرسە لە جیهانی ئیسلامی؟ ئەمریکا و خۆرئاواییەکان بە چ ماف و پێوەرێک تەواوی خۆرهەڵاتی ئیسلامییان کۆنترۆڵ کردووە؟ مێژووی جوولەکە و مەسیحی لێوان لێوە لە تاوانی گەورە دەرهەق مرۆڤایەتی بە گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی. بە هیچ پێوەرێک مەزەندە ناکرێت، هەر لە کوشتن و لەناوبردنی پەیامبەران و نانەوەی ئاشووب و ئاژاوە لە سەر زەوی، تاوەکوو داگیرکردنەوەی قودس و تێکشکاندنی ئیرادەی میللەتێکی تر و دروستکردنی ئیسرائیل و چەوساندنەوەی موسڵمانانی فەلەستین. بە جۆرێک لە چوارچێوەی دەسترێژییەکانیان، زیاد لە ٥٣٠ ناوچەی جیاجیای فەلەستینی دووچاری کاولکاری هاتوون و زیاتر لە پەنجا

---

(١) الاسلام دين المستقبل روجيه جارودي ترجمه عبد المجيد بارودي. دار الإيمان للنشر والتوزيع ١٩٨٣. ص ٥٤.

هەزار هاوڵاتیی فەلەستینی کوژراون. بە تەنیا لە ساڵی ١٩٤٨دا، نزیکە سەد و شەش هەزار فەلەستینی بوونەتە قوربانیی تاوانی دەستی زایۆنییەکان، تەنیا لە تاوانێکی وەک کارەساتی سەبرا و شاتێلادا نزیکەی سێ هەزار و پێنج سەد کەس بوونە قوربانی. ئەمە جگە لە حەفتا تاوان و قەسابخانەی جیاواز لە سەر خاکی فەلەستین.[1] ئەمە تەنیا وەک سەرەقەڵەمێک لە تاوانی زایۆنییەکانی ئیسرائیل، جگە لە مێژووی دێرینی تاوانی جوولەکەکان و هەستی دوژمنکارانەیان وەک قورئانی پیرۆز وێنای دەکات ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ [المائدة: ٨٢]

لە بەرانبەردا نەتەوە یەکگرتووەکان بەرپرسیارن لە دابەشکردنی فەلەستین لە ساڵی ١٩٤٧ و لەناوچوونی هەشتا هەزار هاووڵاتیی فەلەستینی. بڕیارێکی لەو شێوەیە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، جگە لە هەوڵێکی دوژمنکارانەی ئەمریکا و خۆرئاواییەکان بەرانبەر موسڵمانان، زیاتر شتێکی تر نەبوو. گەر موسڵمانان هێندە دڕندە و خوێنخۆرن، ئێوە چۆن توانیتان بەو ئاسانییە موسڵمانان پەرتەوازە بکەن؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە هیچ کات وەڵامەکەی دەست ناکەوێت. لە ڕاستیدا خۆرئاواییەکان تەنیا تیرۆری سەربازییان بە کار نەهێناوە لەپێناو جێبەجێکردنی ویستەکانیان، زیاد لەمە چەندین کەرەستە و شێوازی جۆراوجۆریان لەپێناو سەپاندنی ویست و ئیرادەی خۆیان بە کار هێناوە. لەو چوارچێوەیەدا تیرۆری هزری گەورەترین چەکی دەستی خۆرئاواییەکانە بۆ لێدان و لاوازکردنی ئیرادە و هەژموونی موسڵمانان، بەو پێیەی باش لەوە تێگەیشتبوون، تەنیا سەرکوتکردنی سەربازی بەس نییە لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانان و تێکشکاندنی ئیرادەیان، بەڵکوو هاوتەریب لەگەڵ ئەم بابەتە بابەتی تیرۆری هزری گەورەترین چەکی دەستی خۆرئاواییەکان بووە.

---

(١) بڕوانە: اعلان جهاز الإحصاء الفلسطيني تاريخ ١٥ مايو، ١٩٤٨.

«جوانفیل» هاوڕێی نزیکی «لویسی نۆیەم» پادشای فەڕەنسی دەگێڕێتەوە ئەو ماوەیەی کە لە زینداندا بوو، گەییشتبووە ئەو باوەڕەی کە تەنیا بەکارهێنانی کەرەستەی سەربازی لەپێناو سەرکوتکردنی موسڵمانان هەنگاوێکی دروست نییە، بەڵکوو پێویستە هاوتەریب لەگەڵ هەنگاوی سەربازی ڕێوشوێنی جەنگی هزریی دژی موسڵمانان کورت بکرێتەوە، هەنگاوێکی لەم شێوەیە بە تەنیا ئەرکی فەڕەنسا نییە، بەڵکوو ئەرکی سەر شانی تەواوی وڵاتانی خۆرئاوایە.[1] لەو چوارچێوەیەدا خۆرهەڵاتناسی فەڕەنسیی سیاسی «هانوتو» دەڵێت: "پێویستە موسڵمانان بگۆڕدرێن و ئاراستە بکرێن بەرەو شارستانییەتی ئەورووپا بە مەبەستی ڕیشەکێشکردن و کۆتاییپێهێنانی مەترسیی شارستانییەت و هەژموونی موسڵمانان."[2] هەموو ئەمانە لەپێناو چەسپاندنی ئیمپریالیستی ئەورووپی لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی و شێواندنی ناوبانگی ئیسلام و لەکەدارکردنی موسڵمانان و نیشاندانی ئیسلام وەک ئایینێکی شێواو و پڕ لە تایفەی جیاواز و دژوانەییی نالۆژیکی، ئەمە جگە لە جیاوازیی نەتەوەیی و جوگرافیایی نەیاران. هەموو ئەمانە لەپێناوی ڕیشەکێشکردنی ئیسلام و دزێوکردنی وێنای موسڵمانان و هەڵگەڕاندنەوەی ئیسلام لە ئاڕاستە ڕوونەکەی خۆی.

لەڕاستیدا کرۆکی جەنگی هزری لە هەنگاوگەلی لەم شێوەیەدا خۆی دەبینێتەوە. هەڵبەت ئەم هەنگاوانە لەڕێی نوێنەرە خۆرئاواییەکانەوە ئەنجام دەدرێن، لەوانە چەندین بە ناو پسپۆڕ و شارەزای بواری شەریعەت و مێژووی ئیسلامی، بڕوانامەکانیان لە خۆرئاوا بەدەست دەهێنن، لە بەرانبەردا تەواو دەبنە گوێڕایەڵی خۆرئاوا و کەرەستەیەکی گونجاو بۆ جێبەجێکردنی ئەجێنداکانیان. بەشێک لەم خەڵکانە ئەستەمە لەوە تێبگەن کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ فێڵیان

---

(١) معركة المصحف في العالم الإسلامي شيخ محمد الغزالي، دار القلم للطباعة والنشر والتوزيع_دمشق سنة ٢٠٠٥ ص ١٦٢.

(٢) الله أو الدمار، سعد جمعة. ص ٦٦ . ب: المختار الإسلامي بمصر _ القاهرة.

لێ کراوە. لەم بارەیەوە بیرمەندی ئەمریکی «مارک توین» دەڵێت: "فێڵکردن لە خەڵکی و ئاڕاستەکردنیان بە شێوەیەکی چەواشەکارانە، ئاسانترە لەوەی باوەڕی پێ بهێنێت کە فێڵی لێ کراوە." چەواشەکردن و فێڵکردن لەوانی تر و بەتایبەتی جیهانی ئیسلامی کارێکی تەواو ئاسانە لای خۆرئاواییەکان، بە تایبەتیتر ئاڕاستەکردنی جیهانی ئیسلام بەرەو ئەو ئاڕاستە بیرکردنەوەیەی کە ئیسلام ئایینێکە لێوانلێوە لە تیرۆر و توندڕەوی.» کەم نەبوون ئەوانەی کەوتنە ژێر کاریگەری و بەرەنجامی ئەم هەولانەوە، خۆرئاواییەکان بۆ چەسپانی ئەم فۆڕمە لە بیرکردنەوە و ئاڕاستەکردن، چەندین کەرەستە و شێوازی جۆراوجۆریان گرتووەتە بەر، بە کورتی بەشێک لەو هەوڵ و کەرەستانە دەخەینە ڕوو، لەپێناوی ئەوەی موسڵمانان هۆشیار بن لە مێژووی تیرۆری هزریی خۆرئاواییەکان.

ئیرادەی پەروەردگار وایە کە لە جیهاندا دوو هێزی خۆرهەڵاتی و خۆرئاوایی بە هەمیشە لە بەرانبەر یەکتریدا بووەستنەوە. بە درێژایی مێژووی ئەم دوو هێزە بە پێی قۆناغە مێژوویيە جیاوازەکان، بۆ هەمیشە دژی یەکتری وەستاونەتەوە. لە قۆناغێکدا فارسەکان و ڕۆمەکان نوێنەرایەتیی ئەم کێشمەکێشمەیان کردووە، قۆناغی دواتر کێشمەکێشمی نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان، پاشان درێژ بووەوە بۆ بەرکەوتنی موسڵمانان و خاچییەکان، دواتریش بەریەککەوتنی نێوان عوسمانییەکان و خۆرئاواییەکان. دوا قۆناغ هەژموونی زەبەلاحی خۆرئاواییەکان و موسڵمانانی بێکیانی خۆرهەڵات. لە ڕاستیدا خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بوون لە کۆنترۆڵکردنی مەیدانی کێشمەکێشمەکان، بەو پێیەی لە پاڵ هەژموونی سەربازیی، تەواوی کەرەستەکانی جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی هزرییان خستبووە گەڕ. لامان سەیر نەبێت گەر پێمان وا بێت شارستانییەتی ئەورووپیی نوێ، لەسەر پاشماوەی شارستانییەتی خۆرهەڵات بونیاد نراوە. لە ڕێی هێرشە ئیمپریالیستەکانیانەوە زۆرێک لە کەلەپوور و سامانی نەتەوەیی

و زانستی خۆرهەڵاتیان دزی و گواستیانەوە بۆ ئەورووپا. دەستنووسخانە و مۆزەخانەکانی ئەورووپا گەورەترین شایەتیدەری ئەم ڕاستییەن، بە جۆرێک هیچ مۆزەخانەوە و عەنتیکەخانەیەکی خۆرئاوای نییە چەندین سەرمایەی گرنگی خۆرهەڵاتی تێدا نەبێت. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەم سەرمایە نەتەوەییە گرنگانەی خۆرهەڵات بە دیاری پێیان دراوە، یاخود لەڕێی هێرشی ئیمپریالیستییەکانیانەوە تاڵانیان کردووە. دەرئەنجامی ئەم بابەتە ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان بێ ئاگان لە شارستانیەتی ڕەسەنی خۆیان و بە شێوەیەکی شێتانە سەرسامی شارستانیەتی خۆرئاوا بوون. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، دوای ئەو هەوڵە فراوانەی خۆرئاواییەکان لەپێناو ئاڵۆزکردنی دۆخی موسڵمانان خۆرهەڵاتی ئیسلامی هێشتا چاوەڕێی ئەوەیە خۆرئاواییەکان بەختەوەری و خۆشگوزەرانیی بۆ دەستەبەر بکەن، یاخود دۆخێکی هێمن لە خۆرهەڵاتدا بخوڵقێنن، بێئاگا لەوەی خۆرئاواییەکان ئەو کات دژایەتیی خۆرهەڵاتیان دەکرد کە ئیسلامی تێدا نەبوو، ئێستا کە ئیسلامی تێدایە، زیاتر لە جاران دژایەتی دەکەن.

لە بەشەکانی ئەم پەرتووکەدا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی زانستییانە دیارترین ئەو پیلان و بەرنامەڕێژییانە بخەینە ڕوو کە خۆرئاواییەکان لە ڕێگەیانەوە هەوڵی لێدانی ئیسلام و لاوازکردنی موسڵمانان دەدەن.

# دروستکردنی دووبەرەکی لەنێوان موسڵماناندا

یەکێک لەو کەرەستانەی کە جیهانی خۆرئاوا گرتوویەتە بەر لەپێناو هەڵوەشاندنەوەی جیهانی ئیسلامی و تێکشاندنی ئیرادەی موسڵمانان، دروستکردنی دووبەرەکییە لەنێوان موسڵماناندا. لە چوارچێوەی ئەم هەوڵانەدا «لوان براون» دەڵێت: "هەر کات موسڵمانان یەک بگرن، دەبنە مایەی دروستبوونی شوومی و لەعنەت بۆ سەر جیهان، لەگەڵ پەرتەوازەبوونیان جیهان سەلامەت دەبێت."(١)

وەک پشتڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە «ئالمس سیمۆن» دەڵێت: "پێویستە باش ئەوە بزانیت کە یەکڕیزیی موسڵمان دەبێتە هۆکاری زاڵبوون بە سەر ئەورووپادا، بۆیە دەبێت ڕێگری بکرێت لە دروستبوونی یەکڕیزیی نێوان موسڵمانان."(٢)

هەر لە چوارچێوەی هۆشداریدان لەسەر مەترسیی یەکڕیزی و بەهێزبوونی موسڵمانان «ئارنۆڵد توینبی» لە پەرتووکی (الاسلام والغرب والمستقبل) دەڵێت: "ئێستا یەکڕیزیی موسڵمانان چەقی بەستووە، ئەوان وەک ئەوەی دەمانەوێت پەرتەوازەن، بەڵام دەبێت بە وریاییەوە لە مەترسیی بەئاگاهاتنەوەی موسڵمانان بڕوانین."

---

(١) الفكر الاسلامى وسموم التغريب و التبعية. أنور الجندى، دار الفضيلة للنشر والتوزيع والتصدير، سنة ١٩٩٩. ص ٣٧

(٢) كيف هدمت الخلافة الإسلامية، عبد القيوم ذلول، دار الأمة للطباعة والنشر والتوزيع، بالإمارات الطبعة الثانية، سنة ١٩٩٠. ص ١٩٢.

خۆرئاواییەکان لە چەندین جێگەدا باسیان لە مەترسیی بەئاگاهاتنەوەی موسڵمانان دەکەن، بەو پێیەی ئەوان باش لەوە تێگەیشتوون کە یەکڕیزیی موسڵمانان گەورەترین مەترسییە لەسەر جیهانی خۆرئاوا و پەرتەوازەییبان خزمەتی گەورە بە سیاسەتی ئەوان دەکات. خۆرئاواییەکان بۆ ساتێکیش لەم بابەتە بێ ئاگا نەبوون، زۆرێک لە موسڵمان بێ ئاگان لە سروشتی ئەم پلانانە. ناسینی دوژمن کارێکی دژوار نییە، بەڵام چۆنیەتیی دژایەتیکردنی دوژمن کارێکی تەواو دژوارە.

خۆرئاواییەکان لە چەندین جێگە و شوێنی تایبەتدا باسیان لە ڕاستی ئەم بابەتە کردووە. سمیسی ئەمەریکی شارەزای کاروباری پاکستان لەم بارەیەوە دەڵێت: "گەر ئازادیی تەواو بدرێت بە موسڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا، لە ژێر سیستمی دیموکراتیدا بژین، بە دڵنیاییی سەرکەوتنی گەورە بە دەست دەهێنن، بۆیە تەنیا لە ڕێی دیکتاتۆرییەتەوە دەتوانرێت موسڵمانان کۆنترۆڵ بکرێن و لە ئایینەکەیان دوور بخرێنەوە."[١]

لەم چوارچێوەیەدا سەرنووسەری گۆڤاری تایم لە پەرتووکی (سفر اسیا) ئامۆژگاریی کاربەدەستانی ئەمریکا دەکات و تیشک دەخاتە سەر ئەوەی پێویستە ئەمریکا لە وڵاتانی ئیسلامی چەندین دیکتاتۆرییەتی عەسکەری دروست بکات، تاوەکوو ئەوەی جارێکی تر ئیسلام نەگەڕێتەوە مەیدانی کێبڕکێ جیهانییەکان و کۆنترۆڵکردنی سەرکردایەتیی جیهان.[٢]

بە گوتەی «عەبدولوەدو یووسف ئەلدیمشەقی» هەندێک جار خۆرئاواییەکان دەکەوێتەوە بیریان کە جۆرێک لە دەلاقەی هەواگۆڕکێ بدەن بەم میللەتانە، تاوەکوو ئەوەی نەکەونە ئاستی تەقینەوە. «هانوتۆی» وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا

---

(١) جند الله، ص ٢٩ وەرگیراو لە کتێبی قادة الغرب يقولون. هەمان سەرچاوەی پێشوو...

(٢) شبهات حول الإسلام والرد عليها، محمد قطب، دار الشروق -القاهرة سنة ١٩٩٢ ص ٢٤٩.

دەڵێت: "ئەو دۆڕاو و تێکشکاوانە هەمیشە مایەی مەترسین، بەڵام هێشتا ئەوان دوور نەکەوتوونەتەوە لە ئامانجەکانیان."[١] دوور نییە بەم نزیکانە خۆرئاواییەکان پەردەی ڕاستییەکان لە سەر یەکتری هەڵبدەنەوە، بە جۆرێک لە پاڵ دژایەتیکردنی ئیسلام، جەنگی ڕاگەیاند و خستنەڕووی ڕاستییەکان دژی یەکتری ئەنجام بدەن.

لە مێژووی نوێدا پێ ناچێت هیچ کەس هێندەی خۆرئاواییەکان تاوانی ئەنجام دابێت. سایکۆلۆژیای سیاسەتی ئەورووپی لە سەر ئەو هەستە بونیاد نراوە کە پێویستە هەمیشە دوژمنێک ئامادە بێت، تاوەکوو ئەوەی پێوەی سەرقاڵ بن و لە ناوخۆدا یەکتری نەخۆن. لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم خۆرئاواییەکان ڕێکەوتن لە سەر یەکخستنی هەوڵەکانیان لەپێناو دژایەتیکردنی ئیسلام و موسڵمانان، تا ڕادەیەکی بەرچاو سەرکەوتوو بوون لە تێکشکاندن و لاوازکردنی موسڵمان لە سەر هەر دوو ئاستی سەربازی و شارستانی. قۆناغی دواتر، قۆناغی بەئاگاهاتنەوەیە. موسڵمانان تێ دەگەن لەوەی کە چەندین سەدەیە موسڵمانان بە نارەوا ئاراستە کراون و لە پاڵ هێرشی سەربازیدا، دووچاری ستەمی هزری و کۆمەڵایەتی هاتوون. ئەو کات بە دروستی تێ دەگەین لەوەی گەورەترین ئامانجی خۆرئاوا داماڵینی موسڵمانان بووە لە ئایینەکەیان. ئەوە خۆرئاواییەکان بوون بەو شێوەیەی خۆیان دەیانویست ئیسلامیان بۆ ڕاڤەکردین. ئیسلام بەو شێوەیە خوێنراوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کراوە کە ئیرادەی خۆرئاواییەکان ویستوویانە، ئەوکات ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەین گەڕانەوەیە بۆ لای پەروەردگار و هەوڵی پەروەردەکردنی نەوەکانمان بدەین و لە سەر بەرنامەی ڕاستەقینەی ئیسلام پەروەردەیان بکەین، دوور لە ڕاڤەی نادروست و گومڕایی، هەڵبەت هەڵوێست و تێگەیشتنی خەڵکی بەرانبەر واقیع و بابەتەکانی پەیوەست بە واقیعەوە خۆی لە چوار بەشی سەرەکیدا دەبینێتەوە:

---

(١)قادة الغرب يقولون، ص ٥٩ .

١- بەشێکیان دەزانن لە ڕابردوودا چی ڕووی داوە و ئێستایش چی دەگوزەرێت، تاوەکوو ڕۆژی قیامەت چی دەبێت و چی دەگوزەرێت. ئەم حاڵە تایبەتە بە پەیامبەران و ئەو هاوەڵانەی پەیامبەر کە خودی پەیامبەر(ﷺ)نهێنیی فێرکردوون وەک «حوزەیفەی کوڕی یەممان» (خوای لێ ڕازی بێت).

٢- خەڵکانێکی تر ئاگاداری ئەوەن لە ڕابروودا چی ڕووی داوە و تا ڕادەیەکی باش ئاگاداری ئەوەن ڕووداوەکان لە داهاتوودا بەرەو چ ئاڕاستەیەک هەنگاو دەنێن. ئەمەیش زانایان و لێکۆڵەرەوان و خەڵکانی شارەزای موسڵمان و ڕۆشنبیر هەستی پێ دەکەن. هەڵبەت ئەگەر ئەم جۆرە هەستە لای تەواوی موسڵمانان هەبووایە، ئەوا بە دڵنیایی خۆرئاواییەکان نەیان دەتوانی بەو شێوەیە زەفەر بە جیهانی ئیسلامی و موسڵمانان ببەن.

٣- کەسانێکی تر باش ئاگادارن لەوەی لە مێژوودا چی ڕووی داوە، بەڵام بێئاگان لەوەی ئەو واقیعەی ئێستا بەرەو کوێ دەچێت. حاڵی زۆرینەی خوێندەواران و بانگخوازانی ئێستا بەم شێوەیە. زۆر جار گوتاری ئەم جۆرە لە خەڵکانی موسڵمان و بانگخواز دەکەونە هەڵەی کوشندەوە، بە جۆرێک بێئاگان لەوەی کێ سوودمەند بووە لەم جۆرە گوتارە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ چووتە گیرفانی کێوە. دەکرێت خەڵکانێک لەبەر بێئاگاییی خۆیان پاداشت وەربگرن لە سەر ئەم جۆرە گوتارە، بە مەرجێک نیاز و نیەتێکی خراپ و دونیایی لە پشتەوە نەبووبێت، دەبێت بە وریاییەوە مامەڵە بکەین لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە دەگوزەرێن، ئەو بابەتانەی کە حەق و ڕاستین، دەبێت بە شێوەی حەق و ڕاستی بڵاو بکرێنەوە. وەک خوای گەورە وێنای ئەم دۆخە دەکات و دەفەرموویت ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا١٠٥﴾ [الإسراء - ١٠٥] «ئێمە قورئانمان بە حەق و ڕاستی دابەزاندوە بە حەق و ڕاستیش بە خەڵکمان گەیاندوە».

زیاد لەمە دەبێت بە وردی ئاگادار بین لەوەی مەرج نییە هەر کەس قسەی حەقی کرد، مەبەستی پێی سەرخستنی حەق و ڕاستی بێت، دەکرێت قسەکە حەق بێت، بەڵام مەبەستێکی بۆگەن و پووچی لە پشتەوە بێت. لەوەیش گرنگتر ئەوەیە مەرج نییە هەر کەس بە نیازێکی پاکەوە قسەی کرد، ڕاستەوخۆ لێی وەربگیرێت. وەک ئەوەی ئیمامی «شاتبی» دەفەرمووێت: "دەکرێت ئیستدلال و بەڵگەهێنانەوەکە پووچ بێت." کەواتە دەبێت پەیامەکە حەق بێت و بە مەبەستێکی حەقیش گوترابێت و لە کۆتاییشدا ئەم حەقە لە سەر بەڵگەیەکی بەهێز بونیات نرابێت، بۆیە زۆر جار بانگخوازان لە حاڵەتی سێهەمەوە تێ دەکەون، واتە پەیام و مەبەستەکەیان حەقە، بەڵام بەڵگەهێنانەوەکەیان لاوازە.

٤-خەڵکانێکی تر نەدەزانن لە ڕابردوودا چی کراوە و چی ڕووی داوە، لە دژی موسڵمانان بێ ئاگایشن لەوەی ئێستا و داهاتوو چ پلان و مەترسییەک لە دژی موسڵمانان بە ڕێوە دەچێت. ئەوەی جێگەی داخە زۆرێک لە موسڵمان لەم چینە هەژمار دەکرێن. ئەم چوار جۆرە تایبەتە بە موسڵمانان، لە هزری نەیارانی ئیسلامیش بە هەمان شێوە دەبینرێت. بەشێکی بەرچاو لە نەیارانی ئیسلام پێیان وایە ئیسلام هۆکاری سەرەکیی زۆر لە فیتنە و ئاشووبەکانی سەر زەوییە لە ئێستا و ڕابردوودا. لە لایەکی ترەوە بەشێکی تریان نازانن چی دەگوزەرێت و دوورونزیک هیچ لەبارەی ئیسلامەوە نازانن، لەوانەیە ئەمانە بێوەیترین و سادەترین بن بەرانبەر موسڵمانان.

جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئەو ڕێچکانەی کە میللەتانی کوفر لە دژی ئیسلام و موسڵمانان بە کاریان هێناون. یەکێک لە دیارترین ئەو پلانانە دوژمنکارییانەی کە خۆرئاواییەکان لەپێناوی لێدانی موسڵمانان کاریان لە سەر کردووە، دروستکردنی دووبەرەکی و کێشمەکێشمی ناوخۆیی و دابەشکردنی موسڵمانان بووە. وەک ئەوەی داڕێژەرانی سیاسەتی ئیمپریالیستیی خۆرئاوایی دەڵێن: "ئێمە شەڕ فێری کردووین کە گەورەترین مەترسی لە سەر خۆرئاوا

یەکرِیزیی موسڵمانانە، بۆیە هەمیشە کارمان کردووە بۆ تێکدان و ئاڵۆزکردنی ئەو یەکرِیزییە."[١] بە ڕوانینێک لە دۆخی ئاڵۆزی ئێستای موسڵمانان، سەرکەوتنی پرۆژەی خۆرئاواییەکان و نەیارانی ئیسلام بە چاوی خۆی دەبینیت، بە جۆرێک هەر گرووپ و کۆمەڵەیەکی موسڵمان گرووپەکەی بەرانبەری بە مایەی مەترسی ناو دەبات.

خۆرئاواییەکان و نەیارانی ئیسلام سەرکەوتوو بوون لە سوودوەرگرتن و بەکارهێنانی ئەم ڕێبازانە دژی یەکتری، هەڵبەت هەوڵی خۆرئاواییەکان پەیوەست بەم بابەتە نوێ نییە، بەڵکوو دەمێکە کاری تێدا دەکرێت. ساڵی ١٩٩١ لە گۆڤاری (العالم الإسلامي)ی ئینگلیزی بابەتێک لە نووسینی «مستر چارلس» بڵاو کراوەتەوە. تێیدا ناوبراو دەڵێت: «ئەوەی گومانی تێدا نییە هەوڵی مژدەدەرە مەسیحییەکان پەیوەست بەم بابەتە کارێکی تەواو قورسە. بەو پێیەی کۆمەڵە تەبشیرییەکان یەکریز نین، چونکە یەکرِیزیی ئەوان گونجاوترین هۆکارە لەپێناو چالاککردنی هەنگاوی مژدەدەرەکان.»[٢]

هەر لەم چوارچێوەیەدا گۆڤاری (ارساليات التبشير البروتستانية) لە (بال)ی سویسرا دەردەچێت، زنجیرەیەک نووسینی لەلایەن «شلا تار» لە یەکێک لە ئەڵقەی ئەو زنجیرە نووسینانەدا دەڵێت: «بە ڕاستی بابەتی یەکرِیزیی تەبشیری یەکێکە لە گەورەترین هەنگاو کە دەبێت، کاری لە سەر بکرێت و گرنگیی پێ بدرێت، تاوەکوو پرۆژەی مژدەدەرە مەسیحییەکان سەرکەوتنی گەورە بە دەست بهێنێت، پرۆژە داگیرکارییەکەیان بەرەوپێشچوونی بەرچاو بە خۆیەوە ببینێت»[٣]. نەسرانییەکان بەم شێوەیە کاریان کرد، بۆیە توانییان بەم شێوە

---

(١)هموم الداعية، ص ٧٥.

(٢) الغارة على العالم الاسلامی، ا. ل شاتلية، لخصها ونقلها إلى العربية: مساعد اليافي و محب الدين الخطيب منشورات العصر الحديث بجدة سنة ١٣٧٧ الهجري ص: ١٢١

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

فراوانە هەنگاوەکانیان سەرکەوتنی بەرچاو بە دەست بهێنێت. لەم پێناوەدا چەندین هاوپەیمانێتیی گەورەیان لەگەڵ نەیارانی سەرسەختی ئیسلامیدا بە تایبەتی جوولەکەکان گرێدا، هەروەها لەگەڵ تەواوی ئایین و ئایدیۆلۆژیاکانی تر لە سەرانسەری جیهاندا. لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی لە هەمان گۆڤاری پێشوودا هاتووە (پێویستە لەپێناوی دژایەتیکردنی موسڵمانان خۆمان لە هەموو لایەک بە تایبەتی بتپەرستەکان نزیک بکەینەوە.)[1]

ئەگەر بەراورد بکەین لەنێوان هەوڵەکانی هەر دوو لایەن دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئەگەر بێتوو خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەو شێوەی مەترسیدارە دژایەتیی یەکیان نەکردایە، بە دڵنیایی دووچاری ئەو داگیرکارییە سەربازی و هزری و ئابوورییەی ئێستا نەدەهاتن، بە یەکخستن و کۆکردنەوەی موسڵمانە جیاوازەکان لە ڕووی هزر و بیرکردنەوەوە کە کارێکی ئەستەم نییە، دەکرێت کار لە سەر خاڵە هاوبەشەکان بکرێت لەپێناوی بەرەنگاربوونەوەی نەیارانی هزری. بۆچی پەیامبەر(ﷺ)توانیی ئاشتەوایی لەگەڵ جوولەکەکان بکات لە دژی قورەیش؟ بۆ ناکرێت دوو موسڵمان و دوو نوێژخوێن پێکەوە لە دژی ئیلحاد و عالەمانییەت کار بکەن؟ بۆ ناکرێت لەگەڵ بوونی جیاوازییە هزرییەکانیاندا، پێکەوە دژی دوژمنە هاوبەشەکەیان کار بکەن؟ دەکرێت ئەو پرسیارە جدییە بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە، ئایا پێویستە لەپێناو بەرگریکردن لە دین و ژینی موسڵمانان، لە هەموو بابەتەکاندا هاوڕا بین؟ مەرجە لەپێناو بابەتە لاوەکییەکاندا کێشە گەورەکانی ئوممەت پشتگوێ بخەین؟ دەکرێت گرنگی بە شەرەفی ئافرەتانی باوەڕدار نەدەین، لەپێناوی ئەوەی پیاوەکانیان پێیان وایە کە زیکر بە دەستی چەپ دەکرێت یاخود ناکرێت؟ یان بە تەواوی پشت لە برای موسڵمانمان بکەین لەپێناوی ئەوەی فلانە زانای خۆش دەوێت یان ڕقی لێیەتی، یان هاتوچۆی مزگەوتێک دەکات کە تۆ نوێژی لێ

---

(١)هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٦.

ناکەیت؟ ئەمانە و چەندین وردە بابەتی تر. ئەگەر چی لە چوارچێوەی دەقە ڕاستەقینەکانی شەرعدا جێگایان نەبێتەوە، دەکرێت ئەم جۆرە جیاوازییانە ببنە کۆسپ لە بەردەم بەرگریکردن لە ئیسلام و قورئان و موسڵمانان کە هەموو لایەک کۆدەنگین لە سەر پاراستن و بەرگریکردن لێیان. بە دڵنیاییی بەشێک لەم بابەتانە جیاوازیی فیقهین و هەمووان کۆدەنگن لە سەر ئەوەی کە جیاوازیی فیقهی بابەتێکی سروشتی و ئاساییە و تەنانەت لە هەندێک بابەتی بیروباوەڕیشدا جۆرێک لە جیاوازی بیروباوەڕ بوونی هەیە، لەپێناو هەنگاوێکی لەم شێوەیەدا پێویستە هەموو لایەک بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت. هەوڵ بدەین لانی کەم جیاوازییەکی نێوانمان تەندروست بکەین و لە چوارچێوەی ئەو سنوورە بەرتەسکە دەربچین کە زۆرێک لە ڕێبازە ئیسلامییەکان بە ناڕەوا بۆ خۆیان کێشاوە و کردوویانەتە قوربانیی یاساکانی قورئان.

لە واقیعی ئەمڕۆدا پێویستە جارێکی تر بانگخوازان وردتر لە قورئان بڕوانن، بە تێگەیشتنێکی دەقی دوور لە تەحریفات و تەفسیراتی پووچی دوور لە ڕۆحی قورئان. هەڵبەت هەموو ئەمانە واتای دوورکەوتنەوە لە تیشک خستنەسەر هەڵە و کەموکورتیی ئەوانی تر نییە، بەڵکوو واتای ئەوەیە کە ناکۆکیی ناوخۆیی نەبێتە هۆی پەکخستنی ئاڕاستەی بەرگریکردن لە چەسپاوەکانی ئیسلام. ڕوونتر بڵێین دونیایەک گرفت دەهێنینە پێشەوە، لە سەر ئەحکامە فیهقییەکان و بە تەواوی پشت بکەین لە بەرگریکردن لە ئەحکامە عەقائیدی و بیروباوەڕییەکان. پێویستە هەنگاوی لەپێشینەمان بەرگریکردن بێت لە بنەماکانی ئیسلام دژی هێرشی بێباوەڕان و دوژمنان. بە دڵنیایی دوورکەوتنەوە لە یەکبوون و یەکڕیزیی ئیسلامی واتای ڕازیبوون بە پەرتەوازەی و فرە گوتاری و ڕادەستبوون بە پلانی خۆرئاواییەکان.

دەزگا و دامەزراوە خۆرئاواییەکان ئەو هەلەیان قۆستوەتەوە و سوودیان بینیوە لە ناکۆکی و پەرتەوازەیی موسڵمانان و چەندین دامەزراوەی تایبەتییان

بە گرنگدان بەم بابەتە دامەزراندوە، لەوانە دامەزراوەی «ڕاند». مێژووی ئەم دامەزراوەیە نزیکەی هەشتا ساڵە و کار لە سەر شێواندنی وێنای ئیسلام و تۆمەتبارکردنی موسڵمانان بە تیرۆر و توندڕەوی دەکات. ڕاپۆرتەکانی ئەم دەزگایە لە تەواوی خۆرئاوادا بە گرنگییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت. زیاد لەمە ئەم دامەزراوەیە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ وەزارەتی بەرگری و دەزگای هەواڵگریی ئەمەریکی و نووسینگەی لێکۆڵینەوە فیدڕاڵییەکان لە ئەمریکا هەیە، چالاکییەکانی ئەم دامەزراوەیە لە دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێبتەمبەرەوە بەرەوپێشچوونی زیاتریان بە خۆیەوە بینی. هەوڵە تاکتیکەکانی بە ئاڕاستەی بەگژداکردنی ئیسلامییەکان بە ڕووی یەکتردا گۆڕی. لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی لە ساڵی ٢٠٠٤ بە ناوی (العالم المسلم بعد ١١-٩) لە دووتوێی پێنج سەد لاپەڕەدا بڵاو کردەوە، تێیدا بە شێوەیەکی ورد باس لە جیاوازی و ناکۆکیی نێوان موسڵمانان و نەخشەی ئایدیۆلۆژیی ئیسلامییەکانی جیهان دەکات. هەر لە درێژەی کار و چالاکییەکانیدا ساڵی ٢٠٠٥ ئەم دەزگایە ڕاپۆرتێکی تری بە ناوی (الإسلام المدني الديمقراطي الشركاء و الموارد والاستراتيجيات) تێیدا تیشک دەخاتە سەر چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵە و ڕێکخراو و ڕێباز و قوتابخانە ئیسلامییە جیاوازەکان.

ساڵی ٢٠٠٦ ئەم دەزگایە ڕاپۆرتێکی تری تایبەت بە بزووتنەوە جیهادییەکان و کۆمەڵە ئیسلامییە تیرۆریستەکان (وەک خۆی دەڵێت) ئامادە دەکات، هەر لە درێژەی هەوڵەکانیان ساڵی ٢٠٠٧ ئەم دامەزراوەیە ڕاپۆرتێکی لە ژێر ناوی (بناء شبكات مسلمة ومعتدلة) لە دووتوێی ٢١٧ لاپەڕەدا بڵاو کردەوە کە تێیدا نەخشەڕێگەیەک دەخاتە پێش چاو لەبارەی چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ موسڵمانان و تیشک دەخاتە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:[1]

---

(١) استراتيجيات غربية لإحتواء الإسلام قراءة في تقرير راند ٢٠٠٧ باسم خفاجي ص ١٣.

یەکەم: پێویستیی بەرەنگاربوونەوەی توندئاژۆکان بە تەواوی کەرەستە هزرییە بەردەستەکان، بە تایبەتی سوودوەرگرتن لە ئیسلامییە میانڕەوەکان لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامییە توندڕەوەکان.

دووەم: پێویستی بەرەنگاربوونەوەی خۆرئاوا لەگەڵ تەواوی ئاراستە هزرییەکانی نێو جیهانی موسڵمانان بە گشتی، نەوەک ئەوەی تەنیا تیشک بخرێتە سەر ئیسلامییە توندڕەوەکان و بە تەواوی پشت لەوانی تر بکرێت.

بە ڕوانینێکی کورت تێ دەگەین لەوەی پیلانەکانیان لە نێو جیهانی ئیسلامی بە گشتی پەیڕەو دەکرێت و کاری لە سەر دەکرێت بە تایبەتی تر لە کوردستان. بە تایبەتیتر بانگەشەکانی پەیوەست بەوەی گوایە ئیسلام ئایینی کوردی نییە، بەڵکوو زەردەشتییەت ئایینی ڕەسەنی کوردە. لەپێناو دژایەتیکردنی ئیسلام تەواوی ئایین و ئایینزاکان زیندوو دەکەنەوە و هەوڵی بەهێزکردنیان دەدەن لە چوارچێوەی ماف و ئازادییەکاندا. کاتێک داوای ئەوە بکرێت کە موسڵمانێک لە خۆرئاوا دەسەڵاتی پێ بدرێت، بە بیانووی ئەوەی موسڵمانان لە خۆرئاوا کەمینەن ئەوە مافی وەرگرتنی دەسەڵاتیان نییە. بە پێچەوانەوە، کاتێک داوای ئەوە دەکرێت موسڵمانان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی دەسەڵات بگرنە دەست، ڕاستەوخۆ بیانووی ئەوە دەهێنە پێشەوە کە تەنیا ئێوە ناژین و چەندین ئایین و ئایینزای تر لەم وڵاتەدا هەن، تەنانەت کار گەیشتوەتە ئەوەی هەوڵی لابردنی وانەی ئایین دەدرێت لە خوێندنگاکاندا بە بیانووی ئەوەی دەکرێت خەڵکێکی مەسیحی و ناموسڵمانی تێدا بێت و وانەیەکی لەم شێوەیە خۆشحاڵیان نەکات، بە بێ ئەوەی بە گرنگییەوە لە هەستی ملیۆنان موسڵمانی ئەم وڵاتە بڕوانن.

سێیەم: گرنگیدان بەو ڕێتم و ئاراستانەی کە زیاتر بە شێوەیەکی گشتی کار لە سەر زانستی کەلام و فەلسەفە دەکەن، یاخود ئەوەی لە سەردەمی نوێدا

پێیان دەگوترێت عەقڵانییەکان. دامەزراندنی کەسایەتییەکان لە ناوەندە ئایینی و حکومییەکان بە مەبەستی گۆڕینی ململانێکە لە ململانێی ئیسلام و خۆرئاواوە بۆ ئیسلام و ئیسلام. بڵاوبوونەوەی ئەوەی پێی دەگوترێت قوتابخانەی عەقڵانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا، پرسیاری گەورە بە دوای خۆیدا دەهێنێت. لە ڕاستیدا خۆرئاواییەکان خۆیان ڕاستەوخۆ نایەنە نێو ئەم یارییەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی زیرەکانە درێژە بە گەمەکەیان دەدەن لە ڕێی نوێنەرەکانیانەوە پشتگیریی ئەم جۆرە لە ئاراستە و بیرکردنەوانە دەکەن. بەو پێیەی ئەوان باشتر دەتوانن ئامانجی خۆرئاواییەکان بپێکن، نوێنەرانی خۆرئاوا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گومان لە تەواوی بابەتە شەرعییەکان دروست دەکەن لە نموونەی گومانخستنەسەر نوێژی بە کۆمەڵ و حیجابی ئافرەتان و بەشێکی بەرچاو لە بابەتە فیقهییەکان (بۆ ئەم بابەتە بە نارەوا خۆیان هەڵواسیوە بە کۆمەڵێک لە زانایانی موعتەزیلە و کەلامییە کۆنەکانەوە، لە کاتێکدا موعتەزیلە و کەلامییە کۆنەکان دوور و نزیک پەیوەندییان بەم جۆرە تۆمەتانەی ئەوانەوە نییە.) بەو پێیەی جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان کەسانێک کە سەرقاڵی دیراسە و لێکۆڵینەوەی زانستی کەلامن، سوود لەم زانستە وەردەگرن وەکوو کەرەستەیەک بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام لەگەڵ کەسانێک کە سوود لەم زانستە وەردەگرن، لەپێناو سەرخستنی پلان و پرۆژەی خۆرئاواییەکان.

**چوارەم:** سەرلەنوێ داڕشتنەوەی لێکدانەوەی دەقە ئایینییەکان بە شێوەیەک کە مەفهوومی حەقیقیی ئیسلام بگۆڕێت، تاوەکوو ئەوەی بە شێوەیەک بتوانن ئیسلام لە سەر ڕاستە ڕێگاکەی وەلا بنێن. دەقەکانی قورئان و سوننەت بەرەو هەڵدێر بەرن، ئەگەر ئەم هەوڵانە سەرکەوتوو نەبوون، ئەوا لە ڕێگەی لێدان لە سەرچاوەکانی ڕاڤەی قورئان و فەرموودەوە ئەم هەنگاوە بنێن، گەر هەنگاوێکی لەم شێوەیەش گرفتی بۆ هاتە پێش، ئەوا دەکرێت لە ڕێگەی گوتاری مزگەوتەکان و ناوەندە ئایینییەکانەوە ئەم بابەتە بگۆڕن. بە شێوەیەک

ئیسلام لە چوارچێوە دەقییەکەیدا قورئان و سوننەت لە نێو هزری موسڵماناندا بەهایەکی ئەوتۆی نەمێنێت، تەنیا چوارچێوەی گرنگیدانەکانی کورت بکرێتەوە بۆ پەرستشە کردارییەکانی وەک نوێژ و ڕۆژوو.

لە ڕاستیدا ئەم پلانە مەترسیدار و زیرەکانەیەی خۆرئاواییەکان جێگەی ڕاوەستان و هەڵوێستەکردنە، بە شێوەیەک کاریان لە سەر ئەم پلانانە کردووە وەک ئەوەی ستافێکی گەورە لە بیرمەندانی موسڵمان داڕێژەری ئەم پلانانە بووبن. بەداخەوە بە هۆی سادەیی کاڵفامیی موسڵمانانەوە تەواوی پیلانەکانیان بەو شێوەیەی خۆیان دەیانویست بە دروستی سەری گرت. بەداخەوە ئێستا پێوەرەکان تەواو ئاوەژوو بوونەتەوە، سەردەمانێک دووڕوویی بەوە دەگوترا کە ئاشکرا بێت کە پەیوەندییەکی ناتەندروستت لەگەڵ بێباوەڕاندا هەیە، بەڵام لە ئێستا دووڕوویی ئەوەیە کە پەیوەندییەکی باش لەگەڵ موسڵمانێکدا هەبێت کە لە هەندێک بابەتدا بیروبۆچوونتان جیاواز بێت. سەردەمانێک خۆشەویستی بۆ موسڵمانان و دوورکەوتنەوە لە بێباوەڕان نیشانە و پێوەری باوەڕ بوو، بەڵام ئێستا بە پێچەوانەوەیە. سەردەمانێک پێوەری مەردایەتی لە بەرهەڵستکردنی بێباوەڕاندا بوو، بەڵام ئێستا خەڵکی لە هەموو لایەکەوە بۆ لای ئەوان کۆچ دەکەن. سەردەمانێک موسڵمانان هێندە بەهێز بوون، تەنانەت سنووری جوگرافیای بێباوەڕانیشیان لە زوڵم و ستەم دەپاراست، بەڵام ئێستا موسڵمانان تەنانەت بەرگرییان لە ماڵەکانی خۆیان پێ ناکرێت. سەردەمانێک مامۆستایان و وتارخوێنان بە پەرۆش بوون بۆ حاڵی خەڵک، بەڵام ئێستا بابەتەکە تەواو پێچەوانە بووەتەوە، خەڵک و گشت موسڵمانان بە پەرۆشن بۆ دۆخی زانایان و بانگخوازان. سەردەمانێک مامۆستایان ئامۆژگاریی خەڵکیان دەکرد، بەڵام ئێستا بابەتەکە بە تەواوی ئاوەژوو بووەتەوە. ئەمانە و هەزاران گۆڕانکاری کە لەنێوان دۆخی ئێستا و ڕابردووی موسڵماندا دروست بووە.

٥- پشتگیریکردن و پاڵپشتیکردنی ئەوەی پێی دەگوترێت ئیسلامی میانڕەو و

جیاکردنەوەی لەوەی کە پێی دەگوترێت ئیسلامی توندڕەو، یەکێکی ترە لەو ئامانجانەی کە ئەم دامەزراوەیە کاری لە سەر دەکات، بە مەبەستی ئەوەی ئیسلامێک بێننە بەر دەست کە هاوتەریب لەگەڵ بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی ئەوان کار بکات و هیچ کات نەبێتە ئەستەنگ لە بەردەم بەرژەوەندییەکانی ئەوان. ئەوەی ئەوان بە ناوی ئیسلامی میانڕەو ناوی دەبەن، گوزارشتە لە ئیسلامێکی جیوەیی و لاستیکی بەو شێوەیە خۆیان دەیانەوێت بەرژەوەندییەکانی خۆیانی تێدا جێ دەکەنەوە. ئەم فۆرمە لە ئیسلام کە بە ئیسلامی میانڕەو ناسراوە، لە ئێستای جیهانی ئیسلامیدا گرنگییەکی بەرچاوی پێ دەدرێت و دەیانەوێت بیکەنە جێگرەوەی ئیسلامی ڕاستەقینە، تاوەکوو ئەوەی موسڵمانانی بە تەواوی پێ لە خشتە بەرن. ئەم دامەزراوەیە لە ڕاپۆرتێکدا، ئیسلامی میانڕەوی لە چەند خاڵێکدا کورت کردووەتەوە:

أ- ئیسلامی میانڕەو بە شێوەیەکی ئاسایی مامەڵە لەگەڵ دیموکراتییەتی خۆرئاوایی دەکات و بە تەواوی قەبووڵیەتی وەک پەیڕەوی گونجاوی سیستمی ژیان و بەڕێوەبردن و حوکمداریی موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی. زیاد لەمە بە توندی دژی هەر بیر و بۆچوونێک دەوەستێتەوە کە کار بکات لەسەر هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک لە ژێر سایەی شەریعەتدا. بە ڕوانینێکی خێرای ئێستای جیهانی ئیسلامی دەبینین، ئەم دیدە کاریگەریی بەرچاوی لە سەر موسڵمانان دروست کردووە، بە شێوەیەک خەڵکی موسڵمان دیموکراتییەت و تەواوی پرۆژە خۆرئاواییەکانیان پێ قەبووڵە جگە لە دەوڵەتی شەریعەتی بونیادنراو لە سەر قورئان و سوننەت.

ب- دانانی یاسا و ڕێسا دوور لە سەرچاوەی شەرعی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە یاساییەکانی یاسای فەڕەنسی و بەریتانی وەک ئەوەی ئێستا لە کوردستان و زۆرێک لە وڵاتانی عەرەبی دەگوزەرێت.

ج- زەقکردنەوەی بابەتەکانی پەیوەست بە مافی ئافرەت و ئەوەی لە جیهانی ئەمرۆدا بە مافەکانی ئافرەت و ئازادیی ئافرەت ناسراوە، ئەم بابەتە لە جێگەی خۆیدا بە شێوەیەکی ورد قسەی لەبارەوە دەکەین.[1]

د- ڕێزگرتن لە مافی ئەوانەی کە بە کەمینەکان ناو دەبرێن، بێ جیاوازی لە کەمینە ئایینی، نەتەوەیی و ئیتکییەکان، بە تایبەتی کەمینە ئایینییەکان، داواکردن بۆئەوەی زۆرێک لە پۆستە گرنگ و هەستیارەکانیان پێ بدرێت.

ئێمە ئەم بابەتە پێچەوانە دەکەینەوە، دەپرسین ئایا لە خۆرئاوا کە تێیدا بە شێوەیەکی گشتی موسڵمانان کەمینەن، ڕێگە دەدرێت بەوەی موسڵمانان جومگە هەستیارەکانی دەسەڵات و بەڕێوەبردن وەربگرن؟ لە بنەڕەتدا ئەم بابەتە بۆ خۆی جێی سەرنجە، واتە موسڵمانان لەنێو جێگە و مەیدانی خۆیان مافی ئەوەیان نییە و ناتوانن جومگە هەستیارەکانی دەسەڵات و بەڕێوەبردن بگرنە ئەستۆ، لە بەرانبەردا پێیان دەگوترێت، دەبێت کەمینە ناموسڵمانەکان جومگە هەستیارەکانی بەڕێوەبردن و دەسەڵات لە وڵاتانی زۆرینە موسڵمان بگرنە دەست، وەک ئەوەی لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی بەرپرسان و دەسەڵاتداران وەک ئەبووبەکر و عومەر بن. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا خۆرئاواییەکان ئەم جۆرە داواکارییە ئاراستەی کێ دەکەن؟ لە دەسەڵاتدارانی باوەڕداری دادپەروەر دەکەن، یاخود لە دەسەڵاتدارانی ستەمکاری نوێنەری خۆیان، یان پێش ئەوەی موسڵمانان داوای مافی خۆیان لەوانی تر بکەن ئەمان داوا دەکەن.

هـ- ڕەخساندنی دەرفەت بۆ ناموسڵمانان لە ئایینە جیاوازەکانی تر، تاوەکوو ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی ئازادانە جێگەی پەرستش و عیبادەتی خۆیان دروست بکەن، بە شێوەیەکی ئازادانە بانگەشە بۆ ئایینی خۆیان بکەن.

---

(١)بۆ ڕیزبەندیی ئەم خاڵانە، بڕوانە: لاپەڕە ١١٥ و پەرتووکی ولتستبین سبیل المجرمین» للدكتور محمد يسري إبراهيم. دار اليسر بمصر _ القاهرة سنة ٢٠١١. لەگەڵ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

و- ڕێزگرتن لەوەی کە پێی دەگوترێت مافی مرۆڤ بە هەموو شێوەکانییەوە، بە تایبەتی ئەوەی پێی دەگوترێت ئازادیی گۆڕینی ئایین، وەک ئەوەی لە هەموو وڵاتێکی ئیسلامی مەیدانێکی تایبەت هەیە بۆ سەربڕین و مل پەڕاندنی هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئایین هەڵگەڕاونەتەوە.

ئەمە ئەو جۆرە ئیسلامەیە کە بە شێوەیەکی ڕووکەشانە دەڵێن قەبووڵمانە. لە ڕاستیدا ئەمە تەنیا فۆڕمێکە لە بانگەشەکردن، دەنا ئەو جۆرە ئیسلامەی ئەوان پێی دەڵێن ی«یسلامی میانڕەو» دوور و نزیک قەبووڵیان نییە. لە هەنگاوێکی لەم شێوەیەدا تەنیا مەبەستیان ئەوەیە، وەک هەنگاوی سەرەتا ئیسلامییە ئوسوڵییەکانی پێ لاواز بکەن، زیاد لەمە تەواوی ئەو بابەتانەی ئەوان داوای دەکەن، ئەوان ناتوانن بەو شێوەی دەیانەوێت لە ئێمە نیوهێندە بەرجەستە بکەن. لە ڕاستیدا ئەوان نەک ئیسلامی میانڕەو، بەڵکوو هیچ فۆڕم و شێوەیەک لە ئیسلامیان ناوێت. هەموو جۆر و شێوە و بیرکردنەوەیەک دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئیسلامەوە هەبێت، ئەوان بە شێوەیەکی توند ڕەتی دەکەنەوە و جێی قەبووڵ نییە.

لە فەرهەنگی خۆرئاواییەکاندا، ئیسلامی بەو کەسە دەگوترێت کە بابەتی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت ڕەت بکاتەوە و کار بکات، یاخود ئامانجی بێت لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی، یاخود لانی کەم هەوڵ بدات خەڵکی شەریعەتی ئیسلامیان قەبووڵ بێت وەکوو سەرچاوەی سەرەکی و کۆتایی بۆ دەستبەرکردنی یاسا و حوکمداری. بە کورتی ئەمە پێناسەی ئیسلامییە لە فەرهەنگی خۆرئاواییەکاندا، هەڵبەت ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بیرکردنەوەی تەواوی موسڵمانانە، مەبەست ئەو موسڵمانانەی کە بە ڕاستی وەک بەرنامە ئیسلامیان قەبووڵە، ئیتر بابەتی کارکردن و هەوڵدان بۆ ڕازیکردنی خۆرئاواییەکان جگە لە هەوڵێکی بێئەنجام کارێکی تر نییە.

# گۆڕینی پڕۆگرامەکانی خوێندن

یەکێکی تر لەو کەرەستانەی کە خۆرئاواییەکان لەپێناو لاوازکردنی هەژموونی موسڵمانان و دەستهبەرکردنی ئامانجەکانیان بە کاری دەهێنن، هەوڵدانە بۆ دەستکاریکردن و گۆڕینی تەواوی پرۆگرامەکانی خوێندن بەو ئاڕاستەیەی کە لە خزمەتی پرۆژە و ئەجێندای سیاسی و سەربازی و ئابووری و ئایدیۆلۆژیی ئەواندا بێت. هەڵبەت هیچ پلانێکی خۆرئاوا و ئەمەریکا لەپێناو لێدانی ئیسلام و لاوازکردنی موسڵمانان بە شێوەیەکی سادە نەبووە، بەڵکوو پێشتر بە وردی دیراسە و لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەم بابەتانەوە کراوە، پاشان بە وردی کاری لە سەر کراوە، تاوەکوو ئەوەی توانیویانە جێبەجێی بکەن.

یەکێک لەو کەرەستانەی کە تەواوی خۆرئاواییەکان بە جیاوازیی ئاراستەکانیانەوە لە سەری کۆکن، بابەتی گۆڕینی پرۆگرامی خوێندنی ناوەندەکانی خوێندنی ئاسایی و فێرگە و خوێندنگە ئایینییەکانە. هەڵبەت هەنگاوێکی وەها بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەستی پێ نەکردووە، بەڵکوو لە سەرەتاوە وەک دەستپێک بۆ ئەم هەنگاوە، هەوڵی لاوازکردنی ڕۆشنبیری و شارستانیەتی خۆرهەڵاتی ئیسلامییان داوە، بە مەبەستی خستنەڕووی ئەوەی کە ئیسلام و موسڵمانان لە ڕابردوودا خاوەنی هیچ پێشکەوتنێک نەبوون، ئەوەی هەیانبووە لە خەڵکانی ترەوە وەریان گرتووە، وەک ئەوەی فەیلەسووفی فەڕەنسی «ئارسنت ڕینان» دەڵێت: "ئەوەی پێی دەگوترێت فەلسەفەی عەرەبی، جگە لە دووبارەکردنەوەی فەلسەفەی یۆنانی شتێکی تر نییە."[١] بەناو بیرمەندانی

---

(١) التبشير والاستعمار في البلاد العربية، للدكتور مصطفى خالدي، والدكتو عمر فزدح، الكتب العصرية بيروت، سنة ١٩٥٣ ص ٢١٨.

کاریگەر بە پرۆژەی خۆرئاوا بانگەشەی هەمان بابەت دەکەن، هەموو ئەم بانگەشانە لەپێناو شاردنەوە و بەهەندوەرنەگرتنی شارستانییەتی خۆرهەڵاتی ئیسلامییە و ناچار دەبێت بانگەشەی ئەوە بکرێت، موسڵمانان ئەم بابەتەیان لەوانی ترەوە وەرگرتووە. هەڵبەت ئەم جۆرە گوتارە بێئەمەکییە بەرانبەر خۆرهەڵاتی ئیسلامی و بەرهەمی کۆدەنگیی تەواوی لێکۆڵەروان و بیرمەندانی خۆرئاوا نییە، بەڵکوو هەندێک جار لێکۆڵەرانی ویژدان زیندوو ناتوانن ئەو ڕاستییە بشارنەوە ڕاستەقینەی هەوڵ و توانا زانستییەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی دیدە دەگرن. وەک ئەوەی دکتۆر «جۆرج سارتۆن» سەرۆکی یەکێتیی نێودەوڵەتیی مێژووی زانست، دوای ئەوەی بەتوندی ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێت کە هەوڵ و ماندووبوونی زانایان و لێکۆڵەرانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە هەند وەرناگرن و پێیان وایە جگە لە دووبارەکردنەوەی فەرهەنگ و فەلسەفەی ئەوانی تر شتێکی تر نییە، دەڵێت: "موسڵمانان نەهاتوون لە سەرچاوە یۆنانی و سانسکریتییەکانەوە بابەتەکان وەربگێڕن، گەر نا، بە پێچەوانەوە ئەوەی موسڵمانان پێشکەشیان کردووە سوودێکی نەدەبوو، موسڵمانان سەرکەوتوو بوون لە تێکەڵکردنی سەرچاوەی هیندی و یۆنانییەکان، پاشان تیشک دەخاتە سەر ئەوەی، ئەوەی ئیسلامییەکان کردوویانە`ئەگەر داهێنان نەبێت، ئەوا شتێک نییە ناوی زانست و داهێنان بێت."[1] بێگومان ئەمە ڕاستییەکی تاڵە و پێویستە خۆرئاواییەکان بە دروستی بیزانن و لێی تێ بگەن، بەو پێیەی بەشێکی بەرچاو لە خۆرئاواییەکان بە چاویلکەی ئێستا مێژوو دەنووسنەوە و لە چاویلکەی ڕوانینی ئێستای عەرەبەوە باس لە ڕابردوو دەکەن و باس لەوە دەکەن کە عەرەب جگە لە شەڕ و فیتنە و گرفت سەرمایەکی مرۆییی تریان نییە، بەڵام کاتێک دێنە سەر قسەکردن لە سەر هیندستان و ئەو جیاوازییە ئایینی و مەزهەبی و فەلسەفییەی کە لەو وڵاتە بوونی هەیە باس لەوە دەکەن کە هیندییەکان بەهۆی کەمیی ئاستی زانستییانەوە دووچاری ئەم

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو... لا ٢١٣.

جۆرە لە پەرتەوازەیی و جیاوازییە هاتوون، ئەمە لە کاتێکدایە بەشێکی بەرچاو لە پێشکەوتنەکانی خۆرئاوا لە دوای بزاوتی ئیمپریالیستی خۆرئاواییەوە دەرکەوتووە و سەری هەڵداوە. ئەمە ئەو پرسیارە ڕاستەقینەیە کە وەڵامەکەی بە دروستی لە پێش چاوی هەموو لایەکە، بەوەی کە خۆرئاواییەکان توانییان زۆرترین سوود لە ئەزموونی ئەو وڵاتانە وەربگرن کە داگیریان کردوون. دەکرێت بپرسین خۆرئاواییەکان چۆن سەرکەوتوو بوون لەوەی، سیستمی خوێندن و فێربوونی خۆرهەڵاتی بگۆڕن بۆ پەروەردە و فێربوونێکی خۆرئاوایی و دایانبڕنن لە تەواوی ڕەسەنایەتییە ئایینییەکان. خۆرئاواییەکان بە زیرەکی پلانەکانیان بە ڕێوە دەبەن لە سەروبەندی دژایەتیکردنی هەر بەرنامەیەک، هەنگاوی سەرەتا هەوڵی بێ ئەرزشکردنی دەدەن. لە دیدگای تاکی موسڵمانی خۆرهەڵاتی و نیشاندانی وەک مەترسییەکی گەورە لای تاکی مەسیحیی خۆرئاوایی.

خۆرهەڵاتناسی بەریتانی «هاملتۆن ئەلکساندەر ڕوسکن جب» باس لە گرنگیی گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە سیستمی خوێندنی خۆرئاواییدا دەکات و لەو بارەیەوە دەڵێت: "زاڵبوون و دروستکردنی گۆڕانکاری لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا پەیوەست ە بە سەر زاڵبوون و دروستکردنی گۆڕانکاری لە سیستمی خوێندن و فێربوونی خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا". واتای ئەوەی هەر هەنگاوێک بە ئاڕاستەی کۆنترۆڵکردن و داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی پێویستە بە کۆنترۆڵکردنی سیستمی خوێندن دەست پێ بکات، واتای ئەوەی تاوەکوو سیستمی خوێندن و فێربوونی خۆرهەڵاتی نەیەتە ژێر ڕکێفی سیستمی خۆرئاوایی مەسیحییەوە، تەواوی هەوڵەکان بە ئاڕاستەی کۆنترۆڵکردنی خۆرهەڵاتی ئیسلامی شکست دەهێنن. ئەگەر هاتوو خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بن لە زاڵبوون بە سەر سیستم و پرۆگرامەکانی خوێندندا، ئەوا بە ئاسانی دەتوانن سەرکەوتوو بن بە سەر تەواوی کایەکانی تردا و دەتوانن بە تەواوی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە.

پاشان «جب» لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەو پرۆگرامەی کە لە ناوەندکانی خوێندنی جیهانی ئیسلامیدا هەیە، بەبێ ئاگاداری خۆیان، وای لێ کردوون کە لە ڕواڵەتدا وا بکەونە ڕوو کە دوور و نزیک پەیوەندییان بە ئایینەوە نییە، هەڵبەت تەواوی ئەم گۆڕانکارییانە بە هۆی هەوڵەکانی خۆرئاواوەیە."

لە درێژەی قسەکانیدا قەشە «جب» بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "هەر چەند ئێستا یەکڕیزیی موسڵمانان بە شێوەیەکی فەرمی و یاسایی کۆتایی هاتووە و ڕۆشنبیریی خۆرئاوا توانیویەتی لە ناوەندەکانی خوێندندا ڕەگی خۆی دابکوتێت، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە بەرەوپێشچوونی بەرچاو بەدەست هاتووە. ڕۆشنبیریی ئایینیی تەقلیدی تەواو سنووردار کراوە، دەبێت ئاگادار بین تا ئێستایشی لەگەڵ بێت، پەیمانگا ئایینییەکان هەر ماون. تا ئێستایشی لەگەڵ بێت، ئەوانەی قورئان دەخوێنن و خەڵکی فێری قورئان دەکەن و ناوەندەکانی فێرکردنی قورئان بەڕێوە دەبەن، هەر وەک پێشووتر ماون و کەمیان نەکردووە. تا ئێستایشی لەگەڵ بێت سیحری ئایەتەکانی قورئان هەر بەردەوامە کاریگەریی بەرچاوی هەیە لە سەر موسڵمانان، دوور نییە جارێکی تر بەهۆی گەورە و بەرزڕاگرتنی پەیامبەرەکەیانەوە، موحەممەد (ﷺ) هەستنەوە و ڕاپەڕینێکی گشتگیر بە خۆیانەوە ببینن.

ئەگەری هەستانەوەی موسڵمانان و کۆمەڵە ئیسلامییەکان لە سەرانسەری دونیادا، ئەگەرێکی کراوەیە و بە خێراییەکی چاوەڕوانکراو گەشە دەکەن و لە هەر شوێنێکەوە دژایەتی بکرێن، لە جێگەیەکی ترەوە سەر دەردەهێنن. لە ڕاستیدا بزاوتە ئیسلامییەکانی سەرانسەری دونیا زۆرێک لە کەرەستەکانی سەرکەوتنیان لە بەر دەستدایە، تەنیا سەرکردەیەکی بەهێزیان پێویستە بۆ ئەوەی کۆیان بکاتەوە و تواناکانیان یەک بخات، سەرکردەیەک لە نموونەی

سەلاحەدینی ئەیووبی."[١]

ئەم دەربڕینانەی «جب» بەرانبەر بە جیهان و شارستانیەتی ئیسلامی جێگەی هەڵوێستەکردنە، دەکرێت لە سێ ڕەهەندی جیاوازەوە، خوێندنەوە بۆ گوتەکانی بخەینە ڕوو.

لە سەرەتای بۆچوونەکانییەوە «جب» ڕاڤەیەکی کارەستباری بۆ دۆخی ئێستای جیهانی ئیسلامی دەخاتە ڕوو، ئەم واقیعە تاڵەی ئەمڕۆی موسڵمانان مەترسیی گەورەی لە سەر ئێستا و داهاتووی موسڵمانان دروست کردووە، بووەتە هۆکاری لاوازی و دواکەوتووییان. ئەم زانینە بە تەنیا مەرج نییە، بەڵکوو ئەوەی پێویستە هەوڵدانە بۆ هەستانەوە و پێشکەوتنی موسڵمانان، ئەوەی وەک هەنگاوی گرنگی ئەم دەستپێکە پێویستە، هەوڵدانە بۆ دروستکردنی جۆرێک لە یەکڕیزیی نێوان موسڵمانان و دوورکەوتنەوە لە پلان و بەرنامە خۆرئاواییەکان. بە درێژاییی مێژوو هیچ کات موسڵمانان هێندەی ئێستا زەلیل و ژێردەستە نەبوون، هەڵبەت ئەم تێگەیشتنە لە دۆخی موسڵمانان بەم شێوەیەی ئێستا لای تەواوی موسڵمانان بوونی نییە، بەو پێیەی بەشێک لە موسڵمانان پێیان وایە لەگەڵ بوونی دەرفەتی دینداری و بانگەوازکردن لە مزگەوتەکان، ئیتر دۆخەکە تەواو ئاساییە و موسڵمانان توانیویانە تەواوی مافەکانی خۆیان دەستەبەر بکەن، وەک ئەوەی فۆڕمێک لە ململانێ لە جێگەیەکی هەستیار وتاری دابێت، بێ ئاگا لەوەی کە ئێمە لە بنەڕەتدا لە وڵاتێکی ئیسلامی دەژین و خۆرئاواییەکان بە زەبری هێز هەژموونی سەربازی و ئابووریی خۆیان بە سەردا سەپاندووە، بێ ئاگا لەوەی ئەوەی ئەو دەلاقە تەسکەی پێی دەگوترێت ئازادی، لە بەرانبەر هەزاران لادان و خراپە ڕێگەی پێ دراوە زیاد لەمە سانسۆرێکی زۆر دەخەنە سەر زۆرێک لە بابەتە ئایینییەکان و ڕێگە بە باسکردنیان نادەن.

---

(١) بڕوانە: الغزو الفكرى والتيارات المعاديه للإسلام، علي عبد الحليم محمود، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية سنة١٩٨١. ص ٤٨١.

زیاد لەمە دەزگا باڵاکانی دەوڵەت ناونیشان و ناوەڕۆکی وتار بۆ وتاربێژان و مامۆستایان دەستنیشان دەکەن، لە ڕاستیدا ڕێگەدان بە بەرپاکردنی دروشمە ئایینییەکان کە سەدان ساڵە بەردەوامە لە بنەڕەتەوە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. ئەم جۆرە لە گوتارە بۆ خەڵکانی بانگخوازە، دەکرێت خەڵکانی ئاسایی وەک ئەوەی هەیە لە بابەتەکان تێ نەگەن. لە کۆنەوە گوتراوە هەر کەس لە عیزەت و شکۆمەندیدا نەژیابێت، مەحاڵە لە هەستی زلیلی و ژێردەستی تێ بگات.

بەشی دووەمی بۆچوونەکانی «جب» سەبارەت بە شێوازی داگیرکردنی موسڵمانان، ڕووی ڕاستی سیاسەتی خۆرئاواییەکان بەرانبەر موسڵمانان دەخاتە ڕوو کە بە گرنگییەوە باس لە مەترسیی ڕاستەقینەی موسڵمانەکان دەکات لە ساتی بەئاگاهاتنەوە و یەکگرتوویی نێوانیان. ئەوان بە جۆرێک لە فۆبیاوە دەڕواننە ئەگەری هەستانەوەی داهاتووی موسڵمانان و دیانەوێت ببنە بەربەست لە بەردەم هەر هەوڵێکی هەستانەوە و بەئاگاهاتنەوەی موسڵمانان. بەو پێیەی هەر هەنگاوێکی پێشکەوتن و بەئاگاهاتنەوەی موسڵمانان، واتە هەستانەوەی یەکجاریی خۆرهەڵاتی ئیسلامی و لاوازبوونی هەژموونی سیاسی و سەربازی و ئابووریی خۆرئاوا بە سەر جیهانی ئیسلامییەوە. خۆرئاواییەکان لە ئاڕاستەکردنی سیاسەتەکانیان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی بنەمای پەرتکە و زاڵ ببە بە کار دەهێنن.

بەشی کۆتاییی قسەکانی «جب» ڕاستییەکی تاڵ وەبیری خۆرئاواییەکان دەهێنێتەوە، هاوکات هەواڵێکی دڵخۆشکەر دەخاتە بەر گوێی موسڵمانان کە موسڵمانان هیچ کات دەستبەرداری ئایینەکەیان نابن. درەنگ یاخود زوو جارێکی تر هەڵدەستنەوە هێز و شکۆمەندی بۆ خۆیان دەگێڕنەوە وەک پەیامبەری خۆشەویست( ﷺ) دەفەرمووێت: (لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله لا يضرهم من خذلهم أو خالفهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون على الناس)[1]

---

(١)مسلم ١٠٣٧

واتە: بەردەوام کۆمەڵێک لە ئومەتەکەی من لە سەر حەقن فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکەن، ئەوانەی پشتیان تێ دەکەن و پێچەوانەیان کار دەکەن، ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن، بەو شێوەیە بەردەوام دەبن، تاوەکوو فەرمانی خوای گەورە دێتە جێ، ئەوانیش سەرکەوتوون بە سەر خەڵکیدا. ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە هەمیشە خۆرئاواییەکان لێی ترساون، هیچ کات لاوازی و پەرتەوازەیی موسڵمانان نەبووەتە هۆکاری ڕەواندنەوەی ئەم ترسەیان، هیچ کات دڵئارام و دڵنیا نابن، تاوەکوو ئەو کاتەی موسڵمانان دانەبڕنن لە ئایینەکەیان و وەک خۆیانی لێ نەکەن: ﴿وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً﴾ [النساء: ٨٩] «ئاواتەخوازن لە ئایینی پەروەردگار هەڵتان بگێڕنەوە و بتانخەنە سەر ئایینی خۆیان» چونکە ئەوان زۆر باش دەزانن گەر بێتوو موسڵمانان بە پشتبەستن بە بنەماکانی ئەو ئایینە ڕاستەوە، جارێکی تر بێنەوە مەیدان بە دڵنیایی تەواوی یارییەکە لە بەرژەوەندیی خۆیان دەگۆڕن، بۆیە بە گشتی ئەوان ئیسلام وەک ئایین و بیروباوەڕ بە خاڵی سەنتەریی پێشکەوتن و بووژاندنەوەی موسڵمانان دەبینن، هەر خودی ئیسلام کەرەستەی کۆکەرەوە و پنتی یەکڕیزی و یەک دەستیی نێوان موسڵمانانە هەر بۆیە بەوپەڕی تواناوە کار دەکەن لە سەر ئەوەی، بتوانن لانی کەم سەرکەوتوو بن لە دوورخستنەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەیان، وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ﴾ [البقرة: ١٠٩]، واتە «ئاواتەخوازن زۆرێک لە ئەهلی کیتاب کە بتانگێڕنەوە، کافر ببنەوە دوای ئەوەی ئیمانتان هێناوە. لە ئیرەیی دەروونی خۆیان ئەم ئاواتەیان هەیە، دوای ئەوەی کە حەقیان بۆ ڕوون کراوەتەوە و بە تەواوی حەقیان ناسیوە.» هەر بۆیە خۆرئاواییەکان بە تامەزۆریی و ماندوونەبوونەوە کار دەکەن لە سەر گۆڕینی پەیڕەو و پرۆگرامی خوێندن.

لە تەواوی دونیادا هەر کەس و لایەنێک بیەوێت پرۆگرامێکی خوێندن

بنووسێتەوە، ئەوا بە دڵنیاییی بە سوودوەرگرتن لە بنەماکانی بیروباوەڕی خۆی دەینووسێتەوە، مەسیحییە ئایدیۆلۆژییەکان دەیانەوێت بەو شێوەیە پرۆگرامی خوێندن بنووسرێتەوە، تاوەکوو ئەوەی نەوەیەکی بەهێز و باوەڕ بوو بە بنەماکانی مەسیحییەت و هەژمووونی خاچپەرستی پەروەردە ببێت. بە هەمان شێوە زایۆنییەکانیش دەیانەوێت نەوەیەک پەروەردە بکەن کە تا ئەوپەڕی سنوور پابەندی بنەما زایۆنییەکان بێت. تەواوی هەوڵەکانی خۆی لەپێناوی سەرخستنی پرۆژەی زایۆنی بخاتە گەڕ. بە هەمان شێوەیش مولحیدان و بێباوەڕان هەوڵ دەدەن نەوەیەک پەروەردە بکەن، جگە لە ماددە هیچ شتێکی تر نەناسێت و باوەڕی بە هیچ شتێکی تر نەبێت، ئەوەی پێی دەگوترێت خودا و ئایین دوور و نزیک پەیوەندیی لەگەڵ نەبێت.

لە دۆخێکی ئاوادا پێویستە موسڵمانان لانی کەمیش بێت لەپێناو ڕاگرتنی باڵانسی هزری و ئایدیۆلۆژی لەگەڵ ئەوانی تر، پرۆگرامێکی خوێندنی پتەو بونیادنراو لە سەر بنەما ئیسلامییەکان دابڕێژن. بێگومان داڕێژەرانی پرۆگرامی خوێندنی جیهانی ئیسلامی دوور لە بنەما ئیسلامییەکان لە سێ حاڵ تێپەڕ نابن، یان ئەوەتا دوور و نزیک باوەڕیان پێی نییە، یان گومانیان لێی هەیە یان بە شێوەیەک لە شێوەکان جێبەجێکاری پلانی خۆرئاواییە، هەندێک جار هەر سێ حاڵەتەکە پێکەوە کۆ دەبنەوە. ئەو پرۆگرامی خوێندنەی کە ئێستا لە زۆرێک لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی پیادە دەکرێت: پرۆگرامی سەپێنراوی دەستی ئیمپریالیستە.

دەکرێت ئەو پرسیارە خۆی بخاتە ڕوو، ئەگەر ڕاستە ئەو پرۆگرامەی خوێندنەی ئێستای جیهانی ئیسلامی بەرهەمی دەستی ئیمپریالیستەکانە بۆچی باسی مەسیحییەت و یەهوودیەت ناکات و دوور و نزیک هیچ کەس بە هۆیەوە نەبووەتە مەسیحی و جوولەکە؟

تیۆریستەکانی هزری خۆرئاوایی بە وردی وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە. لەم چوارچێوەیەدا «سەمۆئیل زوەیمەر» لە کۆنگرەی تەبشیریی قاهیرە کە ساڵی ١٩٠٦ بە ڕێوە چوو، بەشێک لە مژدەدەران لەو کۆنگرەیەدا گلەییی ئەوەیان کرد کە هەوڵەکانیان سەبارەت بە بەمەسیحیکردنی موسڵمانان لە خۆرهەڵات بەرئەنجامێکی ئەوتۆی نەبووە. «زەویمەر» وەڵامی نارەزاییی ئەم مژدەدەرانە دەداتەوە و باس لەوە دەکات ئامانج لە پرۆژەی مژدەدان و گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن و دامەزراندنی قوتابخانە تەبشیرییەکان تەنیا ئەوە نییە کە خەڵکی بکەن بە مەسیحی، بەڵکوو کاری گرنگ و لە پێشینەی مژدەدەرە مەسیحییەکان ئەوەیە موسڵمانان لە ئایینەکەیان هەڵبگێڕنەوە و لانی کەم ساردیان بکەنەوە لە ئیمانەکەی خۆیان. پاشان تیشک دەخاتە سەر ئەوەی لە دۆخێکدا موسڵمانان بە هیچ شێوەیەک قوتابخانە مەسیحییەکانیان پێ قەبووڵ نییە، پێویستە هەوڵ بدەین لە بەرانبەردا قوتابخانەی عالەمانییان بۆ دابمەزرێنن، تاوەکوو ئەوەی بتوانین بە بێ کێشە ئامانجەکانمان دەستەبەر بکەین.

ئەمە پیلانی پرۆژە تەبشیرییەکانە لە جیهانی ئیسلامیدا بەوەی هەوڵ دەدەن موسڵمانان دابڕنن لە ئایینەکەیان و بیانخزێننە نێو پرۆژەی بەعالەمانیکردن. بەم شێوەیە خاچپەرستیی نوێ پرۆژەکانی لە نێو جیهانی ئیسلامیدا بەرجەستە دەکات. لە کۆتاییدا سەرکەوتوو بوون لە لەناوبردنی پرۆگرامی فێرکردن لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی و هێنانەکایەی پرۆگرامێکی خۆرئاوایی لە جێگەی وەک ئەوەی لە جەزائیر ڕووی دا. خۆرئاواییەکان لە جەزائیر نەک توانییان پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، بەڵکوو سەرکەوتوو بوون لە گۆڕینی زمانی بەشێکی بەرچاو لە جەزائیرییەکان بۆ زمانی فەرەنسی، بە زۆر زمانی فەرەنسییان سەپاند بە سەر هاوڵاتییانی جەزائیردا. لە وڵاتی مەغریب دوای ڕێککەوتنی ٣٠ ئازاری ساڵی ١٩١٢ دەسەڵات درا بە فەرەنسییەکان کە زمان و کەلتووری خۆیان بخزێننە نێو

تەواوی دامەزراوەکانی مەغریبەوە، ئەم بڕیارە بووە هۆکاری دوورخستنەوەی ڕەسانەیەتیی ئیسلامی لە ناوەندەکانی خوێندن و هێنانەکایەی سیستمێکی عالەمانی دوور لە هەموو سروشت و بەهایەکی ئیسلامی، دواتریش هەوڵەکان بەم ئاڕاستەیە لە نیمچەدوورگەی هیندی و پاکستان بەردەوام بوو.

ساڵی ١٧٨١ یەکێک لە مژدەدەرانی مەسیحی بە ناوی «ورن هیستنکر» قوتابخانەی «کلکتا»ی بنیاتنا لەپێناو پەروەردەکردنی نەوەیەکی موسڵمان و ئامادەکردنیان بە کەلتوور و ڕۆشنبیریی خۆرئاوایی، تاوەکوو ئەوەی جومگە سەرەکییەکانی دەسەڵات و دادگا بگرنە دەست. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم فێرگەیە لە سەرەتاوە لە پاڵ پرۆگرامە خۆرئاواییەکاندا، چەندین پرۆگرامی ئیسلامیی تێدا دەخوێنرا هەر بە هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە فێرخوازانی موسڵمانی ئەو ناوچەیە ڕوویان تێ کرد. دواتر تەواوی پرۆگرامە ئیسلامییەکانی تێدا سڕایەوە و لە جێگەی ئەوانە چەندین پرۆگرامی عالەمانی بوونە شوێنگرەوەیان و تەواوی پرۆگرامەکان تێیدا بە زمانی ئینگلیزی دەخوێنران، دواتر لە پرۆسەیەکدا، ئیمپریالیستی ئینگلیزی، هەستا بە داخستنی تەواوی قوتابخانە حوکمییەکان. زمانی عەرەبی کە کەرستەی تێگەیشتنی موسڵمانانە لە ئایینەکەیان، لە ناوەندەکانی خوێندن قەدەغە کرا و زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی بوونە جێگرەوەیان.

بیرۆکەی گۆڕینی سیستمی خوێندن و گۆڕینی زمانی خوێندن بۆ زمانی ئینگلیزی، لەلایەن «لۆرد ماکولی»یەوە بەرنامەی بۆ داڕێژرا و جێبەجێ کرا. «ماکولی» ساڵی ١٨٣٢ لە سەروبەندی باسکردنی ئەم بابەتە دەڵێت: "مەبەست لەم پڕۆژەیە بەرهەمهێنانی خەڵکانێکی هیندیی ڕەنگ و بیر و هزر ئینگلیزییە."[١] لەم ڕێگەیەوە ئیمپریالیستی ئەورووپی توانیی خۆی بخزێنێتە نێو

---

(١) بڕوانە: غزو في الصميم، عبد الرحمن حسن حنبكة الميداني دار القلم دمشق بيروت، سنة ١٩٨٢، ص ٣٢.

قولاییی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییەوە و توانییان تەواوی دامەزراوە فێرکاری و پەروەردەییەکانی جیهانی ئیسلامی کۆنترۆڵ بکەن. خۆرئاواییەکان بەباشی لەوە تێگەیشتوون کە گەورەترین کەرەستە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ئیمپریالیستی، دەستگرتنە بەسەر ناوەندەکانی خوێندندا، وەک ئەوەی مژدەدەر «بزوز» دەڵێت: "ڕاستییەکان ئەوەمان پێ دەڵێن کە بابەتەکانی فێرکردن و پەیوەست بە پەروەردە و فێرکردنەوە، باشترین کەرەستەن تاوەکوو لە ڕێیانەوە هەژموونی خۆمان بە سەر جیهانی ئیسلامیدا بسەپێنین. ئەمریکییەکان لەم ڕێگەیەوە سەرکەوتوو بوون لە چەسپاندنی حوکمی خۆیان بە سەر ناوچەکانی سووریا و لوبناندا."[(١)]

لە چوارچێوەی ئەم باسەدا تیشک دەخەینە سەر دوو وڵات کە دووچاری زۆرترین کاریگەریی خۆرئاوای هاتوون: میسر وەک ناوەندێکی گرنگی جیهانی ئیسلام ڕووبەڕووی زۆرترین هێرش و هەوڵی سەپاندنی هەژموونی خۆرئاوا بووەتەوە، بە تایبەتی سەردەمی ئیمپریالیستی فەڕەنسی و دواتر ئینگلیزی. ئیمپریالیستە ئینگلیزەکان لە سەردەمی خۆیاندا بە تایبەتی لە سەردەمی حاکمی ئینگلیز لە میسر «لۆرد کرۆمەر» ناوبراو یەکێک لە قەشە نزیکەکانی خۆی بە ناوی «دانلوب» دەرچووی کۆلێژی لاهوت کردە ڕاوێژکاری حوکوومەت، «دانلوب» سەرکەوتوو بوو لەوەی بە شێوەیەکی زیرەکانە، پرۆگرامەکانی خوێندن بگۆڕێت، لە ڕێی چەندین کەرەستە و شێوازی جیاوازەوە، لەوانە:[(٢)]

١- سەپاندنی زمانی ئینگلیزی وەک زمانێکی زیندوو و فەرمیی وڵات و وەلانانی زمانی عەرەبی و نیشاندانی وەک زمانێکی لاوەکی.

٢- گۆڕینی وانەی پەروەردەی ئیسلامی بۆ وانەیەکی لاوەکی.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٥

(٢) بڕوانە: احذروا الأساليب الحديثة ص ١٥٤.

٣-هەوڵدان بۆ لاوازکردنی زمانی عەرەبی لە ڕێی قەدەغەکردنی سەرچاوەکانی فێربوونی زمان و نەحوی عەرەبی.

٤- زیادکردنی خوێندنی مێژووی نوێی خۆرئاوا بە شێوەیەکی چڕوپڕ لە ناوەندکانی خوێندن و ناساندن و لێکۆڵینەوەی کەسایەتییە دیارەکانی خۆرئاوا لە نموونەی ناپلیۆن و ویلسۆن و فریزر و نوبار... هتد، سەرەڕایی خوێندن و لێکۆڵینەوە لە مێژووی نوێی ئەورووپا بە شێوەیەکی چڕوپڕ و وەلانانی یەکجاریی مێژووی ئیسلامی. زیاد لەمە پسپۆڕیی مێژووی ئیسلامی گۆڕرا بۆ پسپۆڕیی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و وەلانانی تەواوی مێژوو و کەسایەتییە ئیسلامییەکان. مێژووی ئیسلامی بە تەواوی پشتگوێ خرا تەنیا ئەو بابەتانە نەبێت کە لەپێناو زیندووکردنەوەی خیلاف و دووبەرەکیدا دەیخەنە ڕوو، وەک زەقکردنەوە و خستنەڕووی ناکۆکییەکانی نێوان «عەلی» و «موعاویە» (خوایان لێ ڕازی بێت) زەقکردنەوەی هەڵە و کەموکورتییەکانی دەوڵەتانی ئیسلامی، بە تایبەتی دەوڵەتی عوسمانی. پلانێکی لەم شێوەیە لە بنەڕەتدا پلانێکی زایۆنییە، وەک لە پرۆتۆکۆلاتی عەقڵمەندانی زایۆنیدا تیشک دەخاتە سەر لێکۆڵینەوەی مێژوو و زەقکردنەوەی ڕووداوە مێژووییە ئاڵۆزە نەخوازراوەکان و وەلانانی خاڵە گەشاوەکانی ناو مێژوو.

٥- نیشاندانی چەندین بابەتی زانستیی پراکتیکی، وەک ئەوەی پێچەوانەی شەرع و ئیسلام بن لە نموونەی دۆزینەوەی پزیشکی و زانستە پراکتییەکانی وەک، فیزیا و کیمیا و خستنەڕووی چەندین بەناو تیۆریای زانستی وەک تیۆریای پەرەسەندنی «چارلس داروین» و تیۆریاکانی «دۆرکایم»، «ئۆگست کۆنت» و «لیفی بریل» چەندان تیۆریای سەیروسەمەرەی تر کە لە بنەڕەتدا بە تیۆریای مولحیدانە بونیاد نراوە لە سەر ڕەتکردنەوەی خودا و پیرۆزیی ئایینەکان، زۆرێک لەم بیردۆز و تیۆریایانە خزێنرانە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنەوە و دواتریش درێژ بوونەوە بۆ نێو کایەکانی ژیان و ژیاری خەڵکی لە

نموونەی تیۆریای پەیڕەوی سەرمایەداری و یاسا خۆرئاواییەکان و وەلانانی تەواوی تیۆرییە ئابووری و زانستی و یاسایی و کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان، بابەتگەلێک کە زانایانی ئیسلام بە سەدان سەرچاوەی گرنگیان لەم بارانەوە خستووەتە ڕوو، بەڵام تەواوی ئەم بابەتانە لە مەیدانی گشتیی موسڵمانان دوور خراونەتەوە، تاوەکوو ئەوەی گەنجان و لاوانی موسڵمان و نەوەی نوێ تەواو بێئاگان بن لە ڕابردووی زانستی و مەعریفیی خۆیان. تەنیا ئەو سەرچاوانە دەخرێنە ڕوو کە بە شێوەیەک لە شێوەکان باس لە بابەتە لاوەکییەکانی پەیوەست بە ژیانەوە دەکەن، لەمەیش مەترسیدارتر هەوڵەکان چڕ کراونەتەوە لەپێناو قەدەغەکردنی کۆمەڵێک سەرچاوە و پەرتووکی ئیسلامی بە تۆمەتی ئەوەی، گوایە لەگەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجن و دەبنە مایەی بڵاوکردنەوەی ئەوەی بە هزری توندڕەوی ناو دەبرێت.

بێدەنگیی دڵسۆزان و بانگخوازان بەرانبەر بە هەنگاوەکانی ئەوانی تر، جۆرێک لە سەرکەشی و جورئەتی لای نەیاران خوڵقاندوە، بۆیە هەر نەوەیەک لە زانایان بەرپرسیارن بەرانبەر دۆخی قۆناغی خۆیان و دوای خۆیان، بۆ نموونە گەر زانایان و دڵسۆزانی پێشتر بەجددی قسەیان بکردایە لە سەر گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن، بەدڵنیاییی بەم شێوەیەی ئێستا نەدەتوانرا قسە بکرێت لەبارەی لابردن و وەلانانی یەکجارەکیی پەرتووک و سەرچاوەی زانستە ئیسلامییە ڕەسەنەکان. گەر نەوەی پێشوو لە زانایان و بانگخوازان و دڵسۆزان بێدەنگ نەبوونایە لە هەمبەر جێبەجێنەکردنی شەریعەت، بەدڵنیاییی ئێستا باسوخواسی لابردنی وشەی موسڵمان لە سەر پێناس و دۆسییە فەرمییەکان نەدەکرا. گەر لە قۆناغی پێشوودا زانایان و دڵسۆزان هەڵوێستی جیددییان هەبووایە لە هەمبەر بابەتێکی هەستیاری وەک ناپۆشتەی ئافرەتان، ئەوا بە دڵنیاییی نەیاران بەو شێوەیەی ئێستا دەرفەتیان نەدەبوو لەبارەی حیجابەوە بدوێن. گەر جیلی ڕابردووی موسڵمان بە خەمخۆرییەوە بەرانبەر دۆسیە هەستیارەکانی

ڕابردوویان بێدەنگ نەبوونایە و بە وریاییەوە بەرگرییان لە هزر و بنەماکانی خۆیان بکردایە، بە دڵنیایی دۆخەکە هیچ کات وەکوو ئێستا نەدەبوو. بە هۆی پشتکردن لە واقیع و گوێنەدان بە ئاریشەکان و پشتکردن لە جیلی تازە و خەمنەخواردن یاخود خەمساردی بەرانبەر بابەتە هەستیارەکانی پەیوەست دین و ژینی موسڵمان دۆخێکی مەترسیداری وەک ئێستای هێناوەتە کایەوە و نەوەیەکی بێئاگایی لاستیکیی پەروەردەبێت، نەوەیەک بێئاگا لە ئایین و بیروباوەڕی. زیاد لەمە نەوەیەک دژایەتیی بیروباوەڕی ئایینی و ڕەسەنایەتیی خۆی دەکات وەک ئەوەی «زوەیمەر»ەوە کۆبوونەوەیەکدا لە شاخی (الزیتوون) لە قودس لە ساڵی (١٩٣٥) گوتی: "لە ڕاستیدا ئێمە دوای هەوڵێکی زۆر، لە ماوەی سێیەکی سەدەی نۆزدە، تاوەکوو ئەمڕۆ توانیومانە دەست بگرین بە سەر تەواوی بەرنامە فێرکارییەکانی وڵاتانی ئیسلامی، سەرکەوتوو بووین لەوەی خەڵکانێک پەروەردە بکەین لەناو وڵاتانی ئیسلامی. خەڵکانێکی ماددەپەرست کە دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکیان بە ئیسلامەوە نییە و ناشیانەوێت هیچ لەبارەی ئیسلامەوە بزانن. هەوڵەکانمان بە ئاڕاستەی دارنینی موسڵمانان لە ئایینەکەیان سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێناوە."[1] ڕوونتر، توانییان موسڵمانان لە ئایینەکەیان دوور بخەنەوە و نەیشهێنە نێو ئایینی مەسیحییەوە، بەڵکوو وەک سەرگەردانێک لە نێو جەنجاڵیی هزری ئەم دونیایەدا بیان هێڵینەوە. هەر بۆیە ئیمپریالیستەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ڕێی داڕشتنەوەی جارێکی تر پرۆگرامەکانی خوێندنەوە سەرکەوتوو بن لەوەی نەوەیەکی موسڵمانی تەمبەڵ بەرهەم بهێنن. نەوەیەک کە تەنیا وێڵی پشوودان و ئارەزووەکانی بێت، نەوەیەک تەواوی جووڵە و چالاکییەکانی لەپێناوی ویست و ئارەزووەکانی دایە، تەنانەت خوێندن و هەوڵدانی بۆ پارە و دارایی و تەواوی جووڵە و هەڵسوکەوتەکانی

---

(١) اساليب الغزور الفكرى للعالم الإسلامي، علي محمد جريشة و محمد شريف الزيبق، دار الوفاء سنة ١٩٧٩ ص ٦٤.

لەپێناوی بەرجەستەکردنی ئارەزووەکانیدایە، بە جۆرێک ویست و ئارەزووەکان لای ئەوان تێکەڵی هەموو بابەتێک بووە.

موسڵمانانی خەمخۆر و ڕاستەقینە لەنێوان دووڕیانێکی پڕ لە ئاریشەدان، لە لایەک هەوڵدان بۆ بەربەچدانەوەی هەوڵە دوژمنکارییە خۆرئاواییەکان، لە لایەکی تر ئازاری خەمساردی و خوێنساردیی موسڵمانان بەرانبەر کاروباری ئایینەکەیان و ئەو مەترسییانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بە تایبەتی خەمساردی و بێئاگایی زانایان و بانگخوازانی ئیسلام سەبارەت بە دۆخی موسڵمانان. هەڵبەت ڕەخنەی ئێمە لەبارەی بانگخوازانەوە ڕەخنەیەکی گشتگیر نییە و مەبەستمان پێ هەمووان نییە، بەڵام هەر جۆرە خەمساردی و پشتگوێ خستنێک، دۆخێکی خراپ بەدوای خۆیدا دەهێنێت. لە ڕاستیدا هەڵەین ئەگەر پێمان وا بێت تەواوی بەرپرسیارییەتیی ئەو دۆخەی تێی کەوتووین دەکەوێتە ئەستۆی خۆرئاواییەکان و پیلانە دوژمنکارییەکانیان لە دژی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، بەڵکوو لە پاڵ هەوڵە دوژمنکارییەکانی ئەوان، بەشێکی بەرچاوی بەرپرسیارێتیی دۆخی ئاڵۆزی ئێستای موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی لە ئەستۆی خودی موسڵمانان و بە تایبەتیتر خەڵکانی دەستەبژێری نێو دونیای موسڵمانانە لە زانایان و پێشەوایان و بانگخوازان. ئیتر کاتی ئەوە هاتووە موسڵمان وریاتر مامەڵە بکەن و تۆکمەتر پلانەکانیان دابڕێژن، تاوەکوو لەوە زیاتر نەبنە مایەی گاڵتەوگەمەی دەستی ئابووری و سیاسەتی خۆرئاواییەکان. ئیتر کاتی ئەوە هاتوە موسڵمانان هەوڵ بدەن شکۆی لەکەدارکراویان بگێڕنەوە، شکۆیەک کە چەندین دەیەیە لەبن پێی خۆرئاواییەکاندا بێڕێزیی پێ دەکرێت و لە سەر خوێن و جەستە و شکۆی موسڵمانان سەما دەکەن، لە چوارچێوەی هەوڵی نەیاران بە مەبەستی لێدان لە بنەمای فێرکاری و هزریی موسڵمانان، قەوارەی ئیسرائیلی پشکی شێری بەر دەکەوێت و هەر لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی زایۆنی و ناوەندە ئەکادیمییە زایۆنییەکان هەوڵەکانیان بەم ئاڕاستەیە

چڕ کردەوە. هەڵبەت لە ڕووی سیاسییەوە ئیسرائیل درێژەپێدەری ئەجێندای سیاسی و دوژمنکارانەی ئەورووپا و ئەمەریکایە لە بەرانبەر موسڵمانان.

لەو چوارچێوەیەدا ساڵی ١٩٦٧ وەزیری بەرگریی ئیسرائیل داوای کرد کۆنگرەیەکی گرنگی زانستی لەبارەی پرۆگرامی خوێندنی عەرەبی لە قودس و هەندێک ناوچەی تر ببەسترێت. وەک بەدەمەوەچوونی ئەم داوایەی وەزیری بەرگری لە ١٩٦٧/١٠/١٤ کۆنگرەیەک بە ڕێوەچوو. دواتریش لە ١٩٦٧/١٠/٢٦ کۆنگرەی دووەم بە ڕێوەچوو، تێیدا بڕیار درا تەواوی ئەو بابەتانەی کە لە چوارچێوەی پرۆگرامەکانی خوێندندا دەبنە مایەی زیان و مەترسی بۆ سەر ئیسرائیل، یاخود بە شێوەیەک لە شێوەکان هەوڵی شێواندنی ناوبانگی ئیسرائیل دەدەن، دەبێت لە پرۆگرامەکانی خوێندندا لا ببرێن. زیاد لەمە لابردنی هەر بابەتێک لە بابەتەکان کە دوور و نزیک ببێتە مایەی مەترسی بۆ سەر ئیسرائیل. بۆ نموونە لە تیشکخستنەسەر بابەتی جیهاددا دەڵێن: "جیهاد واتە شەڕ و جەنگ دژی موشریکەکان. ئەوە خەواریجەکانن گەورەی دەکەن تا دەیخەنە ڕیزی بنەماکانی ئیسلامەوە و دەیکەن بە شەش ڕوکن، بەڵام ئەهلی سوننە جگە لەو پێنج بنەمایە دان بە هیچ بنەمایەکی تردا نانێنن."[1] یان کاتێک باسی پیرۆزیی مزگەوتی ئەقسا دەکرێت تهنها ئهوهنده ئاماژهی پێ دهکرێت کە "عەبدولمەلیک دەستی کرد بە دروستکردنی مزگەوتی ئەقسا و قوبەی سەوز لە ساڵی ٦٩١، لەو کاتەدا شەڕی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوری زوبەیردا بوو، بۆ ئەوەی خەڵکی ڕوو لە مەککە نەکەن کە ئەوی لێیە، بەڵکوو بێنە قودس چونکە خۆی دەسەڵاتدار بوو بە سەر

---

(١)بڕوانە: تاريخ العرب والمدينة الإسلامية، الياس دانيال القسم الأول، ل ٦٤ لە پەرتووکی التعليم ومستقبل المجتمعات الإسلامية في التخطيط الإسرائيلي ماجد عرسان الكيلاني، دار السعودية للنشر والتوزيع، ص ٢٥.

ئەوێدا."[١] هەر لەو چوارچێوەیەدا کاتێک باس لە مزگەوتی ئەقسا دەکرێت لە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنی ئیسرائیلدا، ناوی مزگەوتی ئەقسا سڕدراوەتەوە و لەبری ئەو، بە ناوی مزگەوتی عومەری کوڕی خەتتاب ناو دەبرێت، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی لە چوارچێوەی پیرۆزییەکەی، وەک یەکەمین ڕووگەی موسڵمانان دای بڕنن، بەم شێوەیە ڕیتمی پرۆگرامی قوتابخانە ئیسرائیلییەکان دزەی کردووەتە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنی وڵاتانی موسڵماننشین.

کاتێک باسی ئیسلام دەکەن هەوڵ دەدەن وەک ئایینێکی دزێو قێزەون بیناسێنن، هەوڵ دەدەن ئیسلام وەک هۆکاری تەواوی دواکەوتووی و نەهامەتییەکانی خۆرهەڵات بناسێنن. بە تایبەتی لکاندنی شوناسی دواکەوتوویی بە ئیسلام و ناساندنی موسڵمانان وەک دواکەوتووترین مرۆڤی جیهان، بە تەنزەوە دەڵێن: تا ئێستا حاجییە هەژارەکان هەر وەکوو خووی باووباپیرانیان بە پێ حەج دەکەن. زیاد لەمە باس لەوە دەکەن خەڵکی ناوچە ئیسلامییەکان خەڵکانی دواکەوتوون و دوور و نزیک پەیوەندییان بە شارستانییەت و پێشکەوتنەوە نییە، لە پەراوێزی پێشکەوتەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دەژین، بەڵام تورکەکان بۆیە پێش کەوتن چونکە توانییان خۆیان لە چوارچێوەی دیدە ئایینییەکان دابڕنن. خودی «کەمال ئەتاتورک»دامەزرێنەری کۆماری تورکیای نوێ دەورێکی کاریگەریی بینیی لە داماڵینی تورکەکان لە تەواوی بەها و ڕەوشتە ئایینی و ئیسلامییەکان و داماڵین و قەدەغەکردنی هەر بابەتێکی ئیسلامی بە شێوەیەک بە هۆی هەوڵەکانییەوە لە هەمبەر دژایەتیکردنی ئیسلام بووە کەسایەتییەکی خۆشەویست و جێقەبووڵی هەموو لایەک، جوولەکە و خۆرئاواییەکان وەک یەکێک لە پاڵەوانە گەورەکانی سەدە دەیناسێنن. هەر

---

(١) التاریخ للصفوف السادسة، هیلة ابراهام عبد الکریم. الظاهر شرکة صبرسکي للنشر، تل ابیب، وەرگیراو لە هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ١١٧.

لەو چوارچێوەیەدا ئیسرائیلییەکان لەپاڵ هەژموونی سەربازی و سیاسیی خۆیاندا، توانییان هەژموونی فەرهەنگیی خۆیان بە سەر ناوچە ژێردەستەکانی فەلەستیندا بسەپێنن و ماوەی نزیک بیست ساڵ ڕێگر بوون لەوەی لە ناوچە فەلەستینییەکانی ژێر دەستیان، هیچ جۆرە بابەتێکی ئایینی بخوێنرێت. لە کۆتاییدا ڕێگەیان دا هەندێک بابەتی ئایینی بە شێوەیەکی سادە و سەرپێیی بخرێتە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنەوە، لە نموونەی بابەتەکانی ئاداب و شێوازی نانخواردن و پارێزگاری لە مافی دراوسێ و چۆنێتیی مامەڵەکردنی میهرەبانانە لەگەڵ ئاژەڵان و ئەنجامدانی هەڵسوکەوتی باش لەگەڵ تەواوی خەڵکی.

هەڵبەت کوردستان وەک بەشێکی دانبڕاو لە کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەدەر نییە لەو دۆخە و بابەتەکانی ئایین و پەروەردەی ئیسلامی کەمترین گرنگی پێ دەدرێت، یاخود مامۆستایەکی ناپسپۆڕ وانەکە دەگرێتە دەست و بەم شێوە گرفتی گەورە بۆ قوتابییان و فێرخوازان دروست دەکات بگرە بە پێچەوانەی مەبەستەوە بابەتی ناتەندروست پێچەوانەی ڕۆحی ئیسلام بە خوێندکارەکانی دەگەیەنێت. هاوکات کەمکردنەوەی پشکی وانەی پەروەردەی ئیسلامی و دەستنیشانکردنی کاتێکی نەگونجاو بۆ خوێندنەوەی ئەو وانەیە، دوو گرفتی ترن کە دووچاری ئەزموونی فێرخوازان دێن. زیاد لەمە لە سەر ئاستی زانکۆ و پرۆگرامی خۆرئاوا هەژموونی خۆی بەسەر تەواوی ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا سەپاندووە. گەر بابەتی مێژوو وەکوو نموونە وەربگرین، دەبینین زۆربەی ناوەندە زانکۆیی و ئەکادیمییەکان بە تەواوی ڕادەستی پرۆگرامە خۆرئاواییەکان بوون وەک ئەوەی لە زۆربەی زانکۆ خۆرئاواییەکان دەخوێنرێت، بۆ نموونە لە لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی پەیوەست بە مێژووەوە، دەبینین باس لە مێژوو دەکرێت بە شێوەی داڕنینی لە ئیسلام و ژێرلێوخستنی ئەو قۆناغ و ڕووداوانەی پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیە، یاخود باسکردنی بە شێوەی سەرپێیی و زەقکردنەوە و تیشکخستنەسەر

بابەتە نەخوازراوەکانی نێو ئەو مێژووە. لە نموونەی بابەتەکانی ناکۆکیی نێوان «ئیمامی عەلی» و «موعاویە» و جەنگی نێوان «عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان» و «عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر» و بەریەکەوتنی نێوان ئومەوی و عەباسییەکان و کۆتاییهاتنی تراژیدیی دەسەڵاتی ئومەوییەکان و دواتر جەنگ و بەریەککەوتنەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکان و دەیان ناونیشانی تری خوێناوی کە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویدا ڕوویان داوە. هەموو ئەم بابەتانە بە شێوەیەک دەخرێنە ڕوو گەر بێتوو بە تەنیا ناونیشانەکانی بخرێنە ڕوو، ڕاستەوخۆ خوێنەر بەو شێوەیە تێ دەگات کە موسڵمانان جگە لە خوێن ناونیشانێکی تریان نییە لە مێژوودا. زۆر جار لەم بابەتانە کێشە لەوەدایە کە ئەم ڕووداو و بابەتە مێژووییانە وەک خۆیان ناخرێنە ڕوو، یاخود بە جۆرێک لە جۆرەکان لە پشتی ئەم ڕووداوە مێژووییانەوە هەوڵی گەیاندنی پەیامی تر دەدرێت، دواتریش خستنەڕووی بابەتەکان بە شێوەیەکە کە دۆخێکی ئاڵۆز و نەخوازراو لای خوێنەر دەخوڵقێنن، تاوەکوو ئەوەی خوێنەر و لێکۆڵەر وا تێ بگات کە تەواوی لایەنە نەیارەکانی نێو ئەم ڕووداوە مێژووییانە وەک یەک تاوانبارن، تەنیا لەپێناوی مەبەست و ئامانجە دونیاییەکانی خۆیاندا تەواوی ئەم ڕووداوە خوێناوییانەیان خوڵقاندوە، زیاد لەمەیش دەیانەوێت بە ڕوونی ئەوەمان پێ بڵێن کە کارەکتەرە سەرەکییەکانی نێو ئەم مێژووە پەروەردەی دەستی ئیسلامن بەرمەبنای ئەم ڕووداوانە دەیانەوێت پێمان بڵێن، ئیسلام جگە لە کارەکتەرێکی شەڕانگێز و خوێنڕێژ زیاتر، هیچ کات ناتوانێت تاکێکی سەرکەوتووی ئاشتیخواز بەرهەم بهێنێت و دەوڵەتانی ئیسلامی لە مێژوودا جگە لە خوێنڕێژی و کوشتار و کاولکاریی زیاتر هیچی تریان بەرهەم نەهێناوە.

بەشێکی زۆر لەوەی ئاماژەمان پێ کرد. لە پرۆگرامەکانی مێژووی ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆکاندا ڕەنگی داوەتەوە، دەبێت لە پرۆگرامەکانی خوێندنی ناوەندە ئەورووپی و خۆرئاواییەکاندا چی بگوزەرێت؟ دەبێت وێنای

تاکی موسڵمان لەم ناوەندانەدا چۆن بێت؟ ڕووداوە نەخوازراوەکانی نێو مێژووی ئیسلامی بە چ شێوەیەک باسی لێوە بکرێت؟

ئەمە لەبارەی بابەتەکانی پەیوەست بە مێژووەوە، لە بواری لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکاندا دۆخەکە باشتر نییە. بە چاوخشانێک بە پرۆگرامەکانی ئەدەبی عەرەبی لە چوارچێوەی ناوەندە زانکۆییەکانی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی دەبینین گرنگییەکی بەرچاو بە جۆرەکانی شیعری هەجوو و شیعری عیشق و ئەڤین و خۆشەویستی و گاڵتەوگەپ و ئافرەت دەدرێت. زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە قۆناغە مێژووییەکانی شیعر خۆی لە زەقکردنەوەی سەردەم و قۆناغەکانی جاهیلی و ئومەوی و عەبباسیدا دەبینێتەوە ئەوەی باسی نییە لە لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بەم بوارە باسکردنی قۆناغی شیعری سەردەمی پەیامبەر(ﷺ) و خولەفاکانی ڕاشیدین و شاعیرانی ئەم دوو قۆناغەیە. هەموو ئەم زەقکردنەوەی قۆناغەکانی دواتر خەفەکردن و ژێرلێونانی ئەو دوو قۆناغەیە تاوەکوو ئەوەی لەو ڕێیەوە پێمان بڵێن لە قۆناغەکانی پەیامبەر(ﷺ) و ڕاشیدیندا شیعر و دەربڕینی ئازاد بە زەبری هێز سەرکوت کراوە، بۆیە لەو قۆناغانەدا هیچ جۆرە شاعیرێک هەڵنەکەوتووە. لە لێکۆڵینەوە جوگرافییەکاندا بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو ستەمێکی گەورە لە جوگرافیایی جیهانی ئیسلامیی و هەوڵی زانایانی موسڵمان سەبارەت بەم زانستە کراوە، لە ناوەندەکانی خوێندندا بە شێوەیەکی چڕوپڕ جوگرافیای خۆرئاوایی و ئەورووپی دەخوێنرێت تەنیا بە شێوەیەکی سادە و سەرپێیی لێکۆڵینەوە لەبارەی جوگرافیای خۆرهەڵات و جیهانی ئیسلامی دەکرێت. لەو چوارچێوەیەدا باس لەوە دەکرێت کە تەواوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست عەرەبن و بنەڕەتی عەرەبیش دەگەڕێتەوە بۆ یەمەن جوگرافیای یەمەنیش بریتییە لە ناوچەکانی سەعدە و حەزرە مەوت و تەعز و هەندێک شار و ناوچەی تر کە ئێستا ئەو ناوچانە دواکەوتووترین ناوچەکانی جیهانن و لە ئابوورییەکی تەواو خراپدا دەژین، ئەوەیش لەپێناو ئەوەی خەڵکی

شەرم بکەن خۆیان بدەنە پاڵ هەر میللەت و نەتەوەیەکی تر جگە لە خۆرئاوا و تەواوی شارستانییەت و ڕەسانەیەتی لە خۆرهەڵات وەربگیرێتەوە بدرێتە پاڵ خۆرئاوا.

ئەم شێوازە لە شاردنەوە و داننەنان بە هەوڵەکانی شارستانیەتی ئیسلامی چەندین بابەتی تری گرتووەتەوە، لەوانە هەوڵی بەرچاوی موسڵمانان لەبارەی زانستی پزیشکی و پێشکەوتنە پزیشکییەکان، بۆیە دەبینین لە ئێستا لێکۆڵینەوە پزیشکییە کۆنەکان لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکانی سەردەمدا دەنگ و باسێکی نییە. لە بابەتی لێکۆڵینەوەکانی فەلسەفەیشدا بە هەمان شێوە، لە ئێستا لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە نوێیەکانی سەردەمدا شتێک نییە ناوی فەلسەفەی ئیسلامی بێت ئەوەی گرنگی پێ دەدرێت تەنیا فەلسەفەی خۆرئاواییە بە ڕیتم و قوتابخانە جیاوازەکانییەوە. تەنیا لە دۆخێکدا باس دەکرێت کە ئەم قوتابخانەیە تەواوی ئەزموونی فەلسەفی خۆی لە خۆرئاواوە وەرگرتوە بێ ئەوەی دوور و نزیک ئاوڕ بدرێتەوە لە ئەزموون و هەوڵ و جێدەستی فەیلەسووفە موسڵمانەکان لە پێشخستنی ئەزموونی فەلسەفی مرۆڤایەتی، ئەمە لە کاتێکدایە ئەزموونی فەلسەفی خۆرئاوایی لە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی ڕوشدیەت و غەزالی و چەندین فەیلەسووفی موسڵمانی تر بونیات نراوە.

بەڵام لە ئێستادا ئەوەی پێی دەگوترێت فەلسەفەی ئیسلامی لە ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆییدا هیچ باسێکی نییە، ئەم بابەتە بە هەمان شێوە درێژ دەبێتەوە بۆ تەواوی کایەکانی تر لە نموونەی بابەتەکانی سیاسەت و ئابووری. ئەم هەموو کاریگەربوونە بە خۆرئاوا و ئەزموونی خۆرئاوا لە کاتێکدایە ئەزموونی موسڵمانان لە تەواوی ئەم کایانەدا بە تەواوی وەلانراوە و بە هیچ شێوەیەک دەنگوباسێکی نییە. دواتر تامەزرۆبوون بۆ خۆرئاوا نەخۆشییەکە کە تەواوی خەڵکانی ئەکادیمی ئێمەی گرتووەتەوە، بە شێوەیەک تاکی خۆرهەڵاتی کاتێک زانکۆ تەواو دەکات، ئاواتەخوازە بگاتە ئەزموونی خۆرئاواییەکان یان هەر چۆن بێت خۆیان بگەیەنە

ئەورووپا و خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی سەرچاوە خۆرئاواییەکان ئاواتی سەرەتا و کۆتاییی ئەوانە. ئەم هەستی خۆبەکەمزانینە لای تاکی موسڵمانی خۆرهەڵاتی جۆرێکە لە گرفتی دەروونی، دەرئەنجامی ئەم هەستی خۆبەکەم زانینە خۆی لە پیرۆزکردنی تەواوی ئەزموونە خۆرئاواییەکان و بەکەمزانینی تەواوی ئەزموونە ئیسلامی و خۆرهەڵاتییەکاندا دەبینێتەوە. لە کۆتاییدا تاکێکی ڕوو لە خۆرئاوا و پشت لە ڕەسەنایەتی ئیسلامی دێتە بەرهەم تاکێکی بێ ئاگا لە تەواوی ڕەسەنایەتیی خۆی کە بە هیچ شێوەیەک کەم تا زۆر ناتوانێت خەڵکانی وڵاتی خۆی سوود لە ئەزموونەکانی وەربگرێت.

تەواوی پەروەردە و فێرکردنی خۆرهەڵات بە میللەتی کوردەوە بە ئاڕاستەی پیرۆزکردنی ئەزموونی خۆرئاوا و پێشکەوتنە زانستییەکانی خۆرئاواوەیە نەوەک ئەوەی چۆن فێری ئەزموونە زانستییەکانی ئەوان بێت، وەک دەگوترێت (اذا عرف السبب بطل العجب) گەر بێتوو خەڵکانێک لە دەرەوەی ئەزموونی خۆرئاوایی تواناکانی بخەنە گەڕ، توانا زانستی و ئەکادیمییەکانیان لە دەرەوەی هەژموونی خۆرئاوا ڕاستەوخۆ ژیانیان ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە.

ستراتیژی بنەڕەتیی خۆرئاواییەکان لەوەدا خۆی دەبنێتەوە کە نابێت هیچ کات خۆرهەڵاتێکی بەهێز بوونی هەبێت، هەر بەهێزبوون و پەرەسەندنێکی خۆرهەڵات واتای لاوازبوونی هەژموونی خۆرئاواییە، ئەمەیش لەپێناوی ئەوەی تاوەکوو هۆکاری دواکەوتوویەکانی خۆرئاوا ببەسترێتەوە بە پابەندبوونی بە ئیسلامەوە. چارەسەری دۆخی دواکەوتوویش دەبەستنەوە بە دوورکەوتنەوە لە ئیسلام و وازهێنانیان لە بەها ئیسلامییەکان و هەوڵیش دەدەن هیچ کەس و لایەنێک توانا زانستییەکانی پێش نەکەوێت، مەگەر لە ژێر هەژموون و چەتری خۆرئاوادا نەبێت. خۆرئاواییەکان تەواوی هەوڵەکانیان دەخەنە گەڕ لەپێناو لاوازکردنی ئاستی زانستی. یەکێک لەو کەرەستانە تێکەڵکردنی ڕەگەزی کوڕان و کچانە لە ناوەندەکانی خوێندندا، وەک هەوڵێکی جیدی بۆ

لاوازکردنی ئاستی زانستیی قوتابییان و فێرخوازان یەکێک لە سەرچاوەکانی دامەزراوەی «فرانکلینی ئەمریکی» تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە: دەرچوونی کچان لەگەڵ کوڕان و تێکەڵکردنیان دۆخێکی تەواو تەندروست و ئاساییە و دەبێت خێزانەکان بە ئاسایی قەبووڵی بکەن، بەو پێیەی دۆخێکی لەو شێوەیە گوزارشتە لە هەستی قەبووڵکردن و خۆشەویستیی نێوان هەر دوو ڕەگەز و ڕێزگرتن لە هەستەکانی یەکتری بە دەستلێدان و ماچکردن و پەیوەندیی جەستەیی نێوان هەر دوو لایان، هەموو ئەم جۆرە پەیوەندییان هەتا دەگاتە ئاستی پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان حاڵەتێکی ئاسایی و تەندروستە و هیچ گرفتێکی پەروەردەیی و فێرکاریی بە دوای خۆیدا ناهێنێت، بەپێچەوانەوە هۆکارێکی باشە بۆ پەیوەندیی تەندروستی نێوان هەردوو لا!![1] هەموو ئەم هەوڵانە لەپێناو لێکهەڵوەشاندنی جیهانی ئیسلامی و لاوازکردنی ئاستی زانستیی خوێندکاران و داماڵینی بەرگی ڕەوشت لە دامەزراوەی خێزان و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی تەواوی کۆمەڵگە. لە سەروو هەموو ئەم ئامانجانەوە تێکدانی دۆخی ئاسایی خۆرهەڵاتی ئیسلامییە.

خۆرئاواییەکان باش لە گرنگیی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن تێگەیشتوون، ئاگاداری ئەوەن هەر بەرەوپێشچوونێک لە بواری پەروەردە و فێرکردندا، کاریگەریی ئەرێنی لە تەواوی کایەکانی کۆمەڵگە بە دوای خۆیدا دەهێنێت، لەم نێوەندەیشدا مامۆستا وەک کارەکتەرێکی پەروەردەیی و زانستی دەورێکی بەرچاوی هەیە لە ئاراستەکردنی قوتابییان و فێرخوازان، بۆیە هەر تۆکمەبوونێکی مامۆستا لە ڕووی زانستی و پەروەردەییەوە، کاریگەریی ئەرێنیی بەرچاو بە دوای خۆیدا دەهێنێت و پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە. هەر نزیک لەم هەوڵانە لە کۆنگرەی تەبشیری مەسیحی کە ساڵی ١٩٣٥ لە قودس

---

(١) بڕوانە: حصوننا مهددة من داخلها، محمد محمد حسين، مكتبه المنار الاسلامية الكويت ١٩٦٨.

بەسترا، یەکێک لە ئەندامانی کۆنگرەکە بە ناوی (هدی نبی) چەند تێبینی و پێشنیارێکی خستە بەردەم ئەندامانی کۆنگرە و تێیدا دەڵێت: "بە ڕاستی بەس نییە بۆ مامۆستایانی قوتابخانە تەبشیرییەکان، تەنیا مەسیحی بن، بەڵکوو زیاد لەوەی کە مەسیحین، پێویستە مەسیحییەکی توند بن، لە ناخی دڵەوە مەسیحی بن و بە دڵسۆزییەوە کار بکەن بۆ بەرجەستەکردنی ئامانجەکانی مەسیحییەت و بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان لە سەرانسەری جیهاندا و ئەم مەبەستانە بکەنە ئامانجی گەورەی ژیانی خۆیان." کەواتە خۆرئاواییەکان چەندە مەبەستییانە پرۆگرامی لاواز و فشەل لە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بڵاو بکەنەوە، هێندەیش کار دەکەن لە سەر ئەوەی کە مامۆستا و کارەکتەری فێرکاری و پەروەردەیی لاواز بخزێنە نێو ناوەندەکانی خوێندنەوە، ئەوان بە ڕوونی لەوە تێ گەیشتوون کە مامۆستای سەرکەوتوو دەتوانێت گۆڕانکاریی گەورە لە ناوەندەکانی خوێندن و هزر و بیرکردنەوەی لاواندا بەرجەستە بکات، لە چوارچێوەی ئەم بابەتە نووسەری پەرتووکی (المشكلة الشرقية) کە لە ساڵی ١٩٥٧ لە لەندەن چاپ کراوە، دەڵێت: "بێگومان دەبێت بزانین کە مژدەدەرەکان شکستیان هێنا لە شێواندنی عەقیدە و بیروباوەڕی موسڵمانان و تێکدانی بیروباوەڕیان، بەڵام دەکرێت سەرکەوتوو بین لە گەیاندنی ئەم مەبەستە لەڕێی زانکۆ و دامەزراوە زانکۆییە خۆرئاواییەکانەوە، بۆیە پێویستە ژمارەیەک کەسایەتیی لاواز لە خۆرهەڵاتەوە بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن بهێنرێنە نێو زانکۆ خۆرئاواییەکان و تەواوی خزمەتگوزارییەکانیان پێشکەش بکرێت و لە کۆتاییدا هەر چۆن بێت بڕوانامەی بەرزیان پێ ببەخشرێت، تاوەکوو ئەوەی لە کۆتاییدا ببنە موژدەدەری نەناسراو و ببنە گەیەنەری کەلتوور و شارستانیەتی خۆرئاوایی مەسیحی و...هتد" هەر لەم سەرچاوەیەدا نووسەر لە درێژەی ئەم بابەتەدا دەڵێت: "من باوەڕی تەواوم وایە کە دەبێت ئەم زانکۆ خۆرئاواییانە بە تەواوی بخرێنە خزمەتی شێتە خۆرهەڵاتییەکان، تاوەکوو

ئەوەی تێیدا بڕوانامەی باڵا بە دەست بهێنن و لە ڕێی بڕوانامەکانیانەوە ببنە خاوەنی پێگەیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی لە خۆرهەڵات و ئامادەساز بن بۆ ئەنجامدانی چالاکیی ناڕاستەوخۆی بەمەسیحیکردن و ببنە کارەکتەرێک لە ناوەندەکانی خوێندنی خۆرهەڵات، تاوەکوو ئەوەی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە مەبەستەکانی ئێمە جێبەجێ بکەن، هەموو ئەمانە بە ناوی چاکسازیکردن و ڕیفۆرمکردن لە ئایینی ئیسلام و هزر و بیرکردنەوەی موسڵماناندا."

خۆرئاواییەکان بەم شێوەیە کار دەکەن لەسەر تێکدان و لەبەریەک هەڵوەشاندنی سیستمی ناوەندەکانی خوێندنی خۆرهەڵاتی ئیسلامی. بەشێکی ئەم هەوڵانە لە ڕێگەی پەروەردەکردنی مامۆستای لاواز و ناتەندروست و خزاندنیان بۆ نێو ناوەندەکانی خوێندنی خۆرهەڵات. لە ڕاستیدا پەروەردە و فێرکردن لە وڵاتانی ئیسلامیدا لە دۆخێکی مەترسیداردایە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو دواوە دەچێت. جێگەی هەڵوێستەکردنە بۆچی دوای چەندین سەدەیە لە بوونی وانە زانستییەکانی فیزیا و کیمیا و بەردەوامیی قوتابی لە خوێندنی ئەم زانستانە بۆ ماوەی چەندین ساڵ، تاوەکوو ئێستا داهێنانێکی لە بوارە زانستییەکان لە سەر دەستیان ڕووی نەداوە. تا وەکوو ئێستا ناوەندەکانی خوێندنی خۆرهەڵاتی ئیسلامی نەیان توانیووە، زانایەکی گەورەی بواری ناوەکی پێشکەش بکەن؟ بۆ زانکۆکانی ئەوان دەتوانن چەندین گەورە زانای بوارە زانستییەکان پێشکەش بکەن، بەڵام زانکۆ و ناوەندەکانی خوێندنی ئێمە تەواو نەزۆکن لە بەرهەمهێنانی کارەکتەری زانستیی لەو شێوەیە. خۆرهەڵاتی ئیسلامی دەستێکی باڵای هەیە لە پەروەردەکردنی گۆرانیبێژان و سەماکەران و ئەو کاراکتەر و کەسایەتییانەی کە هیچ پێگەیەکیان نییە لە پێشخستنی دۆخی زانستیی وڵات.

# تۆمەتبارکردنی ئیسلام و موسڵمانان بە تیرۆر

لە ڕاستیدا تیرۆر ئەو چەمکە لاستیکییەیە کە لە سەرانسەری جیهاندا دەسەڵات و حوکومەت و دامەزراوەکان دوژمنان و نەیارانی خۆیانی پێ تاوانبار دەکەن. بەتایبەتیتر خۆرئاواییەکان و زایۆنییەکان هەمیشە ئەم چەمکە وەک چەکێک دژی هەر موسڵمانێک لە سەرانسەری دونیادا بەکاردەهێنن. لکاندنی ئەم چەمکە بە موسڵمانانەوە دەورێکی کاریگەری هەیە بۆ شەرعیەتدان بە لەناوبردن و کوشتاری موسڵمانان. زایۆنییەکان و مەسیحییە توندڕەوەکانی خۆرئاوا سەرکەوتووبوون لە دروستکردنی جۆرێک لە ڕای گشتی لە ئەورووپا و بەشێکی بەرچاو لە خۆرهەڵات سەبارەت بە ناساندنی تاکی موسڵمان وەک تاکێکی تیرۆریست و لکاندنی تیرۆر بە خودی ئیسلامەوە و زەقکردنەوەی ئەو بۆچوونەی کە ئەوە تەنیا و تەنیا ئیسلامە کە لە سەرانسەری جیهاندا تیرۆر بەرهەم دەهێنێت.

ئەو چەمکە باوەی ئێستا لە جیهاندا باوە بە ناوی جەنگی دژی تیرۆر، لە بنەڕەتدا چەمکێکی زایۆنیی مەسیحیی ڕادیکاڵە دژی هەر مۆرکێکی ئیسلامی لە سەرانسەری جیهاندا کە لە ساڵی ١٩٧٩ لە کۆنگرەی قودس بە ناوی (حول الإرهاب الدولي) لەلایەن «بنیامین ناتەنیاهۆ» زەق کرایەوە. هەر لەو کۆنگرەیەدا چەند بنەمایەکی ئایدیۆلۆژیی گرنگ خرایە ڕوو بە مەبەستی شەڕکردن و قەڵاچۆکردنی ئەوەی پێی دەوترێت تیرۆری ئیسلامی.

لەو کۆنگرەیەدا بە ئامادەبوونی هەر یەک لە «جۆرج بووش» و «ڕیتشارد بایبس» و سیناتۆر «هنری جاکسۆن» و «شیمۆن پیریز» ئەم چەمکەی لە سەر

ئاستی سیاسی و ڕاگەیاندن زەق کرایەوە تاوەکوو ئەوەی بتوانن لە ژێر ئەم چەمکەدا ئیسلام وەک ئایین لە تەواوی خۆرهەڵاتدا لاواز بکەن. ئەمە وەک چەمکی جەنگی دژی تیرۆر، دەنا خودی تیرۆر لە بنەڕەتدا وشەیەکی نوێ نییە، بەڵکوو مێژوویەکی کۆنی هەیە بە هۆی ڕووداوە خوێناوی و جەنگ و توندڕەوییەکانی ئەورووپاوە لەدایک بوو، بە تایبەتی ئەوەی لە فەڕەنسا و بەریتانیا ڕووی دا کە پێیان دەوت (التخويف الحوكمي) واتە ترساندنی فەرمی و حوکوومەت بەرپرسیارە لە ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی. ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی زەق بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شۆڕشی فەڕەنسی لە ساڵانی ١٧٨٩ هەتاوەکوو کۆتاییی شۆڕشی فەڕەنسی ١٧٩٨ بەم شێوەیە بە کار دەهات، دواتر کۆتاییی سەدەی هەژدە بە شێوەی تیرۆر بەکار هات.

کەواتە دەرکەوتنی وشەی تیرۆر لە بنەڕەتدا بەرئەنجامی زوڵم و ستەم و سیاسەتی دزێوی خۆرئاواییيەکانە کە وەک کەرەستەیەکی سەرکوتکەرانە دژی یەکتری بە کاریان هێناوە، بەڵام چەمکی جەنگی دژی تیرۆر ساڵی ١٩٧٩ لەلایەن زایۆنییەکانەوە بە مەبەستی دژایەتیکردنی ئیسلام خرایە ڕوو، دواتر لە ساڵی ١٩٩٦ لە هەنگاوێکی نوێدا هەستان بە داڕشتنەوەی سەرلەنوێی نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ژێر ناوی کارکردن لە سەر پلانی «برنارد لویس» کاری لە پێشینەی داڕشتنەوەی نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست خۆی لە داگیرکردن و تێکشکاندنی عێراقدا دەبینییەوە، دواتریش لاوازکردن و تێکشکاندنی یەک لە دوای یەکی ژمارەیەک لە وڵاتانی عەرەبی تری ناوچەکە. بەشداربووانی پلانی داڕشتنەوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ بە ناوی «کلین بریک» هەمان ئەو کەسانە بوون کە بەشدار بوون لە پەیماننامەی «دووبارە داڕشتنەوەی توانا بەرگرییەکانی ئەمەریکا» هەنگاوی یەکەمی ئەم پرۆژەیە دروستکردنی سیناریۆی ڕووداوەکانی یازدەی سێپتێمبەر بوو کە تێیدا ئیسلامیان وەک کەرەستەیەکی بەرهەمهێنانی تیرۆر بە تەواوی خۆرئاوا

ناساند، لە کاتێکدا خۆیان دروستکەر و بەرهەمهێنی سەرەکیی ئەو ڕووداوە بوون. لە چەندین شوێندا بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دان دەنێن بەوەی کە خۆیان خوڵقێنەری ئەو ڕووداوەن کە دواتر پاڵنەری تۆڵەی ئەم کارە هەزاران هەزار موسڵمان لە سەرانسەری دونیادا بوونە قوربانی و ئەمریکییەکان و خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بوون لەوەی چەمکی تیرۆر بکەنە شوناس و نازناوی ئیسلام و موسڵمانان.

لەم چوارچێوەیەدا «برنارد لویسی» زایۆنی دەڵێت: "بە ڕاستی ئەو تیرۆرەی ئەمڕۆ موسڵمانان بەرجەستەی دەکەن، بەشێکی کەمە لەو بەرگرییەی کە ئیسلام لە ڕابردوودا بەرانبەر خۆرئاوا ئەنجامی داوە"[١] دواتریش ئەم تێگەیشتنە لای زۆرێکی زۆر لە سیاسەتمەدار و داڕێژەرانی سیاسەتی دەورەی ئەمەریکا بە تەواوی زەق بووەوە. «نکیسۆن» سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا لە پەرتووکی (الفرصة السانحة) دا دەڵێت: "مەبەستی ئەمەریکا بە ئیسلامییە ئوسوڵییەکان (تیرۆریستەکان) ئەوانەن کە دەیانەوێت شارستانیەتی ئیسلامی بڵاو بکەنەوە و شەریعەتی ئیسلامی سەرلەنوێ زیندوو بکەنەوە و کاری پێ بکەن. ئەوانەن کە دەیانەوێت ئیسلام لە یەک کاتدا هەم ئایین بێت و هەمیش دەوڵەت." ئەم دەربڕینەی «نکیسۆن» جێگەی هەڵوێستەکردنە و پێویستە بە وریاییەوە لە سەری بووەستین، تاوەکوو بەوردی تێ بگەین لەوەی کە ئەوان کاتێک باسی تیرۆر دەکەن، ڕاستەوخۆ مەبەستیان پێی ئیسلامە.

لەم جۆرە دەربڕینانەوە تێ دەگەین لەوەی کە ئەوان چ جۆرە ئیسلامێکیان دەوێت و دڵیان چ جۆرە ئیسلامێک دەخوازێت. ئەوان کێشەیان لەگەڵ ئەو فۆڕمەی ئیسلام نییە کە بە تەنیا خۆی لە پەرستش و پەیوەندیی نێوان خودا و بەندەکاندا دەبینێتەوە، ئەم جۆرە لە ئیسلام هیچ کات مایەی مەترسی

---

(١) بڕوانە: مجلة النيوزيك الأمريكية ژمارەی ١٤ مانگی یەنایەری ٢٠٠٤.

نییە بۆ ئەوان وەک ئەوەی لە ئێستا لە زۆربەی جیهاندا بەرجەستە دەکرێت، بەڵام خۆرئاواییەکان بەم فۆرمەیش ڕازی نین. لە فەرهەنگی ئەواندا هەموو موسڵمانێک تیرۆریستە، تەنانەت ئەگەر نەیشزانن چەک بە کار بهێنن. ئەوان هەر بە چاوی تیرۆر لە موسڵمانان دەڕوانن، گەر چی خۆیان بێبەری بکەن لە تەواوی ئەحکامە شەرعییەکان، موسڵمانان هەر مەحوکمن بە تیرۆر، تەنانەت گەر تەواوی ئایەتەکانی خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە بە شێوەیەکی پووچ تەئویل بکەن، گەر بێتوو خۆیان بێبەری بکەن لە تەواوی جووڵانەوە و بزووتنەوە ئیسلامییەکان. موسڵمان مەحوکمە بە تیرۆر، تەنانەت ئەگەر پێشی وابێت ئیسلام تەنیا پەیوەندیی نێوان خودا و بەندەکانە و دوور و نزیک پەیوەندیی بە حوکمداری و بەڕێوەبردنەوە نییە. لە کۆتاییدا خاڵی ڕازیکەر و بنبەست لای ئەوان دوورکەوتنەوەیە لە ئیسلام و شوێنکەوتنی ئایین و بیروباوەڕی ئەوانە، وەک قورئانی پیرۆز وێنای ئەو ڕاستییەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَلَنْ تَرْضَىٰ عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ [البقرة: ١٢٠] واتە: «جوولەکە و نەیارانیان هیچ کات لێت ڕازی نابن، تاوەکوو ئەوەی شوێن میللەت و بیروباوەڕی ئەوان نەکەویت.»

واقیعی ئێستای جیهانیش ئەوەمان پێ دەڵێت کە خۆرئاوا بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکان لە موسڵمانان ڕازی نین و جێ قەبووڵی ئەوان نین، خوای گەورە زۆر جار ڕاستییەکانمان لە زاری خۆیانەوە بۆ دەخاتە ڕوو، ئەوەی لە ناو دەروونیاندا حەشاریان داوە، بۆمان دەخاتە ڕوو و لە ڕاگەیاندنەکانی خۆیاندا ئەم ڕاستییانە ئاشکرا دەکەن. ئەم ئاشکرابوونەیش لەپێناوی ئەوەی ئەو موسڵمانانەی لە قورئان و واقیع تێ ناگەن، بە دروستی لە زمانی خۆیانە و حاڵی بن، لەوەی ئەوا لە ناخیاندا چییان حەشار داوە و چ پلانێکیان هەیە بۆ جێبەجێکردنی خواست و ویستە دوژمنکارانەیان و لە زاری خۆیانەوە ڕاستییەکان ببیستن. وەک ئەوەی «مارگرێت تاستر» سەرۆک وەزیرانی

پێشووی بەریتانیا دان بەو ڕاستییەدا دەنێت و بەڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەو بابەتە و دەڵێت: "سەرکوتکردن و دژایەتیکردنی ئیرهابی ئیسلامی تەنانەت ئەو موسڵمانانەیش دەگرێتەوە کە دژی ڕووداوەکانی یازدەی سێبتیمبەر و بنلادن و بزووتنەوەی تاڵیبانن ... زیاد لەمە جەنگی دژی تیرۆر هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان دژی قیەم و بنەما خۆرئاواییەکانن یاخود نایەنەوێت بنەما خۆرئاواییەکان بکەنە ڕیتمی ژیانی خۆیان، تەنانەت هەموو ئەو کەسانەیش دەگرێتەوە کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ خۆرئاوا یەک ناگرێتەوە."[١] هەر لەم چوارچێوەیەدا بیرمەندی گەورەی ئەمریکی «فۆکۆیاما» دەڵێت: "ئەو کێشمەکێشم و بەریەککەوتنەی ئەمڕۆ هەیە، هەر وا بە ئاسانی دژی تیرۆر نییە، بەڵکوو جەنگێکی سەرتاسەرییە دژی ئیسلامییە ئوسوڵییەکان و بیروباوەڕەکەیانە کە بووەتە ئاستەنگی ڕاستەقینە لە هەمبەر هەژموونی خۆرئاوا و دەوڵەتی عالەمانی لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا."

«فۆکۆیاما» لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: "مەترسیی ئەم ئایدیۆلۆژییە بنەڕەتخوازە مەترسیدارترە لە ئایدیۆلۆژیای شیوعییەت، بۆیە پێویستە لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەترسییە ڕاستەقینەیە جەنگ بەرپا بکرێت، دۆخیان دووچاری شێوان بکرێت، تاوەکوو ئەوەی هەموو لایەک ڕازی بن، بە مۆدێرنەی خۆرئاوایی و دەوڵەتی عالەمانی"[٢] خۆرئاواییەکان ئەو بابەتە دەورووژێنن کە کێشمەکێشمی ئەوان لەگەڵ ئیسلام یەکسانە بە بەرەنگاربوونەوەی بەربەریەت و تیرۆر و دواکەوتوویی ئیسلام دژی فەلسەفەی ژیاندۆستی و ئاوەدانی خۆرئاواییە.

لە کۆتاییدا دەیانەوێت پێمان بڵێن دەستخستنی پێشکەوتن دوور لە زمان و

---

(١) بڕوانە: مجلة الصمود حرب على الارهاب أم حرب على الاسلام و قيمه ٢٠١٨/١٠/٢٢.

(٢) بڕوانە: گۆڤاری نیوز ویک ژمارەی ساڵانەی خۆی بە بەرواری دیسەمبەری ٢٠٠١ وەرگیراوە لە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کەلتووری ئەوان مەحاڵە، هەر پێشکەوتنێک دوور لە شووناسی خۆرئاوایی جگە لە دواکەوتوویی زیاتر شتێکی تر نییە. لە ڕاستیدا بیرکردنەوەیەکی لەم شێوەیە تەواو نالۆژیکییە. لە بەرانبەردا دەپرسین کێ ئەو مافەی بە ئێوە دا تەواوی پێشکەوتنەکان بۆ خۆتان قۆرخ بکەن؟ بۆ پێیتان وایە فڕۆکە نافڕێت گەر بێتوو فڕۆکەوانەکە خۆرئاوای نەبێت و بە زمانی ئینگلیزی نەدوێت؟ یاخود کۆمپانیا بەڕێوە ناچێت، گەر خاوەنەکەی قژزەرد و سپیپێست نەبێت؟ یاخود کاری میدیایی سەرکەوتوو نابێت گەر بێتوو بە شێوەیەکی نیمچە ڕووت نەبێت؟ ڕیکلام شکست دەخوات، گەر بێتوو جەستەی ئافرەتی لەگەڵدا نەبێت؟ لە ڕاستیدا ئیسلام نەک دوژمنی پێشکەوتن نییە، بەڵکوو گەورەترین کەرەستەی هاندانی میللەت و نەتەوەکانە بۆ پێشکەوتن. ئەورووپییەکان باش دەزانن بە درێژایی سیازدە سەدەی ڕابردوو، پێشکەوتن و خوێندن و خوێندەواری سەرچاوەکەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بووە و کارەکتەرەکانی نێو مەیدانەکە موسڵمانان بوون. خۆرئاواییەکان زۆرێک لە ئەزموون و پێشکەوتنەکانی خۆیان لە بوارە زانستییە جیاوازەکاندا لە موسڵمانانەوە وەرگرتوە، ئەگەر ستەم و داگیرکاریی ئەوان نەبووایە بەرانبەر جیهانی ئیسلامی، ئەوا هیچ کات نەیان دەتوانی پێشی موسڵمانان بکەون. موسڵمانان وەک سواری مەیدانی پێشکەوتنە زانستی و شارستانییەکان دەمانەوە، لە بەشەکانی دواتردا بە درێژی باسی ئەم بابەتە دەکەین.

دەگەڕێینەوە سەر وەڵامی ئەو پرسیارە، هۆکاری دواکەوتوویی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئیسلام فەرمانڕەوایە لەم ناوچەیە و بووەتە ڕێگر لە بەردەم پێشەکەوتن و بەرەوپێشچوونی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، یان کۆمەڵێک سیستمی عەرەبی نزیک لە خۆرئاوا حوکم دەکەن؟ گەر بڵێین ئەوە ئیسلامە فەرمانڕەوایی ئەم ناوچەیە دەکات، ئەوە درۆیەکی گەورەیە، خۆیان و تەواوی جیهانیش دەزانن بانگەشەیەکی لەم شێوەیە دوورە لە ڕاستییەوە.

گەر بڵێن نەخێر ئیسلام حوکم ناکات، ئەوە قسە و شاهیدی ئێوەیە و دەپرسین، ئیتر دژایەتی و شەڕفرۆشتن بە ئیسلام و موسڵمانان بۆچی و لەپێناوی چیدا؟ یان لەبەرئەوەیە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست موسڵماننشینن، ئەوانیش مێژوویەکی کۆنیان هەیە لە دژایەتیکردنی موسڵمان و بەرەنگاربوونەوەی هێز و تواناکانیان. هەموو ئاماژەکان ئەوەمان پێ دەڵێن، دژایەتیکردنی ئەمەریکا و خۆرئاوا دژی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە بنەڕەتدا بە پاڵنەری ئایینییە و جەنگی ئەوان لە دژی موسڵمانان بە پاڵنەری ئایینییە، نەوەک بەرگری لە پێشکەوتن و شارستانییەت.

وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، بۆ یەکەمین جار ئیسرائیلییەکان بە پاڵپشتی «جۆرج بووش» چەمکی جەنگی دژی تیرۆریان هێنایە کایەوە. تەواوی خۆرئاواییەکان لە سەروو هەموویانە و لێکۆڵیار و بیرمەندانی ئەمریکی و خۆرئاوایی ئەو ڕاستییە دەزانن کە «جۆرج بووش» لە خانەوادەیەکی ئایینیی توندڕەوی دژە ئیسلام لە دایک بووە و باپیرە گەورەی یەکێک بووە لە وتاربێژەکانی کڵێسا و مامۆستای زمانی عیبری و ئادابی خۆرهەڵاتی بووە لە زانکۆی نیویۆرک.

بووشی باپیر یەکێک بووە لە نەیارانی سەرسەختی ئیسلام و خۆرهەڵاتی ئیسلامی، ناوبراو لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی «موحەممەد دامەزرێنەری ئایینی ئیسلام و ئیمپراتۆریەتی موسڵمانان» لە پاڵ سووکایەتییەکی زۆر بە ئیسلام، «موحەممەد» بە دامەزرێنەری ئایینی ئیسلام ناو دەبات و پێی وایە ئەم ئایینە دوور و نزیک پەیوەندیی بە خودا و ئاسمانەوە نییە، دواتریش دژایەتی توندی خۆی بۆ موسڵمانان دەردەبڕێت بە مار و مێروو و سەرچاوەی تەواوی نەهامەتییەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ناویان دەبات و چەندین بوهتانی ناڕەوا دەداتە پاڵ پەیامبەر (ﷺ) و لەناو ئەواندا باس لەوە دەکات کە پەیامبەر خوێندەوار بووە و زانیویەتی بنووسێت و بخوێنێتەوە.

کاتێک باس لە یەکتر قەبوولکردن دەکرێت، تەواوی ئایینەکان بە توندی دژایەتیی ئایین و پیرۆزییەکانی ئێمە دەکەن و تەواوی بێڕێزییەکان ئاڕاستەی پەیامبەری ئێمە(ﷺ) دەکەن، بە پێچەوانەوە ئێمە بە چاوێکی پڕ لە ڕێز و شکۆوە لە تەواوی پەیامبەرانی تر دەڕوانین و باوەڕهێنان و بە پەیامبەرانی تر وەک بەشێک لە بنەماکانی بیروباوەڕی خۆیان هەژمار دەکرێت، بەڵام لە بەرانبەر ئەم جۆرە ڕوانینە «بووشی باپیر» لە پەرتووکەکەیدا باس لەوە دەکات کە بۆیە خوای گەورە ڕێگەی داوە ئیسلام بەو شێوەیە بڵاو ببێتەوە، تاوەکوو ببێتە سزایەک بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە و دوور کەوتوونەتەوە، پاشان دەڵێت: "خودا ئارامی لەبەر بڕا، زۆر تووڕە بوو، هەتا عەرەبە موسڵمانەکانی کرد بە هۆکاری سزادان، زیاد لەمە ئیسلام کەرەستەیەکە بۆ سزادانی تەواوی ئایینەکان." لە بەرانبەر ئەم هەموو توندڕەوییەدا، هیچ کەس هەیە ناوبراو تۆمەتبار بکات بە توندڕەوی؟

نزیک لەم بیرکردنەوە ئایینییە سەرۆکی پێشووی فەرەنسا لە یادەوەرییەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ لەلایەن «جۆرج بووش»ی سەرۆکی ئەمەریکاوە پێوەندیم پێوە کرا، لە ڕاستیدا تەواو بەو پەیوەندییە سەرم سوڕماو و تووشی شۆک هاتم، «بووش» داوای لێ کردم کە ڕازی بم لە سەر بەشداریکردنی سوپای وڵاتەکەم لە هاوپەیمانیی ئەمریکی بۆ لێدانی عێراق بە بیانووی ئەوەی گوایە ئەمە شەڕی یەئجوج و مەئجوجە و دەبێت کۆتاییان پێ بهێنرێت. بەو پێیەی یەئجوج و مەئجوج لە نزیک شاری بابل لە عێراقی کۆن خۆیان حەشار داوە. بە ڕاشکاوی پێی وتم، ئەم هێرشە هێرشێکی ئیمانیی پیرۆز و ئەرکێکی خوداییە کە تەورات و ئینجیل ئاماژەیان پێ کردووە."[١] ئەمە عەقڵییەتی کارەکتەرێکی سیاسیی وەک «جۆرج بووش»ە لە سەردەمی عەولەمە

---

(١) بڕوانە: گوتاری: بالصوت والصورة حرب على الإسلام أم حرب على الإرهاب نووسینی السعيد الخميسي ١١-٨-٢٠١٨ موقع نافذة مصر.

و پێشکەوتن و کرانەوەی شارستانیەتی میللەتانی دونیا بە ڕووی یەکدا.

لە ڕاستیدا ئەوەی «بووش» وتوویەتی شتێکی نوێ نەبووە، هێندەی درێژەپێدەری ئەو ڕێنماییانەیە کە لە ناو تەورات و ئینجیلی ئێستادا بوونی هەیە، هەر بۆیە خۆرئاواییەکان بە تەواوی ئاراستە جیاوازەکانیانەوە ئامادەسازی دەکەن بۆ جەنگێکی گەورە لە فەلەستین. وەک ئەوەی لە «سفری ئەشیع» هاتووە کە پێش هاتنەوەی مەسیح و فەرمانڕەوای لەسەر زەوی، دەبێت شەڕێکی گەورەی وێرانکەر بە ناوی «هەرمجدون» لە فەلەستین ڕوو بدات کە تێیدا ملیۆنان کەس دەبنە قوربانی. لە ڕاستیدا ئەمە بیروڕای زۆرێکی زۆر لە ئەمریکییەکانە بەبێ جیاوازی لەنێوان ئەمریکییە توندڕەو و ئاییندارەکان و ئەمریکییە عالەمانییەکان، هەر دوو لایان بڕوایان بە هەمان کێشمەکێشمی بەریەککەوتنی کۆتایی نێوان ئایین و شارستانیەتەکان هەیە. جیاوازییەک نییە لە ئاراستەی بیرکردنەوەی سەرکردە ئایینییەکان و بیرمەندە عالەمانییەکانیان. جیاوازیی نییە لەنێوان سەرکردە ئایینییەکانی وەک «جیری فالویل» و «بات ڕوبنسون» لەگەڵ بیرمەندانی عالەمانی وەک «فرانسیس فۆکۆیاما» و «سامۆیل هانیتنگۆن» هەر دوو لایان هەوڵی هەڵگیرساندنی جەنگی «هەرمەجدون» دەدەن، ئەویان بە بیرێکی ئایینی و ئەوی تریان بە بیرێکی عالەمانی.

لە ڕاستیدا جەنگی ئەمەریکا دژی عێراق و بەشێکی بەرچاو لە جەنگەکانی تری جەنگی ئایینین، یاخود لانی کەم پاڵنەری ئایینییان هەیە. دانپێدانانی «بووش» بەوەی کە ئەم جەنگە جەنگی خاچپەرستیی نوێیە، لە یەکێک لە کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکاندا ڕاستیی ئەم بابەتە پشتڕاست دەکاتەوە. نەک هەر خودی «بووش» بەڵکوو بەشێکی بەرچاو لە سەرکردە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە چەندین شوێنی جیاوازدا ئەم ڕاستییەیان درکاندوە. لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لە ٢٠٠٤/٥/٢٦ یەکێک لە سەرکردە سەربازییەکانی ئەمەریکا

باس لەوە دەكات كە «بووش» ئەم جەنگەی لەپێناوی مانەوە و پاراستنی ئاسایيشی ئیسرائیلدا بەرپا كردووە، جگە لەمانەش بەشێكی بەرچاو لە نووسەران و شارەزایانی سیاسەتی ئەمەریكا ئەم بابەتەیان پشتڕاست كردووەتەوە.

نووسەری پەرتووكی (ال بوش بورتريه السلالة الحاكمة) تیشك دەخاتە سەر ئەو ڕاستییەی كە «بووش» بە پاڵنەری ئایینی جەنگی دژی تیرۆری هەڵگیرساندوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە ٢٠٠٤/٤/١٤ لە ڕاپۆرتێكی شیكاریدا تیشك دەخاتە سەر ئەوەی كە «بووش» ژمارەیەكی بەرچاو لە مۆژدەدەرە مەسیحییەكانی حوكوومەتەكەی ڕەوانەی عێراق كردووە. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە لە بیركردنەوەیە تەنیا بیروباوەڕی «بووش» نییە، بەڵكوو بە درێژایی مێژووی ئەمریكا زۆرێك لە سەرۆكە ئەمریكییەكان كەمتازۆر هەڵگری جۆرێك لە دەمارگیری و توندڕەویی ئایینی بوون، بەشێكی بەرچاو لە سیاسەتەكانی دەرەوەیان بە پاڵنەری ئایینی ئەنجام داوە. هەر لەم ڕوانگەیەوە «ویلسۆن» بیست و هەشتەمین سەرۆكی ئەمەریكا (١٨٥٦-١٩٢٤) پێی وایە كە خودا ئەمریكای دروست كردووە و هەڵی بژاردوە بە سەر تەواوی گەلانی تردا. «ئەمریكییەكان گەلی هەڵبژێرراوی خودان».[1] زۆرێك لە سەرۆكەكان دەسەڵاتدارن و داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمریكی بەم شێوەیە بیر دەكەنەوە. گوزەرێك بە نێو سەرچاوەكانیاندا ئەم بابەتە پشتڕاست دەكاتەوە، هەر لەم چوارچێوەیەدا «برنارد لویس» ڕاوێژكاری كۆشكی سپیی ئەمەریكا لە پەرتووكەكەیدا بە ناوی (ماهو الخطأ الحادث في العلاقة بين الإسلام والغرب) بەڕوونی تیشك دەخاتە سەر دەمارگیریی ئایینیی سیاسەتی ئەمریكی و بە ئاشكرا باس لەوە دەكات كە جەنگی ئەوان لە تەواوی جیهاندا،

---

(١)بڕوانە: پەرتووكی حرب القيم عبد الكريم بوفره، دار الأحمدية للنشر جدة سنة ٢٠٠٣ ص ١٥٠.

جەنگی ئایینییە. چەندین بیرمەند و فەیلەسووفی ئەمریکی لە سەرچاوەکانی خۆیاندا ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردووەتەوە. «نیکسۆن» لە پەرتووکی (الفرصة السانحة) و «فۆکۆیاما» لە (نهاية التاريخ) و «سامۆیل هانتینگتۆن» لە (صراع الحضارات) و پەرتووکی (من نحن) ئەمە جگە لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەوانییەکانیان کە ڕاستیی ئەم بابەتانە پشتڕاست دەکەنەوە. ئەگەر بێتوو ئەم بابەتانە پێچەوانە بکرێتەوە سەرۆکی وڵاتێکی عەرەبی لە کاتی بڕیارێکی سەربازی، یاخود سیاسی لە ڕاگەیاندنەوە کە کۆمەڵێک زانایانی ئیسلامی لە نزیک بوون و کار و بڕیارەکانی پیرۆز بکەن، ئەو کات دەبێت هەڵوێستی ئەوانی تر چۆن بێت، ئەمە لە کاتێکدا چەندین دیمەنی پیرۆزکردنی پیاوانی ئایینی بە هاوشانی سەرۆکەکان دەبینرێت.

لە چوارچێوە گشتییەکەیدا جەنگی دژی تیرۆر دەرخەری ڕاستیی پلان و ستراتیژی ئەمەریکا و خۆرئاواییەکانە بەرانبەر بە جیهانی ئیسلامی و هەوڵی سەپاندنی هەژموونی سیاسی و ئابووری و سەربازییان بە سەر جیهانی ئیسلامیدا. لەم چوارچێوەیەدا «ڕوبرت دریفوس» دەڵێت: "پێویستە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دوور بکەوێتەوە لە سیاسەتی خۆسەپاندن و خۆفەرزکردن بە سەر وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست"[1] لە پاڵ ئەمانەدا هەزاران بەڵگەی تر لە بەردەستدان کە ڕاستیی دەمارگیری و پاڵنەری ئایینی لە جەنگی دژی تیرۆر پشتڕاست دەکاتەوە. هەر زوو ئەورووپییەکانی هاوپەیمانی ئەمەریکا ڕاستەوخۆ دانیان نا بە هەڵەی بەشداریکردنیان لە پڕۆژەی ئەمریکی و بەشداریکردنیان لە پاڵ ئەمریکییەکان لە جەنگی عێراق.

لە ڕاپۆرتێکی سیاسیی گۆڤاری (دیو اس فورین پولیس) پرسیار ئاڕاستەی سەد و شازدە شارەزای ئەمریکی و لە ناویشنیاندا وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا

---

(١) لعبة الشيطان روبرت دريفوس دار الثقافة الجديدة، ص ٣٠ وەرگیراوە لە پەرتووکی: و لتستبين سبيل المجرمين، ص ٤٥.

و دوو بەڕێوەبەری هەواڵگریی ئەمریکی، لەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو لە شیکارانی سیاسی لەبارەی جەنگی دژی عێراق، لە سەدا هەشتا و شەشی بەشداربووانی ئەو ڕاپرسییە پێیان وایە جەنگی عێراق هەڵەیەکی ستراتیژی بوو کە ئەمریکییەکان و هاوپەیمانەکانیان ئەنجامیان داوە. «بووش» و ستافەکەی تێگەیشتنێکی هەڵەیان هەبوو دەربارەی واقیعی عێراق،[1] «هینری کیسنجەر» یەکێک لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەمەریکا دەڵێت: "شکستی ئەمەریکا لە عێراق، واتە دۆڕان و شکستی شارستانیەتی خۆرئاوایی لە. دووسەد ساڵ پێشکەوتن و سەرکەوتن."

پرسیاری جدی لەوەدایە ئایا داگیرکاریی عێراق لەلایەن ئەمەریکاوە بە زیان شکایەوە بە سەر ئەمەریکادا یاخود نا؟ بە گەواهیی زۆرێک لە سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا و داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا، جەنگی ئەمەریکا لە عێراق هەڵەیەکی گەورەی ئەمریکی بوو جگە لە زیانێکی ئابووری و سەربازی، ناوبانگی ئەمەریکای لە سەرانسەری جیهان لەکەدار کرد، ئەمە جگە لەو خەرجییە زۆرەی ئەمەریکا لەو جەنگەدا خەرجی کرد. بە پێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی دەیلی تەلەگراف لە ١٦ ئازاری ٢٠١٣، ئاماژە بەوە دەکات، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە جەنگی عێراقدا نزیکەی ٨٠١ ملیار دۆلاری خەرج کردووە، لەو شەڕەدا گەر بێتوو لە پاڵ ئەو خەرجییانە سوودی سەر قەرزەکانی ئەمەریکا هەژمار بکرێت، ئەوا خەرجییەکانی ئەو جەنگە دەگاتە نزیکەی ٣ ترلیۆن دۆلار، ئەمە جگە لە کوژرانی چەندین هەزار سەربازی ئەمریکی و کەمئەندابوونی هەزارانی تر. هەروەها جگە لە کوژانی زیاتر لە دوو ملیۆن هاوڵاتیی عێراقی و داتەپینی ژێرخانی ئابووریی عێراق و دزران و لەناوچوونی هەزاران پارچە شوێنەواری عێراقی و وێرانبوونی شارەکان

---

(١) بڕوانە: ڕۆژنامەی الوطن ڕۆژی ٢٠٠٦/٧/٦ وەرگیراوە لە پەرتووکی: ولتستبين سبيل المجرمين د. محمد يسرى ابراهيم، ص ١٠٤.

و داتەپینی ئابووریی ئەو وڵاتە و دروستبوونی جەنگی تایفی و هاتنەکایەی دەسەڵاتێکی گەندەڵ کە لە ڕێیەوە هەزاران ملیار دۆلاری داهاتی عێراق برایە دەرەوە. ئەوروپییەکان لە هەموو لایەک زیاتر ئەو ڕاستییە دەزانن کە لە ڕووکەشدا ئەوەی ئەنجام درا تەنیا لابردنی «سەددام» بوو، ڕووداوەکانی دوای «سەددام» جۆرە تێگەیشتنێکی لای بەشێکی بەرچاو لە هاوڵاتییانی عێراق دروست کرد کە ئاواتەخوازی سەردەمی «سەددام» نەبوون، ئەمە جگە لەوەی هەنگاوی ئەمەریکا بە ئاڕاستەی داگیرکردنی عێراق سوودێکی بەرچاوی بە سیاسەت و ستراتیژی ئێرانی گەیاند و ئەمەریکەکان عێراقیان لە سەر سینییەکی زێڕ پێشکەشی ئێران کرد، بە شێوەیەک بەشێک لە شەقامەکانی عێراق بە ناوی خومەینی و خامەنەئییەوە ناو نراون.

هەموو ئەم هەوڵانەی ئەمەریکا و خۆرئاواییەکان بە مەبەستی جەنگی دژی تیرۆر بوو، ئیتر تۆمەتبارکردنی موسڵمانان بە تیرۆر بۆچی و لەپێناوی چی؟ لە بەرانبەر ئەم هەوڵانە بۆچوونی ژمارەیەکی دیار لە لێکۆڵەران و کەسانی خاوەن ویژدانی خۆرئاوایی تۆمار دەکەین کە بە جۆرێک لە واقعیەت و هەستی ویژانەوە ڕاستییەکان دەردەبڕن کە ڕاستی و ناڕاستیی تۆمەتبارکردنی موسڵمانان بە تیرۆر و خوێنڕێژی دەخەنە ڕوو، تاوەکوو ئەوەی ئێمە بە ویژدانەوە قسە بکەین. لەو ڕووەوە کە ئێمە لە یەک چاویلکەوە ناڕوانینە خۆرئاواییەکان، بەڵکوو لەبارەی هەڵوێستیان بەرانبەر موسڵمانان دەکرێن بە چوار بەشەوە:

**یەکەم:** سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا؛ ئەوانەی کە هەرەمی دەسەڵاتی خۆرئاوایان بە دەستەوەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان سیاسەتی ئێستای جیهانی لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا بە ڕێوە دەبەن، بەو جۆری دەیانەوێت بە ویستی خۆیان بەرمەبنای بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانیان مامەڵە لەگەڵ میللەتانی سەرانسەری جیهاندا بکەن. لە ڕاستیدا ئێمە کاتێک باس لە سیاسەتی دژێوی خۆرئاوایی و تاوانەکانیان دەرهەق بە خۆرهەڵاتی ئیسلامی دەکەین، مەبەستمان لێی ئەم

چینە دەستڕۆیشتوەی خۆرئاوایە.

**دووەم:** خەڵکانێکی شارەزا و عاقڵەمەند دەیانەوێت بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕووداوەکانی ڕابردوو و ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت وەک خۆی بخەنە ڕوو، بەڵام بە هۆی ڕاگەیاندن و دامەزراوە هەژموونداره‌کانی خۆرئاوا و سیناریۆ جۆراوجۆرەکانییەوە بە تەواوی زاڵ بووە بە سەر عەقڵ و قەڵەمیاندا لەبەر ئەمە ناتوانن وەک خۆی لە واقیع تێ بگەین و ڕاستییەکان بپێکن. لە کاتێکدا سیاسەتمەدارانی خۆرئاوایی سەرکەوتوو بوون لە دروستکردنی ڕایەکی بەرفراوان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە ئاڕاستەی بەرژەوەندی و سیاسەتەکانی خۆیان. بە دڵنیایی دروستکردنی ئەم ڕایە لای خەڵکانی خۆیان تەواو ئاسانترە بە تایبەتی لای خەڵکانێک کە بە جۆرێک لە جۆرەکان بە گرنگییەوە لە ئایین و بیروباوەڕی خۆیان دەڕوانن بێ ئەوەی پێویست بکات هان بدرێن دژی ئیسلام دەدوێن.

**سێیەم:** چینێکی ئەمریکییەکان و خۆرئاواییەکان ئەوەی مەبەستیانە تەنیا تام و چێژی ژیان و خۆشگوزەرانییەکانی ژیانە، ئەوەی بە لایانەوە گرنگە تەنیا چێژ و خۆشییە دونیاییەکانە نەوەک شتێکی تر. بە هیچ جۆرێک بە گرنگییەوە لە ئیسلام و هیچ ئایینێکی تر ناڕوانن، تەنیا وەک بابەتێکی لاوەکی لە هەواڵ و ڕووداوەکانی جیهان دەڕوانن. کاتێکیش دووچاری ڕووبەڕووبوونەوەیەکی هزری دەبنەوە، ڕاستەوخۆ بۆچوونیان دەگۆڕێت بەو پێیەی هەڵگری هیچ هزر و ئایدیۆلۆژیا و بیروباوەڕێکی تۆکمە نین، دەتوانین بڵێین بەشێکی زۆر لە خۆرئاواییەکان بەم شێوەیەن، دوور و نزیک کێشمەکێشم و بەریەککەوتنی شارستانیەتەکان بە لایانەوە گرنگ نییە. بەشێکی بەرچاوی خۆرئاواییەکان لەم جۆرە بێ ئاگاییەدا دەژین، ئەمەش پلانی بە مەبەستی سیاسییە خۆرئاواییەکانە تاوەکوو ئەوەی ئەم بەشەی نەتەوەکەیان بەو شێوەیە بێت و لە کۆتاییدا بە هەر دۆخێکدا ویستیان ئاڕاستەیان بکەن. لە ڕاستیدا ئەم

چینەی خۆرئاوا کە ژمارەیەکی بەرچاوی هاولاتییان خۆرئاوا پێک دەهێنن، ماددەیەکی خامی باشن لە بەردەم بانگەوازی ئیسلامی و دەبێت بە شێوەیەکی نەرمونیان بانگەواز بکرێن، بە پێچەوانەی خۆرئاواییە ئایینییە ڕادیکاڵەکانەوە ئاراستەکردنیان هەنگاوێکی دژوار نییە.

**چوارەم:** چینێک لە خۆرئاواییەکان کە نەکەوتوونەتە ژێر سیاسەت و هەژموون و توندڕەویی ئایینیی سەرکردە خۆرئاواییەکان و لە چوارچێوەی هەژموونی خۆرئاواییدا توانیویانە عەقڵ و قەڵەم و بیرکردنەوەیان بە سەلامەتی بهێڵنەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی ئەکادیمی دوور لە دەمارگیری ئایینی و نەتەوەییی لێکۆڵینەوەی هزری و بیروباوەڕی ئەوانی تر دەکەن. لە ڕاستیدا هەر چەند ئەم جۆرە بیرمەندانە ژمارەیان تەواو کەمە، بەڵام دەتوانین بڵێین لە دوای ڕووداوەکانی جەنگی جیهانیی دووەمەوە، ژمارەی ئەم جۆرە کەسایەتی و لێکۆڵەرانە بە شێوەیەکی بەرچاو ڕوو لە هەڵکشانە. ژمارەیەکی زۆریان چالاکییەکانیان بە ئاراستەیەکی واقیعی چڕ کردووەتەوە، ئەم بیرمەندانە لە ڕێی واقیعبینییانەوە خزمەتێکی بەرچاو بە باسوخواسی ئیسلام دەکەن، هەر چەند ئەوان لە خستنەڕووی بۆچوونەکانیان تەنیا خستنەڕووی ڕاستەقینەیە و دوور و نزیک مەبەستیان بەرگریکردن نییە لە ئیسلام، بەڵام لە کۆتاییدا ڕاستگۆیی و واقیعبینیی ئەوان بە بەرژەوەندیی ئیسلام و موسڵمانان کۆتایی دێت. بەو پێیەی لە هەر جێگەیەکی ئەم جیهانەدا ڕاستییەکان وەک خۆیان بخرێتە ڕوو، بە دڵنیایی بە سوود و بەرژەوەندیی موسڵمانان کۆتایی دێت. لە ڕاستیدا کاتێک ئێمە باسی خۆرئاواییەکان دەکەین، دوور و نزیک مەبەستمان پێ لەم چینە نییە، بەڵکوو مەبەستمان دەستەی یەکەمە بە تایبەتی دواتریش دەستەی دووەم.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێک لە گەواهیی دانپێدانانی ڕاستەقینەی خۆرئاواییەکان بخەینە ڕوو کە بەڵگەی دروستن لەبارەی بەرائەتی ئیسلام

و لە تیرۆر و توندڕەوی و توندوتیژی بیرمەندی ئینگلیزی «توماس ئارنۆلد» (١٨٦٤-١٩٢٠) دەڵێت: "ئەو هزرەی کە لە خۆرئاوا بڵاو بووەتەوە کە گوایە ئیسلام لە ڕێگەی شمشێرەوە بڵاو بووەتەوە. موسڵمانان لە ژێر زەبری شمێشردا ئەم ئایینەیان قەبووڵ کردووە، دوورە لە ڕاستییەوە. عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامی پەیوەستە بە لێبوردەیی و ئازادیی ژیانی ئایینیی تەواوی ئایینەکان بەبێ جیاوازی. بە درێژاییی مێژووی دەسەڵاتی ئیسلام شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر لە خۆشی و ئازادییەکی بێوێنەدا ژیاون، تەواوی مافەکانیان پارێزراو بووە. ئەمە لە کاتێکدایە نموونەیەکی لەم شێوەیەمان لە ئەورووپا لە بەردەستدا نییە، هەتاوەکوو ئەم دواییانە نەبێت."

بابەتی بەزۆر موسڵمانکردنی خەڵک و چەسپاندنی ئیسلام بە زەبری هێز لە چوارچێوەی دەقەکانی ئیسلامدا بە تەواوی قەدەغە کراوە، دەقەکانی قورئان ئەم بابەتەیان حەرام کردووە، هاوکات بوونی ئەم ژمارە زۆرەی دەستە و تاقم و ڕێبازە مەسیحییە جیاوازەکان بە درێژاییی مێژوو لە ژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لە سەر ئەو لێبوردەیی و خۆشگوزەرانییەی کە مەسیحییەکان تێیدا ژیاون.»[1] پاشان ناوبراو لە شوێنێکی تردا زیاتر تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەڵێت: "بە درێژاییی مێژوو هیچ هەوڵێکمان نەبینووە کە لەلایەن موسڵمانانەوە درابێت لەپێناو ناچارکردنی خەڵکی لە سەر وەرگرتن و قەبووڵکردنی ئیسلام یاخود دروستکردنی دامەزراوەیەک لەپێناو ڕیشەکێشکردنی ئایینی مەسیحی و ئایینەکانی تر، خۆ ئەگەر هەر یەکێک لە خەلیفە موسڵمانەکان هەر کام لەو دووڕێگەیان هەڵبژاردایە، ئەوا بە دڵنیایی شتێک نەدەما ناوی ئایینی مەسیحی بێت لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی، وەک

---

(١) بڕوانە: پەرتووکی ناوبراو بە ناوی الدعوة الی الاسلام . ت: حسن ابراهیم حسن، عبد المجید عابدین، اسماعیل النحراوی مکتبة النهضة المصریة القاهرة ١٩٧١، ص ٦٢.

ئەو ڕێگە ئاسانەی کە هەر یەک لە «فرنناند ئیزا بیلا» گرتیانە بەر لەپێناو ڕیشەکێشکردنی ئیسلام لە ئیسپانیا یان ئەو هەوڵانەی کە «لویسی چوارەم» گرتییە بەر دژی ڕێبازی پرۆتستانتیی مەسیحی لە فەرەنسا یان ئەوەی کە جوولەکەکان دوور خرانەوە لە ئینگلتەرا بۆ ماوەی سێ سەد و پەنجا ساڵ.

مانەوەی ئەو ژمارە زۆرەی کڵێساکان لە جیهانی ئیسلامیدا هەتاوەکوو ئێستا بەڵگەیەکی بێگومان و یەکلاکەرەوەیە لە سەر لێبوردەیی ئیسلام و سنگفراوانیی دەسەڵاتە ئیسلامییە یەک لە دوای یەکەکانی ناوچەکە"[1] هەر لە چوارچێوەی تیشک خستنەسەر ئەم بابەتە، لێکۆڵیار و نووسەری گەورەی ئەمریکی «ویل دیوارنت» (١٨٨٥- ١٩٨١ز) لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا (قصة الحضارة) دەڵێت: "لە ڕاستیدا تەواوی مەسیحی و جوولەکە و زەردەشتی و سابیئەکان لە سەردەمی خیلافەتی ئومەییەکاندا لە ئەندازەیەکی فراوانی ئازادی و لێبوردەییدا ژیانیان بە سەر بردووە کە لەم ڕۆژگارەدا بە هیچ شێوەیەک وێنەی نییە، بە ڕاستی تەواوی ئەو ئایینانە ئازاد بوون لە بەڕێوەبردنی سرووتە ئایینییەکانی خۆیان و هێشتنەوە و پارێزگاریکردن لە کڵێسا و پەرستگاکانیان، تەنیا ئەوە نەبێت کە باجی یەک دینار تا چوار دینار بە سەریاندا جێبەجێ کرابوو، ئەم باجەیش ڕەهبان و ئافرەت و منداڵ و بەندە و پیروپەکەوتە و نەخۆش و کەمەئەندام و هەژارەکانی لێ هەڵاوێر کرابوو." پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "ئەو باجە تەنیا لە سەر خەڵکانی بە توانا و دامەزراو لە ڕووی داراییەوە وەردەگیرا، تاوەکوو ئەوەی گیان و ئایین و موڵک وماڵیان بپارێزرێت بەو پێیەی موسڵمانان سەرباز بوون و بە پێچەوانەوە ئەوان لە تەواوی جۆرەکانی خزمەتی سەربازی بەخشرابوون. ئەوان لە بەرانبەر ئەم پاراستن و خزمەتگوزارییەدا تەنیا بڕێکی کەم پارە لە خەڵکانی دەوڵەمەند و خاوەن توانا وەردەگیرا." پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "تەواوی ئایینەکان لە ماوەی خەلافەتی ئیسلامیدا بەخۆشی لە ژێر سایەی گەورەکانی خۆیاندا دەژیان،

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٤٧ بۆ ١٤٨.

بە پێی یاسا و داوەرەکانی خۆیان حوکم دەکران...» دریژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: «مێژوونووسەکان باس لەوە دەکەن کە تەنیا لە سەردەمی مەئموونددا ١١ هەزار کڵێسا هەبووە، ئەمە جگە لە چەندین هەیکەل و مەعبەدی جوولەکە و ئایینەکانی تر، زیاد لەمە حاجییە مەسیحییەکان لە سەرانسەری دونیاوە دەهاتن بۆ سەردانیکردنی شوێنە پیرۆزەکانیان لە فەلەستین، موسڵمانەکان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە پارێزگارییان لەو زیارەتکارانە دەکرد و ئاساییشیان دەپاراستن، تاوەکوو وای لێ هاتبوو والیی ئەنتاکییە لە سەدەی نۆیەمدا چەندین پاسەوانی تایبەتی دانابوو لەپێناوی پارێزگاریکردنی ژیانی مەسیحییە سەردانیکەرەکان بە هۆی جیاوازیی مەزهەبی و بیروباوەڕی نێوانیان، موسڵمانان ڕێگرییان دەکرد لە کوشتاری نێوانیان و زیاد لەمە دەسەڵاتی ناوچەکە پاسەوانیان لە کڵێساکان دانابوو تاوەکوو مەسیحییە جیاوازەکان لە ڕووی بیروباوەڕەوە هێرش نەکەنە سەر یەکتری."[١]

هەر وەک پشتڕاستکردنەوەی ئەم ڕاستییە، «ئیدوارد برودی» خاوەنی پەرتووکی (تاریخ حضارات العالم القرون الوسطی ) دەڵێت: "ئەوەی کە پێویستە دەری ببڕین بە ئاشکرا ئەوەیە کە بگوترێت بە ڕاستی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بە هیچ جۆرێک دەمارگیرییان بەرانبەر مەسیحییەکان نەبوو، بەڵام سەردەمانێک بوو لە دیوانی تەفتیشی مەسیحییەکان خەڵکی بە هۆی بیروباوەڕی جیاوازیانەوە دەکوژران و لە ناو دەبران و ڕووبەڕووی ترس و تۆقاندن دەبوونەوە، سەردەمانێک موسڵمانەکان و جوولەکەکان بە بێ بەزەییانە لە ئیسپانیا دەکوژران و وەدەر دەنران."[٢]

---

(١)بڕوانە: قصة الحضارة ویل دیورانت، ترجمە محمد بدران، دار الجیل بیروت ج ١٣، ص ١٣٠-١٣١.

(٢)پەراوێزی لاپەڕەی پێشوو بڕوانە: پەرتووکی بەناوبانگەکەی بە ناویڵ ( تاریخ الحظارات العام) وەرگێڕانی: فرید داغر» یوسف أسعد داغر، منشورات عویدات بیروت ج ٣ ص٥٨٩-٥٩٠.

هەر لەم چوارچێوەیەدا وەک پشتڕاستکردنەوەی ئەم ڕاستییانە، خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانیی بەناوبانگ «زیگرید نولدکە» لە پەرتووکەکەیدا (شمس العرب تسطع علی الغرب) دەڵێت: "(لا اکراه فی الدین) ئەمە فەرمانی قورئانە، لە سەر ئەم بنەمایە موسڵمانهکان هیچ کات بە زۆر ئایین و بیروباوەڕی خۆیان زاڵ نەکردووە و خەڵکیان ناچار نەکردووە بێنە ناو ئیسلامەوە. تەواوی مەسیحییەکان و جوولەکە و زەردەشتییەکان و ئایینەکانی تر پێش ئیسلام، دووچاری چەوساندنەوە و توندوتیژی هاتبوون، بەڵام لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا بە تەواوی ڕێگەیان پێ درابوو بە بەرجەستەکردنی سروستە ئایینیەکانی خۆیان، بە شێوەیەکی ئازادانە و شەرەفمەندانە تەواوی ڕەهبان و پیاوانی کڵێسا بە ئازادانە ئەرکەکانی خۆیان بەرجەست دەکرد و بە شێوەیەکی دروست پارێزگاری لە کڵێسا و پەرستگاکانیان دەکرا، ئەم جۆرە مامەڵەیە لوتکەی لێبوردەیی و قەبووڵکردنی ئەوانی تر نییە؟ ئەو جۆرە لە لێبوردەیی لە چ قۆناغێکی تری مێژوویدا بووە؟

هەر وەک پشتڕاتکردنەوەی ئەم بابەتە، یەکێک لە بەتریکە پیرۆزەکانی سەدەی نۆیەم بۆ یەکێک لە بەتریکەکانی برای لە قوستەنتینە دەنووسێت "ئەم موسڵمانانەی ئێمە لایان دەژین، بە هیچ شێوەیەک زوڵم و ستەممان لێ ناکەن و بە خراپە مامەڵەمان لەگەڵ ناکەن. ئەوان بەهۆی دادپەروەرییانەوە تەواو جیاوازن لە خەڵکانی تر."[1] ئەوەی خستنمانە ڕوو، ڕووی ڕاستی ئایینی ئێمەیە. تەواوی موسڵمانان هەر بەم شێوەیە پەروەردە کراون، زوڵم و ستەم و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ئەوانی تر بە تەواوی دوورە لە خوو و ڕەشت و ڕەسەنایەتیی موسڵمانان. هەر کات دەسەڵات و بەڕێوەبردن لای موسڵمانان بوویێت جگە لە دادپەروەری و یەکسانی، شتێکی تریان بەرجەستە نەکردووە. ئەوە موسڵمانان

---

(١) بڕوانە: (شمس العرب تسطع الغرب)وەرگێڕانی فاروق بیضون، و کمال الدسوقي، دار الجیل بیروت لبنان الطبعة الثامنة ١٩٩٣، ص ٣٦٤.

بوون لە ڕێی شمێشر و زەبر و زۆرەوە هەوڵی لەناوبردنی ئایینەکەیان دراوە، وەک ئەوەی «تۆماس ئارنۆڵد» ئاماژەی پێ دەکات.

لە سەر ئاستی ناوخۆیی، ئەوەی جێی داخە خوێنەرانی کورد تەواو بێئاگان لە مێژووی ئیسلام، بەڵکوو لەوەیش مەترسیدارتر لە چاویلکەی خۆرئاواوە دەڕواننە مێژووی موسڵمانان و لە دیدی ئەوانەوە ئیسلامیان ناسیووە. ئەوەیش جێگەی مەترسییە کاتێک مرۆڤ لە دید و چاویلکەی دوژمنەوە ئایین و کەلتووری خۆی بناسێت. وەک ئەوەی بیرمەندی فەڕەنسی «دیباسکیە» ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: "هیچ کات خۆرئاوا بە دروستی ئیسلامی نەناسیووە و ناشتوانێت بیناسێت. هەر لەو کاتەوەی ئیسلام دەرکەوتووە، خۆرئاواییەکان ڕاستەوخۆ کەوتنە دژایەتیکردنی و چەندین بابەتی ناڕاستیان پێچایە ئیسلامەوە. هەموو ئەمانە لەپێناو لاوازکردنی ئیسلام، تاوکوو ئەوەی هەر چۆن بێت شەرعییەت بدەن بە هەوڵەکانیان لە دژایەتیکردنی ئیسلام و کوشتن و لەناوبردنی موسڵمانان دوژمنایەتیی بەردەوامی ئەوان بووە هۆکاری ئەوەی کە لە هزر و بیرکردنەوەی تاکی خۆرئاواییدا چەندین دیدی دوژمنکارانە بچەسپێت."(١)

پاڵنەری سەرەکیی ناساندنی ئیسلام وەک ئایینی بەرهەمهێنی تیرۆر و موسڵمانان وەک تیرۆریست بە مەبەستی لەناوبردن و لێدانی ئیسلامە، بۆیە سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا هەوڵ دەدەن لە چەندین ڕێگە و بە بەکارهێنانی چەندین کەرەستەی جیاواز ناو و ناتۆرەی ناشیرین و دزێو بخەنە دوای موسڵمانان.

---

(١) بڕوانە: گۆڤاری الأمان اللبنانية ژمارە ٥٧ سالی دووەم ئازاری ١٩٨٠

# مافەکانی ئافرەت وەک کەرەستەیەک بۆ لەکەدارکردنی موسڵمانان

یەکێکی تر لەو بابەتانەی کە وەک کەرەستەیەکی ناشرینکردنی موسڵمانان بەکاردێت ئەوەیە کە لە سەردەمی نوێدا بە مافەکانی ئافرەت ناو دەبرێت. لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا، نووسەری فەڕەنسی «میسو لامی» لە بابەتێکی ڕۆژنامەی (العالمین)ی فەڕەنسی بە ناوی «ڕێگەی دروست بۆ لەناوبردنی ئیسلام» دەنووسێت: "لە ڕاستیدا بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام بە هێزی چەک هیچ لە تواناکانی کەم ناکاتەوە، بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆکاری زیاتر و زیاتر بۆ بڵاوبوونەوەی، بەڵکوو پێویستە چەند ڕێگەیەکی تر لەپێناوی ئەم ئامانجەدا بگرینە بەر.» ئەم نووسەرە دوای ئەوەی چەندین ڕێگەی جۆراوجۆر لەپێناوی ئەم مەبەستەدا دەخاتە ڕوو، پاشان دەنووسێت: «پێویستە ئافرەتان وەک چەکێک بۆ لەناوبردنی ئیسلام بە کار بهێنرێن، ئەوەیش ئامانجی گەورەی ئێمەیە. سەرکەوتنێکی گەورە تۆمار دەکەین، گەر بێتوو ئافرەتی موسڵمان بگەیەنینە ئەو ئاستەی، خۆی هەڵسێت بە لەناوبردنی ئیسلام.» هەر لە درێژەی ئەم بابەتە «مستەر گلادستۆنی» ئینگلیزی دەڵێت: "یەکێک لە کەرەستەکانی لەناوبردنی دەسەڵاتی ئیسلامی و لاوازکردنی موسڵمانان، داڕنینی ئافرەتانە لە باڵاپۆشی. لە بریی ئەوەی ئافرەتان بە حیجابە خۆیان داپۆشن، پێویستە ئەو حیجابە قورئانی پێ داپۆشرێت. پێویست کەرەستەکانی سەرقاڵکردنی ئوممەتی ئیسلام ئافرەت و مەی و مادده هۆشبەرەکان و سێکس بە نێو جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بکەینەوە."[1]

---

(١) مكانة المرأة فی الاسلام، دكتور محمد عمارة، دار السلام بمصر سنة ٢٠١٠. ص١٢.

لە ڕاستیدا خۆرئاواییەکان زیرەک بوون لەوەی لە یەک دەلاقەوە نەهاتنە نێو جیهانی ئیسلامییەوە، بەڵکوو لە چەند دەلاقەیەکی جیاوازەوە خۆیان خزاندوەتە نێو جیهانی ئیسلامی. ئەوان بە بەردەوامی لە هەوڵی بیرکردنەوە و دۆزینەوەی ڕێگای نوێدان لەپێناوی بەرجەستەکردنی ئامانج و پیلانەکانیان و سەپاندنی هەژموون و دەسەڵاتی خۆیان بە سەر تەواوی جیهانی ئیسلامیدا. خۆرئاواییەکان باش لەوە تێ گەیشتوون کە تاکە ئایینێک ببێتە ڕێگر لە بەردەم دروستبوونی زوڵم و زۆر و ستەم و نادادی و چەوساندنەوەی چینەکان، تەنیا ئایینی ئیسلامە. ئایینێک دەیەوێت لوتکەی دەسەڵات وەربگرێت و ژیانی مرۆڤەکان بە تەواوی بگۆڕێت. هەنگاوێکی لەم شێوەیە مایەی ڕەزامەندی و ویستی خۆرئاواییەکان نییە، ئەوان دەیانەوێت هەژموونی خۆیان بە سەر تەواوی زەویدا بسەپێنن، بەڵام لووتیان دەتەقێت بە ڕووی ئایینێکدا کە سنوور بۆ هەژموونی و ئیرادەیان دادەنێت و پێچەوانەی ئەوان بە چاوی ڕێزەوە تا ئەوپەڕی لوتکە لە تەواوی مرۆڤەکان دەڕوانێت، بە بێ ڕەچاوکردنی ڕەش و سپییان. ئەمە لە کاتێکدا ئەوان هەتاوەکوو سەدەی نۆزدە، کۆیلەکانیان وەکوو مرۆڤ نەدەبینی، چۆن ڕازی دەبن بە ئایینێک کە باس لە یەکسانیی تەواوی بوونەوەرەکان دەکات لە ژن و پیاو و سەرۆک و سەرکردە و خەڵکانی ئاسایی.

ئیسلام کە لێوانلێوە لە سۆز و بەزەیی، کوشتنی مرۆڤێک یەکسان دەکات بە تاوانی کوشتنی تەواوی دانیشتوانی سەر زەوی. بێگومان سیاسییە خۆرئاواییەکان ئەم جۆرە لە ئایینەیان پێ قەبووڵ نییە و زیاد لەمەش هەمیشە و هەموو کات هەوڵ دەدەن بە توندترین شێوەی دژایەتیی بکەن، بە جۆرێک لە سەرانسەری دونیادا هەزاران موسڵمان دەکوژرێن و بە چەندین شێوە و ڕێگەی جۆراوجۆر لە ناو دەبرێن. ئەمەریکا و خۆرئاواییەکان لە مێژووی نوێدا، چەندین وڵاتی خۆرهەڵاتیان داگیر کرد و چەندین میللەتیان کردە کۆیلە و ژێردەستەی خۆیان و بە شێوەیەکی مەترسیدار چەندین جەنگی خوێناوییان

تێدا هەڵگیرساندن. زیاد لە جەنگی سەربازی و جەنگی ساردی ناڕاستەوخۆی خۆرئاواییەکان بە کەرەستەی جیاواز لە دژی موسڵمانان، تەواو مەترسیدارتر و کاریگەرترە لە تەواوی جەنگەکانی تر. کاریگەریترینیان لێدانە لە بنەما کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتانی ئیسلامی لە ڕێگەی تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەی خێزانەوە.

ئەمە لە کاتێکدا دۆخی ئافرەتان و خێزان لای خۆیان تا ئەوپەڕی سنوور لە دۆخێکی خراپدا بوو، جگە لە کاڵایەکی بازرگانی و کەرەستەیەکی سێکسیی تێکردنی ئارەزووی پیاوان شتێکی تر نەبوون. لە زۆربەی ناوەندەکانی خۆرئاوادا کاری قورسیان پێ دەکرا و وەک سەرچاوەی دارایی لێیان دەڕوانرا، وەک «مارکس» دەڵێت: "پێویستە تەواوی ئافرەتان کار بکەن"، بۆیە کاتێک ویستیان ئەو گۆڕانکارییەی خۆیان دەیانەوێت لەبارەی ئافرەتەوە بیخولقێنن، نەیان توانی هەنگاوەکانیان بە ناوی ئازادیی ئافرەتانەوە بنێن بەو پێیەی خۆیان ئەزموونێکی باشیان لەو بارەیەوە نەبوو، ئافرەتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی لە لوتکەی ڕێز و شکۆدا دەژیان وەک ئێستا کاروباری دەرەوەیان ئەنجام نەدەدا. وەک زۆرێک لە بیرمەندە خۆرئاواییەکان خۆیان ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردووەتەوە، ئافرەتانی جیهانی ئیسلام بەو پەڕی شکۆوە لە چوارچێوەی خێزانەکانیاندا دەژیان، ئەوان کەرەستەی گەیشتن بە بەهەشتن بە لای منداڵەکانیان و لیباسی حەیا و حورمەتی پیاوەکانیان. خۆرئاواییەکان توانییان گورزێکی کوشندە لە دامەزراوەی خێزانی ئیسلامی بووەشێنن لە ڕێی ورووژاندنی بابەتی ئازادی و ئازادیی جلوبەرگی ئافرەتان و دەرخستنی جەستە و لەشولاریان، دوای هەوڵێکی زۆر لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و چەندین کەرەستەی جۆراوجۆری تر، توانییان ئافرەتانی موسڵمان دابڕنن لە بەرگی باڵاپۆشی و حەیا و حورمەت و هیچ بەهایەکی بۆ نەهێڵنەوە. بەو پێیەی ئافرەتان لە نێو دامەزراوەی خێزاندا دەورێکی کاریگەر و بەرچاوی هەیە و بەرپرسیارێتیی پەروەردەکردنی نەوەیەک لە سەر شانیەتی،

بۆیە بە لەدەستدان و ترازانیان زیانێکی گەورەمان بەر دەکەوێت، لەدەستدانی ئافرەت واتای لەدەستدانی تەواوی بەها و پیرۆزییەکانی کۆمەڵگە و داتەپینی بنەمای گشتیی کۆمەڵگە.

دەگێڕنەوە دوای کودەتای «ئەتاتورک» قەیسەری ئەڵمانیا سەردانی ئەتاتورکی کرد، تورکە عالەمانییەکان کۆمەڵێک ئافرەتیان ئامادە کرد تاوەکوو ئەوەی بە جلوبەرگی خۆرئاواییەوە پێشوازیی قەیسەر بکەن. پێیان وا بوو قەیسەر بەم دۆخە تەواو خۆشحاڵ دەبێت، بە پێچەوانەوە کاتێک قەیسەر چاوی بە دۆخەکە کەوت نیگەران بوو، بە جۆرێک لە نیگەرانییەوە بە سەرۆک وەزیرانی تورکیای گوت: "پێتان وایە من خۆشحاڵ دەبم، کاتێک ئافرەتانی ئێوەی بەم شێوەیە دەبینم... لە ڕاستیدا ئێوە گەلێکن هیچ ڕێزێکتان نییە لای میللەتانی تر، ئەو ڕێزەی هەتانە تەنیا بە ئیسلامەوەیە. ئێوەی موسڵمانان ژمارەتان چەندین ملیۆن کەسە، ئەگەر بێتوو ئافرەتانی خۆیان بەم شێوەیە ڕووت بکەنەوە، نیشانی بدەن بە دڵنیایی گاڵتەتان بە شوناس و کەلتووری خۆتان کردووە. ئەو ئیسلامەی کە خۆتانتان پێدا هەڵواسیووە، بەرەو کاڵبوونەوە و لەناوچوون دەچێت تکاتان لێ دەکەم کاری وا مەکەن، بە پێچەوانەوە پەشیمان دەبنەوە لە هەنگاوەکانتان. شەرەف و ئابڕوو لای ئێوەی موسڵمان بابەتێکی پیرۆز و قەشەنگە، ئیتر بۆچی خۆتانی لێ دەدزنەوە."[١]

کە وایە سەیر نییە کاتێک خۆرئاواییەکان بە چاوێکی بێ نرخییەوە لە خەڵکانی ئێمە بڕوانن و گاڵتەیشمان پێ دەکەن ئەم بابەتە دەرهاویشتەی خراپی بە دوای خۆیدا هێنا، یەکێک لەو دەرئەنجامە نەرێنی و کەمبوونەوەی ڕێژەی هاوسەرگیری وەک دەبینین لە ئێستادا بابەتی هاوسەرگیری بە شێوەیەکی مەترسیدار ڕووی لە کەمبوونەوە کردووە، ئەوانەیش کە هاوسەرگیرییان کردووە

---

(١) مسألة السفور والحجاب عبد الودود شلبي، هدية مجلة الأزهر١٤٠٥هـ ص ٣٢.

لە دۆخێکی باشدا ژیان ناگوزەرێنن. مەترسیی گەورە لە سەر دامەزراوەی خێزانی موسڵمانان لە ئارادایە لە نموونەی خیانەتی هاوسەرگیری، لێدان، سوکایەتیکردن، ڕازی نەکردنی یەکتری و دابینەکردنی بژێویی پیاوی خۆرهەڵاتی ئیسلامی. کاتێک دەبینن ئافرەتان لە خۆرئاوا کار دەکەن و داهاتی خۆیان هەیە، بەخێوکردنیان ئەرکی سەرشانی پیاوەکانی نییە، ئیتر پیاوان هەست بە ستەملێکراویی خۆیان دەکەن، دۆخی ناتەندروستی خێزانی خۆرئاوا جۆرێک لە پشێویی و نادڵنیایی لای خێزانەکانی ئێمە دروست کردووە. لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتانی موسڵمان لە ناویشیاندا ئافرەتانی کورد، پێویستە باش ئەو ڕاستییە بزانن کە بابەتی مافی ئافرەتان و بەرگری لە مافەکانیان جگە لە چاولێکەرییەکی کوێرانەی بێ ئەرزشی خۆرئاوا زیاتر شتێکی تر نییە، ئەوەی ئەوان داوای دەکەن، تەنیا بەرژەوەندی و بەرگریکردنە لە پیاوان و دوور و نزیک پەیوەندیی بە مافی ئافرەتانەوە نییە.

ئەوەی ئەوان دەیانەوێت ڕووتکردنەوەی ئافرەتانە بە ناوی ئازادی و داڕنینیانە لە تەواوی بەها مرۆییەکان. ئەم جۆرە لە بیرکردنەوە و ئاراستەکردن لە بنەڕەتدا ئاراستەکردنێکی زایۆنییە، وەک لە پرۆتۆکۆلاتی عەقڵمەندانی جوولەکەدا هاتوە دەڵێت: "پێویستە ئافرەتان بکەینە گەورەترین کەرەستە لەپێناو دەستخستنی ئامانجەکانمان."

دەبینین لە سەردەمی نوێدا ئافرەتان بە جۆرێک لە جۆرەکان دەبنەوە کۆیلە و وەک کۆیلەی سەدەکانی ناوەڕاست. دەبینین زۆرێکیان لەبەر دۆخی خراپیی دارایی و کەمدەرامەتی دەچنەوە ژێر باڵی پیاو، تاوەکوو وای لێ دێت بە تەنیا یەک پیاو دەبێتە سەرپەرشتیی کار و ئاگاداری زیاتر لە پەنجا ئافرەت و کۆکردنەوەیان لە شێوەی دەستە و باند بە مەبەستی بازرگانیکردن. هەر لە چوارچێوەی ئەم پلانەدا، لە سەروبەندی داگیرکردنی میسر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە پەرتووکیک بە ناوی (المرأة فی الشرق) نووسرا، تێیدا

بانگەشەی ئازادیی ئافرەتان و لەناوبردنی باڵاپۆشی و تێکەڵاوکردنی ژن و پیاو دەکات، ئەم پەرتووکە لە سەردەمی خۆیدا هەرایەکی گەورەی نایەوە.

قۆناغی دواتر پێ بە پێی ئەم پەرتووکە «قاسم ئەمین»ی میسری، لە ساڵی ١٨٩٩ پەرتووکی (تحرير المرأة)ی نووسی، بە هەمان ڕیتمی شێوازی پەرتووکی پێشوو، دیسان ئەم پەرتووکەی «قاسم ئەمین» لە سەردەمی خۆیدا دەنگدانەوەی فراوانی بە دوای خۆیدا هێنا و بووە مایەی خۆشحاڵیی خۆرئاواییەکان و چەندین بەشی ئەم پەرتووکە وەرگێڕرانە سەر زمانە جیاوازەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی و بە هەزاران دانەی لێ چاپ و بڵاو کرایەوە، لە سەر ئاستی ڕاگەیاندنی خوێنراو و بیستراوی ئەو سەردەمە گرنگییەی بەرچاوی پێ درا.[1]

ئیمپریالیستە خۆرئاواییەکان لە سەرووی هەموویانەوە ئیمپریالیستی ئینگلیزی، بە گەرمی هاوکاری و پشتیوانی هەر کەس دەبوون کە بانگەشە بە ناو ئازادیی ئافرەتان و وەلانانی باڵاپۆشی بکاتەوە. هەر لەو چوارچێوەیەدا، لە دوای ساڵی ١٩١٩ «هودا شەعراوی» کچی «موحەمەد پاشا»ی بەکرێگیراوی داگیرکاری ئینگلیز، لە دژی باڵاپۆشیی ئافرەتان خۆپیشاندانێکی ئافرەتانەی ساز کرد. لەو خۆپیشاندانەدا ژمارەیەکی زۆر جلوبەرگی بالاپۆشییان لە مەیدانی ئیسماعلییە و مەیدانی تەحریری ئێستا سووتاند.[2] دواتر لە ساڵی ١٩٢٣ یەکێتیی ئافرەتانی میسریان دروست کرد، «هودا شەعراوی» کرایە سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە و لەلایەن خۆرئاواییەکانەوە هاوکاریی ماددی و مەعنەوییان پێشکەش کرا. دکتۆرە «ڕیدی» سەرۆکی یەکێتیی نێودەوڵەتی سەردانیکردن و لە نزیکەوە کار و چالاکییەکانیان بە سەر کردەوە، دواتر ساڵی ١٩٤٥ بە هاوکاریی ڕێکخراوە خۆرئاواییەکان، پارتی ئافرەتانیان بۆ دروست کردن. بەم شێوەیە لە ژێر ناوی

---

(١) بڕوانە: الحركات النسائية في الشرق وصلتها بالاستعمار والصهيونية العالمية محمد فهمي عبد الوهاب دار الاعتصام ص ١٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئازادی و ڕزگاربوونی ئافرەتان دەست کرا بە ڕووتکردنەوەی ئافرەتان لە میسر و هەندێک وڵاتانی تری ئیسلامیی ناوچەکە.

لە ڕاستییدا پلانی ئەمریکییەکان و خۆرئاواییەکان بە ئاراستەی هەڵوەشاندنی جیهانی ئیسلامی، لە بنەڕەتدا پلانێکی جوولەکەی زایۆنییە. جوولەکەکان بە زیرەکی و تواناییان سەرکەوتوو بوون لە کۆنترۆڵکردنی سەنتەری بڕیاری زۆرێک لە وڵاتانی خۆرئاوایی و لە سەروو هەموویانەوە ئەمەریکا. جوولەکەکان لەمێژەوە بەردەوامن لە دارشتنی پلانەکانیان، خۆشبەختانە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێک لە پلانە شەیتانییەکانیان لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی ئاشکرا بوون، لە ژێر ناوی پرۆتۆکۆلاتی عەقڵمەندانی جوولەکە، تێیدا تیشک دەخەنە سەر چەندین پلانی دۆزەخی لەپێناو داگیرکردن و دەستگرتن بە سەر تەواوی جیهاندا. لەوانە لە پرۆتۆکۆلی یەکەمدا هاتووە: "دەبێت هەوڵ بدەین خەڵکانی گەلانی تر بێئاگا و بێهۆش بن، دۆخێک بخوڵقێنین لە ڕێگەی مەی و بڵاوکردنەوەی ئارەزووەکانەوە میللەتانی تر بێئاگا بکەین. هاوکارانمان تەواو پشتیوانمان بوون لەم بابەتەدا، هەمیشە هاوکارانمان هەوڵیان داوە ئافرەتانی سفوور و بەدڕەوشت بەکار بهێنین لەپێناوی لەخشتەبردنی گەلانی تر."

لە ڕاستیدا بوارخۆشکردن بۆ ئەوەی پێی دەگوترێت ئازادیی سێکسی و جەستەیی، لە بنەڕەتدا مەبەست پێی ئازادی نییە هێندەی مەبەست لێی لەخشتەبردن و بەکۆیلەکردنی خەڵکانی ترە. بۆ ئەم مەبەستەیش چەندین ڕێگە و کەرەستەی جۆراوجۆریان بەکارهێنا، تاوەکوو ئەوەی بە شێوەیەکی دروست ئافرەتان بخزێننە نێو ئەم مامەڵەیەوە. یەکێک لەو کەرەستانەی کە لە ڕێیەوە ئافرەتان دەخزێننە نێو ئەم دۆخەوە، ڕاگەیاندن و میدیایە، ئەوەی ئێستا لە جیهانی نوێدا پێی دەگوترێت دەسەڵاتی چوارەم، بەڵام لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست زیاد لەمە دەسەڵاتی یەکەمە و هەمیشە و هەموو کات ئەم دەسەڵاتە دژی ئایین بە کار هێنراوە.

هەڵەمان نەکردووە گەر بڵێین سەرەتای پرۆژەی بەخۆرئاواییکردنی ئافرەتان لەم ڕێگەیەوە بوو. ژمارەیەکی زۆر ئافرەتانی سفوور خزێنرانە نێو دونیای ڕاگەیاندن و بەردەم شاشەکان و سینەما و فیلمەکان، ئەمە جگە لە نمایشکردنیان بە شێوەیەکی مەترسیدارانە لە بەرگی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان. جگە لە هەوڵدان بۆ ئاساییکردنەوەی دیاردە دزێوەکانی پەیوەست بە پیرۆزییەکانی خێزان، لە نموونەی ئاساییکردنەوەی خیانەتی هاوسەرگیری و غیرە و شەهامەتی پیاوەتی و دەسەڵاتی باوک لە ماڵ، تەنانەت لە بەشێک لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بە مانشێتێکی گەورە دەنووسرا «عەیبە و ڕێزگرتن دەبێتە کۆسپ لە بەردەم سەرکەوتن».

لە چوارچێوەی ئەم هەوڵانەدا، ڕێکخراوە خۆرئاواییەکان هاوکارەکانیان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی لە ڕێگەی خستنەڕووی ڕاپرسی و ئاماری ساختەکارییان لە سەر ئامانجەکانیان دەکرد، لەوانە گوایە لە ئامارێکی نوێدا زۆربەی ئافرەتانی وڵاتانی ئیسلامی هەست بە بۆشاییی دەروونی دەکەن و دۆخی دەروونییان تەواو ناجێگیرە و لە ژێر ستەمی باوکسالاری و ترس و تۆقینێکی گەورەدا دەژین. ئەوەی جێگەی نیگەرانییە ئەوەی پێی دەگوترێت ڕێکخراوەکانی بەرگری لە مافی ئافرەتان هێندە بە ڕق و دەمارگیرییەوە کار دەکەن بە شێوەیەک لە وڵاتێکی وەک ئەمەریکا ڕێکخراوێکی ئافرەتان بە ناوی (حركة تقطيع أوصال الرجال - بزوتنەوەی پارچەپارچەکردنی پیاوان) دروست بوو.

ڕێکخراوەکانی بەرگری لە مافی ئافرەتان لە کێشەی گەورەدان هێندە بە گرنگییەوە لە دەستکەوتە تایبەتییەکانی سەربەرشتیارانی ڕێکخراوەکان دەڕوانرێت، هێندە بە گرنگییەوە لە کێشە و مافەکانی ئافرەت ناڕوانرێت و تەنیا وەک جۆرێک لە چاولێکەری خۆرئاوای دروست بوون. ئەو دیاردانەی کە گوایە ئەو ڕێکخراوانە کار دەکەن لە سەر نەهێشتنی و ڕیشەکێشکردنی لە

نموونەی بێڕێزکردن بە ئافرەتان و چەوساندنەوەیان و کوشتن و زیندانیکردنیان دوور و نزیک پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نییە. ئیسلام بە دەقی ڕوون و ئاشکرا لە ڕێی قورئان و فەرموودەوە تەواوی ئەم بابەتانەی قەدەغە کردووە، بۆیە لە سەرچاوە کۆن و نوێیەکانی موسڵماندا شتێک نییە بە ناوی کێشەی ئافرەتان یاخود بزاوتی ژنان.

بەدرێژایی مێژووی جیهانی موسڵمانان تا ئەم کۆتاییانە ڕێکخراو و دامەزراوەیەک نەبووە بە ناوی بەرگری لە مافەکانی ئافرەتان، بەو پێیەی گرفت و کێشمەکێشمێکی لەم شێوەیە بوونی نەبووە، بەڵام لە خۆرئاوا ئافرەتان لە دۆخێکی ناتەندروست و دژواردا ژیاون، بۆیە ئەم ڕێکخراوانە سەریان هەڵداوە. بەڵام لەنێو دونیای موسڵماناندا شتێک نییە بەم ناوەوە، بۆیە بوونی ڕێکخراوەکانی بەرگری لە مافی ئافرەتان بابەتێکی ناپێویستە. خۆرئاواییەکان مێژوویەکی کۆنیان هەیە. لەگەڵ ئەم بابەتەدا وەک ئەو بزاوتەی کە خانمە نووسەری فەرەنسی «سیمۆن دی بۆڤوار» (١٩٠٨-١٩٨٦) هەڵی گیرساند. ناوبراو لە درێژەی بانگەشەکانیدا دەڵێت: "هاوسەرگیری زیندانێکی هەمیشەییە بۆ ئافرەتان، تێیدا تەواوی ویست و ئارەزووەکانی لێ زەوت دەکرێت، بۆیە پێویستە پرۆسەی هاوسەرگیری و دامەزراوەکانی گرنگدەر بە هاوسەرگیری لەناو ببرێن و ئایینەکان هۆکاری سەرەکیی چەوساندنەوەی ئافرەتانن."[1] گوتەکانی «دی بۆڤوار» دەکرێت بۆ ژینگەی خۆرئاوای خۆی ڕاست بێت، بەڵام بۆ دۆخی ئیسلام و موسڵمانان تەواو جیاوازە. دەیان ئایەتی قورئانی و سەدان فەرموودەی پەیامبەر(ﷺ) بە ڕوونی تیشک دەخەنە سەر گرنگیی ڕێزگرتن لە ئافرەتان لە سەروو ئەو مافانەوە لە ئیسلامدا تەواوی ژیان و بژێویی ئافرەتان لە ئەستۆی پیاواندایە، بەڵام لە خۆرئاوا پێویستە ئافرەت خۆی بژێویی خۆی پەیدا بکات

---

(١) تحرير المرأة بين الغرب والإسلام د. محمد عمارة مكتبة الإمام البخاري للنشر و التوزيع ص ٤٨.

وەک «کاترین بورت» دەڵێت: "تەواوی ئەو ڕێکەوتننامانەی تایبەت بە ژنان و ئافرەتان واژۆ کراون سێ دەستە سەرپەرشتییان دەکات.

**یەکەم:** مێیینە توندڕەوەکان

**دووەم:** دوژمنانی سەرخستنی خێزان و خستنەوەی نەو

**سێیەم:** خەڵکانێک کە ئامانجی سەرەکی و کۆتاییان گەیشتنە بە جەستەی ئافرەتان."[1]

مێیینە توندڕەوەکان ئەوانەن کە ڕقێکی شاراوەیان بەرانبەر پیاوان هەیە و هەوڵی ڕیشەکێشکردن و بنەبڕکردنی پیاوان دەدەن. یاخود خەڵکانێکی سەرمایەداری کە سەرکەوتن و قازانجی خۆیان لە پشێوی و شکستی خێزانەکاندا دەبینێتەوە، یاخود خەڵکانێکی ئارەزووویستن کە ئامانجی سەرەتا و کۆتاییان گەیشتنە بە جەستەی ئافرەت. گەر ئەم چین و توێژانە داڕێژەری ستراتیژی مافەکانی ئافرەت بن، ئەوا بە دڵنیایی هیچ کات نە ئافرەتان و نە مافەکانیان ناگەنە هیچ ئامانجێک. هەموو ئەم لێکترازان و هەڵوەشاندنەوەی خێزان بە ناوی ئازادی و تەنانەت منداڵەکانمان لە بەردەم مەترسیی گەورەدان بە ناوی ئازادییەوە. وەک ئەوەی «ڕیتشارد ویلکیز» دەڵێت: "بە پێی یاسای نەتەوە یەکگرتوەکانی پەیوەست بە مافی منداڵان، تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە منداڵان مافی ئازادی و ڕادەربڕینیان هەبێت، لە ناو ئەوانەیشدا دەبێت مافی ئازادیی سێکسی هەبێت. هەر کەس و لایەنێک نکۆڵی لە مافی منداڵان بکات لە بەرجەستەکردنی سێکسی لەگەڵ گەورەدا ئەو تەنیا مافی منداڵەکەیشی زەوت نەکردووە، بەڵکوو مافی گەورەکەیشی زەوت کردووە."[2] ئەم پرۆفیسۆرە لە کۆتاییی قسەکانیدا دەڵێت: "لە ڕاستیدا کۆمەڵگەی

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٤٨.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٨.

ئەورووپی کەوتوونەتە نێو مەیدانی مەرگەوە دەیانەوێت تەواوی جیهانیش بە دوای خۆیاندا پەلکێش بکەن. خۆرئاواییبەکان هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی چەندین کەرەستەی جۆراوجۆرەوە پرۆسەی بە خۆرئاواییکردنی بگەیەننە لوتکە، لەوانە دروستکردنی ئەو فیلم و زنجیرە فیلمانە کە دەبنە مەترسیی ڕاستەوخۆ لە سەر ئافرەتان و لێکترازانی شیرازەی خێزان. لە لێکۆڵینەوەیەکی وردی یەکێک لە دەزگا پێوەندیدارەکان، تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە ڕێژەی لە سەدا حەفتا و پێنجی ئەو فیلم و زنجیرە فیلمانە، باس لە بابەتەکانی خۆشەویستی و سێکس و خیانەتی هاوسەرگیری دەکەن کە هەر یەکێک لەم بابەتانە دەبنە مەترسیی ڕاستەوخۆ لە سەر دامەزراوەی خێزان."[١]

کوردستانیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لە جیهانی ئیسلامی، پشکی شێری بەرکەوتووە. لەم دۆخە ئاڵۆزە نا تەندروستەدا، ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ فلتەرێک ئەو زنجیرانە بە شێوەی دۆبلاژ دەخەنە نێو ماڵی کوردییەوە کە بە هەردوو پێوەری ئایینی و کۆمەڵایەتی تەواو نامۆن بە کۆمەڵگەی ئێمە. بە تایبەتی لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا زیاتر چڕ دەبێتەوە کە زۆر جار بەرهەمهێنانی ئەم فیلم و زنجیرە فیلمانە و کڕینەوەیان لە کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکان و دۆبلاژکردن و پەخشکردنیان پارەیەکی خەیاڵیيان پێویستە کە تەنیا تێچووی کڕینەوە و دۆبلاژکردنی سەدان هەزار دۆلارە، ئەمە جگە لە بەرهەمهێنانی کە پارەیەکی زۆری تێدەچێت. لەم چوارچێوەیەدا وەک تیشک خستنەسەر زیانەکانی ئەم زنجیرانە لێکۆڵەری ئەمریکی دکتۆر «هوب ئامر لور» دەڵێت: "ئەو فیلمە بازرگانییانەی کە ئێستا لە سەرانسەری جیهاندا بڵاو بوونەتەوە کەرەستەیەکی کاریگەرن بۆ وروژاندنی ئارەزووی سێکسی و لەوەیش مەترسیدارتر بیرکردنەوەیەکی ناتەندروست سەبارەت بە سێکس و ئارەزوە

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٨.

جەستەییەکان لای کچان و کوڕانی تازەپێگەیشتوو دروست دەکات."[١]

ئەگەر بڕیار بێت ئەم فیلم و زنجیرە فیلمانە بۆ وڵاتانی خۆرئاوا جێگەی مەترسی بن، ئەوان بۆ گەنجان و لاوانی وڵاتانی خۆرئاوا ئەوا بە دڵنیایی مەترسییەکەیان بۆ وڵاتی ئێمە زیاتر و زیاترە.

---

(١) فتايتنا بين التغريب والعفاف د. الناصر العمر.

# کۆنگرە و کۆنفرانسەکانی پەیوەست بە کێشەکانی ئافرەتان و ژنان

گرێدان و بەستنی کۆنگرە و کۆنفرانسەکانی پەیوەست بە کێشە و گرفتەکانی ژنان لە سەرانسەری دونیادا بە گشتی و لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە تایبەتی، یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئافرەتانی موسڵمانی لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا پێ لە خشتە دەبرێت.

لەڕاستیدا ئەو کۆنگرانە دوور و نزیک پەیوەندییان بە کێشەکانی ئافرەتانەوە نییە ئەوەی سەرەتا و کۆتاییە لەم کۆنگرە و کۆنفرانسانە بابەتی ئازادکردنی ئافرەتانە. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە چ ئازادکردنێک و ئازادکردن لە چی و بۆچی؟ ئازادکردن لەو گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی کە بە هۆی هەژارییەوە سەپاوە بە سەر خێزانەکاندا؟ بێگومان، نەخێر، بەڵکوو ئازادکردنیان لەو چوارچێوە ئایینی و کۆمەڵایەتییە پتەوەی کە شوناسی ڕەسەن و ڕاستەقینەی ئافرەتانی موسڵمانی خۆرهەڵاتە، تاوەکوو ببنە کەرەستەیەکی سادەی دەستی خۆرئاواییەکان بە مەبەستی سەرخستنی پیلان و ئەجێندا سیاسییەکانیان.

زۆربەی کات خۆرئاواییەکان و ئەمریکییەکان هەوڵیان داوە خودی جیهانی ئیسلامی بکەنە مەیدانی ئەو جۆرە کۆنگرە و کۆنفرانسانە، هەر بۆیە زۆربەی کۆنگرە و کۆنفرانسەکانیان لە نێو وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا گرێ دەدا، هەموو ئەمانەش بە مەبەستی لێدانی بنەما گرنگ و پیرۆزییەکانی خێزانی موسڵمانە.

لە یەکێک لەو کۆنگرانە لە ١٩٨٦/٢/١٥ لە یەکێک لە وڵاتانی کەنداو بڕیار درا کار بکرێت لە سەر هەڵوەشاندنەوە و لەناوبردنی تەواوی ئەو یاسا و

ڕێنماییيانەی کە پێش هەزار ساڵ لەبارەی ئافرەت و پێگەی ئافرەت لە خێزان و ماڵدا خراونەتە ڕوو، بە دیاریکراوی مەبەست لەو یاسا و ڕێنماییيانە، شەریعەتی ئیسلامە، تەنانەت زمانی عەرەبییش پارێزراو نەبوون لەم هێرشانە. بە شێوەیەک لە ژێر ناوی قوولکردنەوی بیری یەکسانی لەنێوانی ژن و پیاودا لە کۆنگرەیەکی پەیوەست بە دۆزی ئافرەتان لە وڵاتی میسر پێشنیاری ئەوە کرا کە لێکۆڵەرانی و پسپۆڕانی زمان هەوڵەکانیان بخەنە گەڕ لەپێناوی لابردنی (ن) نسوەی ئافرەتانە لە زمانی عەرەبیدا، وەک هەنگاوێک بۆ نەهێشتنی جیاوازیی نێوان ژن و پیاو. ئەم جۆرە کۆنگرانە و کۆنفرانسانەی کۆتاییی سەدەی نۆزدەهەمدا دەورێکی کاریگەرییان هەبووە لە دروستکردنی ئەم دۆخەی ئێستا.

## تێکەڵکردنی کوڕان و کچان:

یەکێکی تر لەو کەرەستانەی کە لە ڕێیەوە گەنجان بە تایبەتی ئافرەتانی پێ لە خشتە دەبرێت، بریتییە لە تێکەڵکردنی هەر دوو ڕەگەزی نێر و مێ و لە ناوەندەکانی خوێندن و شوێنە گشتی و تایبەتەکاندا. هەنگاوێکی لەم شێوەیەیش بە ناوی ئازادی و کرانەوە و یەکسانیی نێوان ژنان و پیاوان تەواوی لێکۆڵینەوە زانستی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان لە سەرانسەری دونیادا مەترسی و زیانەکانی تێکەڵاوکردنی نێوان هەر دوو ڕەگەزیان پشتڕاست کردووەتەوە.

لە ئێستا ناوەندە پەروەردەیی و فێرکارییەکانی خۆرئاوا لە هەوڵی جیاکردنەوەی هەر دوو ڕەگەزن، بەڵام بەداخەوە تازەبەتازە لە ناوەندەکانی خوێندنی وڵاتانی ئیسلامی هەوڵی تێکەڵکردنی کچان و کوڕان دەدرێت کە لەوانەیە زیانەکانی ئەم جۆرە لە تێکەڵکردنە لای هەموو لایەک ئاشکرا نەبێت. هەوڵ دەدەین گوتە و گوزارشتی بەشێک لە خۆرئاواییەکان لەم بارەیەوە بخەینە ڕوو سەبارەت

بە زیانەکانی ئەم دیاردە مەترسیدارە لەوانە «دکتۆر جون کیشلر» یەکێک لە دەروونناسە بەناوبانگە ئەمریکییەکان لە زانکۆی شیکاگۆ دەڵێت: "لە ڕاستیدا لە سەدا نەوەدی پیاوی ئەمریکی دووچاری لاوازیی سێکسی هاتوون، لە سەدا چلیان دووچاری نەزۆکی هاتوون. ڕووتیی بێئەندازەی ئافرەتان و دەرکەوتنی جەستەیان لە ڕیکلام و ڕاگەیاندنەکان هۆکاری سەرەکی ئەم دۆخە ئاڵۆزەی پیاوانی ئەمەریکان."[١] فەیلەسووفی ئینگلیزی «بێرتراند ڕاسڵ» دەڵێت: "مەرجێکی گرنگ هەیە بۆ بەردەوامبوونی ژیانی ژن و مێردایەتی، ئەویش بریتییە لە جیاکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەو یاسایانەی کە ڕێگە دەدات بە تێکەڵکردنی هاوڕێیەتیی نێوان کوڕان و کچانی بێگانە. بەو پێیەی بەشێکی بەرچاو لە هۆکارەکانی دروستبوونی تەڵاق و لێکترازانی خێزانی بەم هۆیەوە دروست دەبێت."[٢] وەک ئەم لێکۆڵەرانە تیشکی دەخەنە سەر کە هۆکاری سەرەکیی داتەپیتنی دۆخی خێزان و لاوازیی هەستی پەیوەندیی سۆزداری و جەستەیی لای پیاوان لە دۆخی ناتەندروستی تێکەڵییەوە سەرچاوە دەگرێت. بە شێوەیەک پیاوان لە کۆنتڕۆڵ دەردەچن و ناتوانن بە هاوسەرەکانی خۆیان ڕازی بن، بۆیە هەمیشە بیر و هۆشیان لای ئافرەتی ترە. لە دۆخێکی ئاوادا یاساکانی خۆرئاوا ڕێگە بە فرەژنی نادەن، بە شێوەیەکی ئاسایی پیاوان هانا بۆ دۆخێکی ناتەندروستی پەیوەندیی ناشەرعی و نارەوشتی دەبەن لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەریان، بۆیە هەتا دێت ڕێژەی تەڵاق و لێکجیابوونەوە ڕوو لە هەڵکشانە. لە ساڵی ١٩٧٩ ڕێژەی تەڵاق لە سەدا ٤٠ بووە، لە ئێستادا ڕێژی تەڵاق گەییشتوەتە لە سەدا ٧٠ و ٨٠ کە بەشێکی دیاری هۆکاری ئەم لێکترازانە سستی و ساردیی پەیوەندیی هاوسەرانە لە چوارچێوەی ماڵدا کە

---

(١) جريدة الأخبار ژمارة ٢٦ / محرم ١٣٣٧، ص ٢.

(٢) من مفاهيم العلوم الإجتماعية أنور الجندي، دار الكتاب اللبناني للطباعة والنشر و التوزيع، ص ١٣٨.

وایە ڕوونە کە هۆکار و پاڵنەری سەرەکیی پرۆژەی تێکەڵکردنی ئافرەتان و پیاوان لەناوبردنی پرۆژەی خێزانە لە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

لە ڕاستیدا ئافرەتان لە خۆرئاوا لە دۆخێکی ناجێگیردا دەژین. ئەوان دەیانەوێت ئەو ئەزموونە تاڵەی خۆیان بگوازنەوە بۆ ئێمە، ئەگەر بەراوردێک بکەین لەنێوان ماف و ڕێزی ئافرەتان لە خێزان خۆرئاوا و ئیسلامدا بە ڕوونی تێ دەگەین لەوەی جیاوازییەکە تەواو فراوانە.

## تانەدان لە مافی ئافرەتان لە چوارچێوەی ئیسلامدا

پێویستە چاوێک بخشێنین بە نێو دۆخی ئافرەتان لە خۆرئاوا، دواتر ئاوڕێک بدەینەوە لە مافەکانی ئافرەتان لە چوارچێوەی ئیسلامدا. سەرەتا پێویستە ڕێگوزەرێک بکەین بە دۆخی ئافرەتاندا لە قۆناغە مێژووییەکانی پێش هاتنی ئیسلام بە خستنەڕووی دۆخی ئافرەتان تێ دەگەین لەوەی کە لە ڕابردوودا و پێشهاتنی ئیسلام ئافرەتان لە دۆخێکی ناتەندروستدا ژیاون.

## ئافرەت لای یۆنانییەکان

ئەوەی لە سەردەمی نوێدا لە تەواوی کایە سیاسی و کەلتووری و هونەرییەکاندا زۆرترین قسە و باس لەبارەی قۆناغی مرۆڤایەتی لە یۆنان بە گشتی دەکرێت وەک زێڕینترین قۆناغی مێژووی مرۆڤایەتی و لانکەی شارستانییەت، با سەرنج بدەین بزانین دۆخی ئافرەتان بە تایبەتی لە لانکەی شارستانییەت لە چ دۆخێکدا بووە، ئافرەتانی یۆنانی نەوەک تەنیا مافی ئازادییان نەبووە، بەڵکوو بوون و ئیرادەیان بە تەواوی لێ زەوت کراوە، بە جۆرێک کە کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا. تا وای لێ هاتبوو ئافرەت وەک

کاڵایەکی بێنرخ سەیر دەکرا. لە هەر جێگە و شوێنێک بووایە مەترسیی دەستریژیکردنە سەری هەبوو.[١]

## ئافرەت لای هیندییە کۆنەکان

دۆخی ئافرەتان لای هیندییە کۆنەکان باشتر نەبووە لە دۆخی ئافرەتان لای یۆنانییەکان. چەندین یاسا و ڕێنمایی سەیر و سەمەرەیان لەبارەی ئافرەتانەوە هەبووە. یەکێک لە سەیرترین ئەو یاسایانە هەر کات پیاوێک بمردبایە، دەبوو ڕاستەوخۆ دوای مردنی هاوسەرەکەی بسووتێنرایە. لای ئەوان ئافرەتان جگە لە کەرەستەیەکی تێرکردنی ئارەزوو سێکسییەکان زیاتر شتێکی تر نییە.[٢]

## ئافرەت لای جوولەکە

ئافرەت لە ئایینی تێکدراوی جوولەکەدا دۆخی لەوانی تر باشتر نییە. لە تەورات و تەلمودی پیرۆزی ئەواندا باس لەوە دەکرێت کە ئافرەت بە هیچ شێوەیەک میراتیی پێ نادرێت. زیاد لەمەش بە شێوەیەکی قێزەونانە دەڕواننە ئافرەت، کاتێک ئافرەتێک دەکەوێتە سووڕی مانگانەوە کە بوونەوەرێکی قێزەون لێی دەڕوانن و پێویستە پیاو لێی دوور بکەوێتەوە و لە ماڵێکدا لەگەڵی نەمێنێتەوە.

## ئافرەت لای ڕۆمانییەکان

---

(١)المرأة ماذا بعد السقوط بدرية العزار، ص ١٧ یان بڕوانە: المرأة المتبرجة، ص ٩ یان المرأة وحقوقها في الاسلام مبشر الحسيني سەرچاوەکانی پێشوو.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وەک تەواوی قۆناغەکانی تری مێژوو، ئافرەتانی سەردەمی ڕۆمانی تەواو دووربوون لە حەق و مافە سەرەتاییی و ئاساییەکانی خۆیان. بە شێوەیەک پیاوی ڕۆمانی مافی ئەوەی هەبووە کە لە سەر بابەتێکی سادە و ساکار هاوسەرەکەی بکوژێت. پێیان وا بووە ئافرەت کاتێک دەکەوێتە سووڕی مانگانەوە دەبێت بە تەواوی بێبەش بکرێت لە ژیانی ئاسایی، بەجۆرێک گەر خۆی دەستی لە هەر شتێک دابێت ڕاستەوخۆ ئەو شتە بە پیس دەزانرا. زیاد لەمەش لە سەروبەندی سووڕی مانگانەدا، مەگەر پیاوێک زۆر میهرەبان بووایە ماڵ جێ بهێڵێت، بە پێچەوانەوە زۆرێک لە پیاوان لەو دۆخەدا بە زۆر ئافرەتانیان لە ماڵ دەکردە دەرەوە تا ئەو کاتەی پاک دەبوونەوە. بەشێکی تریان لە دەرەوەی ماڵ خێمەیان بۆ ئافرەتەکانیان هەڵدەدا، لە کاتی پێویستدا نان و خواردن لە بەردەم خێمەکەی دادەنرا.[١]

## ئافرەت لای نەسرانییەکان

لە ئەدەبیاتی مەسیحییەکاندا ئافرەت گوزارشتە لە دەرگای شەیتان و دەروازەی هەموو فیتنە و نەهامەتییەک، وەک «تونولیان» یەکێک لە قەسیسە گەورەکانی خۆیان دەڵێت: "ئافرەت دەرگایەکە بۆ چوونەژوورەوەی شەیتان." پاشان وەک باسکردن لە مەترسیی ئافرەت لەبارەی ئایینەوە دەڵێت: "ئافرەت هەڵوەشێنەری شەرعی خودایە." لە چوارچێوەی ڕێوشوێنە یاساییەکان لەبارەی ئیدانەکردنی ئافرەتەوە لە سەردەمی «هێنری هەشتەم»دا پەرلەمانی ئینگلیز بڕیاری دا کە نابێت ئافرەت پەرتووکی «پەیمانی نوێ» بخوێنێتەوە بەو پێیەی ئافرەت پیسە و ئەو مافەی نییە و کارێکی لەم شێوەیە واتای بێڕێزیکردنە بە پەرتووکی پیرۆز.

---

(١) هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

لە چوارچێوەی داننان بە شوناسی مرۆڤبوونی ئافرەتدا، ساڵی ١٨٥٦ لە کۆنگرەیەکدا ژمارەیەک قەشە و پیاوی ئایینی دوای گفتوگۆیەکی درێژ و چڕوپڕ گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئافرەتان وەک پیاوان مرۆڤن، بەڵام بە پێچەوانەی پیاوانەوە هیچ حەق و مافێکی مرۆڤی نییە، بەڵکوو تەنیا بۆ خزمەتکردنی پیاوان دروست بووە. ئەمە وەک گەڵاڵەی بۆچوونێکی نوێ، گەرنا بەشێکی بەرچاوی تریان پێیان وا بووە کە ئافرەت هەر لە بنەڕەتەوە مرۆڤ نییە.[١]

## ئافرەت لای عەرەب پێش ئیسلام

دۆخی کۆمەڵایەتی لە نیوە دوورگەی عەرەبی تەواو ئاڵۆز بوو، زوڵم و ستەم و نادادی و پشێوی و ستەمی کۆمەڵایەتی، شوناسی دۆخی نیوە دوورگەی عەرەبی بوو. ئافرەتانیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لەم دۆخە ئاڵۆزە، لە بارێکی خراپدا ژیانیان دەگوزەراند. عەرەبەکانی پێش ئیسلام وەک ماڵ و سامان و دارایی لە ئافرەتانیان دەڕوانی. هیچ جۆرە ماف و بەرکەوتەیەکی کۆمەڵایەتی و داراییان نەبوو. بە شێوەیەک پیاو کاتێک دەمرد، تەواوی ئەوەی هاوسەرکەی هەیبووە، وەک کەلوپەلە بەجێماوەکانی دەبوونە میراتی و بەسەر ئەوانی تردا دابەش دەکرا.

زۆر دەگمەن ئافرەت توانیبای دوای مردنی هاوسەرەکەی جارێکی تر هاوسەرگیریی بکردایەتەوە. دەبوو بۆ ماوەی ساڵێک دوای مردنی مێردەکەی لە عیدەدا بووایەوە، بە درێژایی ئەو ساڵە تازیەباریی کێشابا و لەناو چڵک و پیسی و شوێنی ناتەندروستیدا ژیابا. لادان و ناتەندروستیی ئاکارییان بە

---

(١)بڕوانە: مكانة المرأة بين المسيحية والإسلام: سعدية محمد أبورزيزة، رسالة مقدمة لنيل الدرجة العالمية ماجستر بجامعة أم القرى بالسعودية -بمكة. سنة ١٤٠٨هـ

جۆرێک بوو، هەندێک لە پیاوانی نیوە دوورگەی عەرەب ژنەکانیان دەنارد بۆ لای پیاوێکی ئازا و جەربەزە و خانەدان، تاوەکوو لەگەڵ هاوسەرەکەیان جووت بێت و منداڵێکی بەهێز و تۆکمەیان بۆ بخاتەوە.

زیاد لەمەش بەشێکیان کاتێک کچیان دەبوو، تەواو دونیایان لێ دەهاتەوە یەک و بە زیندوویی لە چاڵیان دەنا. شێوازێکی تر لە شێوازەکانی بێڕێزی بەرانبەر ئافرەتان لای عەرەب ئەوە بوو، کاتێک میوانێک لە دوورەوە هاتبا لە کاتی مانەوەیدا شەوی ئافرەتێکیان دەخستە لای، تاوەکوو کابرای میوان بە ویستی خۆی چێژی لێ ببینێت، ئەمەیش وەک جۆرێک لە ڕێزلێنان هەژمار دەکرا. هەندێک جاریش چەند پیاوێک بە شێوەی کۆمەڵ و دەستەیی لە ماوەیەکی کەمدا دەچوونە لای ئافرەتێک، لە کۆتاییدا پێوەری دیاریکردنی ڕەچەڵەکی ئەو منداڵە بە شێوەیەک بوو، کام پیاوە زیاتر چووبایە لای ئافرەتەکە، منداڵەکە دەبووە هیی ئەو یاخود ئافرەتەکە لە نێو پیاوەکاندا پیاوێکی دیاری دەکرد و ڕەچەڵەکی منداڵەکەی بە سەردا دەبڕییەوە و چەندین تاوانی ناڕەوای تر کە بەرانبەر ئافرەتان ئەنجام دەدرا."[١]

لە هەمبەر بەراوردی ئافرەت لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوا، بە ڕوانینێک لە دۆخی پێشووی ئافرەتان لە جیهانی نوێدا، بە ڕوونی ئەوە دەردەکەوێت کە ئافرەتان لە چەند دەیەی ڕابردوودا دۆخیان باشتر نەبووە لە دۆخی ئافرەتان لە نیوە دوورگەی عەرەبی. بە شێوەیەک بەشێکی بەرچاو لە خۆرئاواییەکان ئافرەتانیان بە دوژمنی سەرسەختی خۆیان زانیووە. خستنەڕووی دۆخی ئافرەتان لە سەدەکانی ڕابرووددا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە، هەڵبەت ئەم جۆرە لە دیدی خۆرئاواییەکان تەنیا لە ئاستی خەڵکی گشتیدا نەبووە، بەڵکوو زۆرێک لە بیرمەندان و گەورەپیاوانی خۆرئاوایی هەڵگری هەمان بۆچوون بوون.

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی دۆخی ئافرەتان پێش هاتنی ئیسلام بڕوانە: المرأة في الإسلام، الإسلام انصف المرأة، المرأة المسلمة، هەروەها سەرچاوەی پێشوو.

لەو چوارچێوەیەدا «تۆماس ئەکوینی» (١٢٢٥-١٢٧٣) دەڵێت: "لە ڕاستیدا هیچ بوونێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نییە جگە لە بوونی ڕەگەزی نێر، ئافرەتان بوونەوەرێکی ناتەواون و هیچ سەیر نییە کە پێمان وایە ئافرەت بوونەوەرێکی گێژی ژەهرکراو بێت بە ژەهری گەمژەیی."[١]

یەکێکی تر لە بیرمەندان بە ناوی «بونافنتیرا» (١٢٢١-١٢٧٤) دەڵێت: "کاتێکی ئێوە ئافرەت دەبینن، وا مەزانن کە بوونەوەرێکی مرۆڤی ئاساییتان بینیوە، دڵنیابن کە بوونەوەرێکی دڕندەتان بینیووە، ئەوەی دیوتانە تەنیا شەیتانێک بووە نە زیاتر. کاتێک ئافرەت قسەی کرد، دڵنیا ببە ئەوەی گوێت لێ بووە دەنگی مار بووە."[٢]

«فریدریک نیچە» یەکێک لە دیارترین فەیلەسووفانی خۆرئاوایی و یەکێک لە کارەکتەرە دیارەکانی دونیای فەلسەفە کە تاوەکوو ئێستایش تیۆریا و بۆچوونە فەلسەفییەکانی لە جیهانی لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا دەورێکی کاریگەرییان هەیە، لەبارەی ئافرەتەوە دەڵێت: "ئەگەر چوویت بۆ لای ئافرەت، با دارەکەت بە دەستەوە بێت." ئەمە تێگەیشتنی یەکێک لە فەیلەسووفە دیارەکانە کە زۆرێک لە خەڵکانی دژە ئایین شانازیی پێوە دەکەن و وەک پێشەنگی هزری خۆیان لێی دەڕوانن. ئەم تێڕوانینە لە کوێ و تێڕوانینی پەیامبەری پێشەوای مرۆڤایەتی (ﷺ) لە کوێ کاتێک دەفەرموونێت: "شەرم ناکات ئەو کەسەی کە وەک کۆیلە لە خێزانەکەی دەدات و کەچی دواتر دەچێتە لای."[٣]

هەر لە درێژەی دیدی بەکەمزانینی ئافرەتان لەلایەن زانایان و دەستەبژێری

---

(١) بروانە: تحرير المراءة بين الغرب والإسلام، د. محمد عمارة، مكتبة الإمام البخاري للنشر والتوزيع بمصر سنة ٢٠٠٩. ص ٥٩.

(٢)هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣)رواه البخاري وغيره واللفظ في مصنف عبد الرزاق رقم ١٧٣٦٦.

خۆرئاواوە زانا و دەروونناسی بەناوبانگی جولەکە «سیگمۆن فرۆید» ١٨٥١-١٩٣٩) دەڵێت: "تەواوی هەستی مرۆڤایەتی لە کەسایەتیی پیاودایە، ئافرەتان بەو پێیەی کۆئەندامی نێرینەی پیاوانیان نییە هەمیشە و هەموو کات لە خەم و جۆرێک لە سترێسی دەروونیدا دەژین."[1] بۆچوونێکی لەم شێوەیە جێگەی هەڵوێستەکردنە، دەروناسێکی بەناوبانگی جیهانی شوناسی مرۆڤایەتی لە ئەندامی نێرینە کورت دەکاتەوە. بابەتی بەکەم سەیرکردنی ئافرەتان تەنیا لە کەلتوور و ئەدەبیاتی خەڵکانی ئاسایی و ئایینداری خۆرئاواییدا نییە، بەڵکوو ئەم بۆچوونە درێژ بووەتەوە بۆ لای خەڵکانی فەیلەسووف و شارەزایانیان. پێ دەچێت ئاییندارەکان بە هۆی مانەوەی بەشێک لە ڕاستیی ئایینەکەیان تاڕادەیەک بۆچوونەکانیان باشتر بێت لە فەیلەسووفەکانیان بەو پێیەی نا ئایینییەکانیان، لە فەیلەسووفەکان بیردۆز و تێڕوانینەکانیان لە ئەفلاتوونەوە وەرگرتووە کە هەمیشە داخ و حەسرەتی دەخوارد لەوەی کە کوڕی ئافرەتە و لە ئافرەت بووە، بە تۆمەتی مێیایەتی بەوپەڕی ناتەندروستی مامەڵەی لەگەڵ دایکی دەکرد. زیاد لەم تێڕوانینە «ئەفلاتوون» ئافرەت بە تەواوی دادەڕنێت لە هەستی خۆشەویستی و پێی وایە خۆشەویستیی ڕاستەقینە ئەو خۆشەویستییەیە کە لەنێوان پیاو و پیاودایە و جوانیی تەواویش لە گەنجیدایە.

لەبارەیپێگەی ئافرەتانەوە، سوکراتی باوکی فەلسەفەی یۆنانی پێی وایە کە سیاسەت و بەڕێوەبردن کاری پیاوانە، چوار دیواری ماڵەکانیش جێگەی گونجاوی ئافرەتانە.

زیاد لەمانە ژمارەیەکی تری فەیلەسووفە خۆرئاواییە نوێیەکان، نەک هەر ئەوەی بە تەواوی ئافرەت ڕەت دەکەنەوە، زیاد لەمە کار دەکەن لە سەر تۆخکردنەوەی ئەو جۆرە لە ڕق و کینە لە نێو دڵی خەڵکانی تردا.

---

(١)تحریر المرأة، ص ٥٧.

کارەکتەرێکی فەلسەفیی دیاری وەک فەیلەسووفی ئەڵمانی «شۆپنهاوەر» بە شێوەیەکی هێندە ڕەشبینانە لە ئافرەتان دەڕوانێت، هەر کەس ڕێگوزەرێک بکات بە نێو ژیانیدا و گوتەکانی بخوێنێتەوە، تەواو ڕقئەستوور دەبێت بەرانبەر ئافرەتان، دونیایەک ڕق و کینە لەنێو دڵیدا بەرانبەر ئافرەتان دروست دەبێت.

خستنەڕووی ئەم تێڕوانینانە تەنیا وەک گوزەرێکی سەرپێیە، دەنا تێڕوانینی نەرێنیی ژمارەیەکی بەرچاو لە فەیلەسووفان و بیرمەندانی خۆرئاوایی زۆر لەوە زیاترە کە بتوانین بەم شێوە سەرپێییە بیانخەینە ڕوو. لە سەر ئاستی نوێ دۆخی ئافرەتان لە جیهانی ئێستای ئەورووپادا بە خراپترین دۆخدا تێ دەپەڕن، ئەو فیلم و زنجیرە فیلمە ئەمریکی و خۆرئاوایییانەی پەخش دەکرێن، لە ڕاستیدا وێنای دۆخی ڕاستەقینەی ئافرەتان بەو شێوەیە نییە کە لە فیلم و زنجیرە فیلمیەکاندا بەرهەم دێن و دەخرێنە پێشچاوی بینەران.

ئەوەی جێی نیگەرانییە ئەو ڕۆحیەتە شکستخواردووەی تاکی خۆرهەڵاتییە کە بە جۆرێک شوناسی خۆیان بە تەواوی لە بیرکردووە و سەرسامی. و بگرە بەپیرۆز ڕوانینەوە لە تەواوی بەرهەم و کارەکانی خۆرئاوا. بە شێوەیەک خۆرئاواییەکان هەر چی بەرهەم بهێنن، ئەوان بە چاوی ڕێز و پیرۆزییەوە لێیان دەڕوانن، زیاد لەمە بەتایبەتی لە بابەتەکانی پەیوەست بە ئازادی و مافی مرۆڤ و ڕیتم و شێوازەکانی بەڕێوەبردن و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگە و لە بەرانبەردا بەکەم ڕوانین لە تەواوی ئەوەی ئیسلام و خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەرهەمیان هێناوە.

خۆرئاواییەکان لەم ڕێگەیەوە سەرکەوتوو بوون لە سەر سەپاندنی هەژموونی فراوانی خۆیان بە سەر خۆرهەڵاتدا لە تەواوی کایەکاندا. ئەمە لە کاتێکدا دانیشتووانی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە تەواوی لە ڕێنماییەکانی ئایینەکەی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە، بۆیە بەراوردکردنی وڵاتانی خۆرئاوا

بە دۆخی موسڵمانان لە خۆرهەڵات هەنگاوێکی تەواو هەڵە و ناتەندروستە، بەو پێیەی ئەو جۆرە لە بەراوردکردن بەراوردی هزر نییە بە هزر، بەڵکوو بەراوردی دۆخێکی خۆرئاوایی بنەڕەتییە بە دۆخێکی خۆرئاوای کۆپیکراو لە خۆرهەڵات. بەو پێیەی ئەوەی لە خۆرهەڵات دەگوزەرێت لە ڕووی بەڕێوەبردن و حوکمدارییەوە دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە، تاوەکوو ئەوەی بگوترێت خۆرهەڵات بە هۆی ئیسلامەوە دوا کەوتووە. لەو قۆناغانەی ئیسلام وەک هێزێکی سیاسی و سەربازیی گرنگ لە پێگەی دەسەڵاتدا بوو، هەمیشە خۆرهەڵات لە پێشەوە بوو.

لەو قۆناغانەدا خۆرئاواییەکان پێشبڕێکیان دەکرد لەپێناوی گەیشتن بە زانست و مەعریفەی بەرهەمهێنراوی خۆرهەڵات بە دانپێدانانی خودی زانایانی خۆرئاوایی زانستەکانی موسڵمان هەژموونی تەواوی بەسەر خۆرئاوا دا سەپاندبوو، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە پێچەوانەی ئێستا بە هۆی دواکەوتوویی و دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەیان، بابەتەکە تەواو پێچەوانە بووەتەوە.

نابێت ئێمە لە وەهمی مێژوودا بژین، تەواوی شانازی و بوون و شوناسمان بە مێژووە گرێ بدەین، بەڵکوو دروست ئەوەیە لە واقیعی ئێستای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بژین و بتوانین کێبڕکێی ڕووداو و پێشهاتە جیهانییەکان بکەین، بۆیە زۆر جار خۆرئاواییەکان ڕەخنەی ئەوە لە موسڵمانان دەگرن کە ئەوان لە وەهمی مێژوودا دەژین. لە پاڵ دید و تێڕوانینی خۆرئاواییەکان بەرانبەر ئافرەت دیدێکی جیاواز کە گوزارشتە لە خوێندنەوەی خۆرئاواییەکان بۆ دۆخی ئافرەت لە ئایین و شارستانیەتی ئیسلامی لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاو لە بیرمەندان و لێکۆڵەرەوان و نووسەرانی خۆرئاوای بە ڕۆحیەتێکی ئایدیۆلۆژیی دوژمنکارانەوە دۆخی ئافرەتان لە ئیسلام وەک ئایین و کۆمەڵگەی ئیسلامی دەخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، هەوڵ دەدەن وێنایەکی تراژیدی بۆ دۆخی ئافرەتان لای ئیسلام و موسڵمانان بکێشن.

لە بەرانبەر ئەم ئاڕاستە و بیرکردنەوە و وێناکردنە ئایدیۆلۆژییە ناویژدانیەدا، ژمارەیەکی بەرچاو لە بیرمەندان و نووسەرانی خۆرئاوای بە جۆرێک لە ویژدان و دادپەروەرییەوە وێنای دۆخی ئافرەتانیان کردووە و لە چەندین شوێن و دەقی جیاوازدا ئەم ڕاستییەیان خستوەتە ڕوو، بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەم جۆرە دەنگانە لەلایەن سیاسەتی گشتیی خۆرئاواییەکانەوە هەمیشە و هەموو کات دژایەتیی دەکرێت، تاوەکوو ئەوەی تەواوی دەنگە ڕەسەن و بەویژدانە خۆرئاواییەکان کپ بکەنەوە. لەم چوارچێوەیەدا بیرمەندی فەڕەنسی «گوستاف لۆبۆن» دەڵێت: "گەورەیی ئیسلام تەنیا لەوەدا نییە کە ڕێزێکی زۆری لە ئافرەت گرتووە. پێگەی ئافرەتی تا ئەوپەڕی سنوور بەرز کردووەتەوە، بەڵکوو لەوەدایە کە یەکەمین ئایین بووە بەم شێوەیە لە ئافرەتانی ڕوانیووە و ئەم جۆرە ڕێزەی لە ئافرەتان ناوە."[1] هەر لەم چوارچێوەیەدا «ڕۆزماری هاو» دەڵێت: "ئیسلام وەک ئایین ڕێزێکی تەواوی لە ئافرەتان گرتووە و مافی تەواوی مرۆڤبوونی پێ داوە، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە پێیان وایە تەنیا ئافرەتانی خۆرئاوای گەیشتوون بە مافەکانیان، لە ڕاستیدا ئافرەتانی خۆرئاوایی ناتوانێت مافی مرۆڤبوونی خۆی بە شێوەیەکی دروست بەرجەستە بکات، پێچەوانەی سروشتی مرۆڤبوونی خۆیان ئاراستە دەکرێن.

لە ئێستادا ئافرەتانی خۆرئاوا ناچارن لە دەرەوەی ماڵ کار بکەن لەپێناوی ئەوەی برێک پارە پەیدا بکەن، بەڵام ئافرەتانی موسڵمانان ئازادن لەوەی کار دەکەن یاخود نا، بەو پێیەی ئەرکی دەستەبەرکردنی بژێویی ئافرەتان لە ئەستۆی پیاوانە. هەر لەبەر ئەمە پیاوان گەورەی ماڵن و بەرپرسیارێتیی تەواوی ماڵ لە ئەستۆیانە، کار دەکات تاوەکوو بژێوی بۆ تەواوی ئەندامانی خێزان دابین بکات، ئەمەیە لوتکەی هەستی بەرپرسیارێتی. لە بەرانبەر ئەم

---

(١) المرأة والأسرة المسلمة د. عماد الدين خليل عمر، مكتبة التفسير للنشر والإعلان بالعراق- أربيل. سنة ٢٠٠٨، ص ٣٨.

بەرپرسیارێتییەی پیاوان، ئافرەتان بەرپرسیارێتییەکی گەورە خراوەتە سەر شانیان کە خۆی لە پەروەردەکردنی منداڵ و بەرهەمهێنانی نەوەیەکی تۆکمە و بەهێزدا دەبینێتەوە."[١] هەر لە چوارچێوەی تیشک خستنەسەر پێگەی ئافرەت، لە چوارچێوەی ئیسلام و ئەدەبیاتی موسڵمانان نووسەر و لێکۆڵەری «لورا فیشا فاگلیری» تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە ئیسلام کۆمەڵێک مافی بۆ ئافرەتان دەستبەر کردووە کە لەوەو پێش هیچ کەس نەی دەزانی و ئاگایی لێی نەبوو زۆرێک لە سەرچاوە مێژووییەکان بە بەڵگەوە ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردووەتەوە.[٢]

وەک زیاتر پشتڕاستکردنەوەی ئەم ڕاستییە «لاردی ئیفیلین کوبولودی» نووسەر و بیرمەندی ئینگلیزی دەڵێت: "کاتێک ئیسلام هات، تەواوی ماف و ئازادییە زەوتکراوەکان بۆ ئافرەتان گەڕایەوە و ئیسلام ئافرەتانی کرد بە هاوبەشی ڕاستەقینەی پیاوان، هەمان ئەو مافەی پیاو هەیەتی ئافرەتیش هەمان مافی هەیە. ئیسلام پیاوی کردە سەرکردەی ژمارە یەکی خێزان، تاوەکوو ئەوەی بەرپرسیارێتیی دەستەبەرکردنی بژێویی ئافرەت و تەواوی ماڵی بکەوێتە ئەستۆ. زیاد لەمەش ئیسلام پیاوی کردە پاسەوانی ڕاستەقینەی ئافرەت، تاوەکوو بە شێوەیەکی سەرکەوتوو ببێتە پەرژینی ئافرەت، لەبەر ئەم هۆکارانە پیاوان کران بە گەورەی ماڵ، دەنا لە بنەڕەتدا هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان ژنان و پیاوان.

با پێکەوە لە قورئان بڕوانین کاتێک دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ﴾ [البقرة: ٢٢٨] ناوبراو دەڵێت: "ئەم پلەیە بریتییە لە چاودێرکردن و بەرپرسیارێتیی نەوەک زەوتکردنی ماف. بەو واتایەی ئەگەر

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) بڕوانە: پەرتووکی لورا فیشا فاگلیری بەناوی دفاعا عن الاسلام لاپەڕە ١٠٦ وەرگیراو لە پەرتووکی قالوا عن الاسلام.

پیاو هەرچی ناڕەحەتی ژیان هەیە بکەوێتە ئەستۆی، تەواوی جەستەی بە هۆی کارکردنەوە لاواز ببێت لەپێناوی بەخێوکردن و پارێزگاریکردن لە هاوسەرەکەی، بە دڵنیایی زۆری ئەنجام نەداوە گەر لە بەرانبەردا خێزانەکەی ماڵی بۆ خاوێن بکاتەوە و خیانەتی لێ نەکات"[١]. هەر لەم چوارچێوەیەدا باڵیۆزی ئینگلیزی «لاردی ماری مونتکا» لە نامەیەکدا بۆ خوشکەکەی دەنووسێت "خۆرئاواییەکان پێیان وایە کە ئافرەتی موسڵمان لە کۆیلایەتی و دۆخێکی بێزێزیدا دەژی، ئەمە ئەو بانگەشەیە کە دەمەوێت بۆت بە درۆ بخەمەوە، لە بەر ئەوەی نووسەرانی خۆرئاوای نایانەوێت ڕاستی بنووسن و گوێیان لە ڕاستی ببێت، هیچ کات ئامادەیش نین بە دوای ڕاستیدا بگەڕێن. من ئەگەر ئێستا لە تورکیا نەبوومایە و لە نزیکەوە ئاگاداری و تێکەڵاویی ژیانی موسڵمانان و ئافرەتانی موسڵمان نەبوومایە، بە دڵنیایی منیش دەکەوتمەوە ژێر کاریگەری، بەڵام ئەوەی کە بینیم تەواوی ئەو قسانەی بە درۆ دەخاتەوە. زیادم نەوتووە گەر بڵێم تەواوی بانگەشەکانی ئەوان بە درۆ دەخاتەوە. زیادم نەکردووە گەر بڵێم ئافرەتی موسڵمانان ئازادیی زیاترە تاوەکوو ئافرەتی ئەورووپی، ڕەنگە تاکە ئافرەت بن لە دونیادا کە گوێ بە ژیان و بژێوییەیداکردن نادەن، ئەو کارە ئەرکی پیاوەکانیانە، ئەوان لە ماڵەوەن وەک ئەوەی لە کۆشکدا بژین."[٢] ئەمە قسەی ئەم ئافرەتەیە کە دۆخی ئافرەتان موسڵمانی بە چاوی خۆی بینیووە، تەواوی ڕاستییەکان لەو بارەیەوە دەخاتە ڕوو. بەداخەوە بەشێک لە نووسەرانی خۆرئاوایی کار دەکەن لەسەر ئاوەژووکردنەوەی ڕاستییەکان و هەوڵی وێناکردنی ژیانی موسڵمانان دەدەن بە خەڵکانی دواکەوتوو و ئەشکەوتنشین کە هیچ کات نایانەوێت بەئاسایی وەک ئەوانی تر بژین.

---

(١)بڕوانە: پەرتووکەکەی خۆی بە ناوی البحث عن الله لاپەڕە ٨١-٨٢ وەرگیراوە لە پەرتووکی قالوا عن الاسلام.

(٢) بڕوانە: پەرتووکی البحث عن الله

بەداخەوە نووسەر و لێکۆڵینەوە عالەمانییەکانی خۆرهەڵات بە هەمان ئاوازی نووسەرانی ئایدیۆلۆژیی بێ ویژدانی خۆرئاوا دەنووسن و بیر دەکەنەوە. لە درێژەی شاهیدانی نووسەرانی خۆرئاوایی لەم چوارچێوەیەدا «زیگرید هونکە» خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی هاوسەری دکتۆر «شولتز» دەڵێت: "لە دوای هاتنی ئیسلامەوە، ئیتر پێگە و شوناسی ئافرەت بەرەوپێشچوونێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی. «خەدیجە»ی هاوسەری یەکەمی پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) بێوەژنێکی خاوەن کەسایەتییەکی کاریگەر و خاوەن داهاتوو و داراییەکی بەرچاو، کاتێک بووە هاوسەری پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) پەیامبەر دەرفەتی بۆ ڕەخساند تاوەکوو ئەوەی زیاتر شارەزا بێت و توانا دارایی و بازرگانییەکانی زیاتر پەرە پێ بدا. دواتریش بە درێژاییی مێژووی ئیسلام ژمارەیەکی بەرچاو لە ئافرەتان لە سەر دەستی گەورە زانایان سەرقاڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی زانستە شەرعییەکان بوون و مۆڵەتیان لە گەورە زانایان وەرگرتووە، دواتر ڕاستەوخۆ ئەو زانستانەیان گەیاندوەتە نەوەیەکی تر."[1]

پاشان ئەم نووسەرە تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە ئافرەتان لە سەرەتای ئیسلامەوە بە هیچ شێوەیەک زوڵم و ستەمی لێ نەکراوە، گەر قۆناغەکانی دواتر دۆخێکی لەم شێوەیە ڕووی دابێت ئەوا لە ژێر کاریگەریی کەلتووری فارس و یۆنانییەکان دروست بووە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کەلتووری فارسی لە چەند قۆناغێکی دواتردا دزەی کردە نێو ژیار و ژیانی موسڵمانانەوە. ئیسلام بە تەواوی بێبەرییە لەو دۆخانە، بەو پێیەی ئەو دۆخە نەخوازراوانە دوور و نزیک پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نییە.[2] ئەم گوتانەی ناوبراو قەترەیەکن لە دەریای ڕاستییەکان، هەڵبەت خستنەڕووی ئەم جۆرە لە بەڵگە و گوتانەی خۆرئاواییەکان، وەک کەرەستەیەک بۆ بەربەچدانەوەی دید و تێڕوانینی

---

(١) بڕوانە: پەرتووکی ناوبراو بەناوی شمس العرب تسطع على العرب، ص ٤٧٠-٤٧١ .

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەیارانی ئیسلامە لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی دەنا موسڵمانی هۆشیار بە دروستی لەوە تێ گەیشتوون کە ئیسلام بە شێوەیەکی دروست و تەندروست مافی تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی دەستبەر کردووە، لە سەروو هەموویانەوە مافی ئافرەتان وەک چینێکی زیندووی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. زیاد لەمە تەواوی یاسا و ڕێساکانی پەیوەست بە پاراستنی مافەکانی ئافرەتان لە بنەڕەتەوە لە ئیسلامەوە وەرگیراون. دۆخی ئافرەتان لە خۆرئاوا بە جۆرێک بوو تاوەکوو ساڵی ١٨٠٥ لە یاساکانی ئینگلتەرا ڕێگەپێدراو بوو پیاو ژنی خۆی بفرۆشێت.[1] لە فەرەنسا تاوەکوو ساڵی ١٩٤٢ یاساکانی فەرەنسا ڕێگر بوون لەوەی ئافرەت هەڵسوکەوت بە ماڵ و دارایی خۆیەوە بکات بەبێ ڕێگەدانی نووسراوی پیاوەکەی. لە قۆناغەکانی پێشتریشدا ئافرەتان دۆخێکی خراپیان دەگوزەراند، یاسای ڕۆمانییەکان بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە ئافرەت هیچ مافێکی نییە و خاوەنی خێزان بۆی هەیە بیفرۆشێت و دەری بکات و سزای بدات، تەنانەت بۆی هەیە بیشی کوژێت. نزیک لەم جۆرە ستەمە لە یاسای هیندییەکاندا هاتووە "لەم جیهانەدا هیچ شتێک هێندەی ئافرەت بێنرخ نییە."

ئەمە و سەدان یاسای تر کە بە درێژایی مێژوو ماکینەیەک بوون بۆ هاڕینی شوناس و کەسایەتیی ئافرەتان، دواتر ئیسلام توانیی تەواوی ئەم دۆخە نەخوازراوانە تێ بپەڕێنێت و ماف و شوناس بۆ ئافرەتان بگێڕێتەوە. بێگومان بەراوردکردنی دۆخی خۆرئاوا لەگەڵ جیهانی ئیسلامی لە بنەڕەتەوە بەراوردێکی هەڵەیە، بەو پێیەی ئەم بەراوردکردنە لەنێوان واقیعی خۆرئاوایی و واقعێکی خۆرهەڵاتیە کە داینەمۆکەی خۆرئاواییە دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە. هەر لەم ڕوانگەیەوە زۆرێک لە ڕەخنەگران دەکەونە هەڵەوە،

---

(١) بڕوانە: المذاهب الفكرية المعاصرة د. غالب العواجي، دار العصرية للطباعة والنشر والتوزيع بجدة سنة ٢٠٠٦، ص ١٠٥.

کاتێک دەیانەوێت بەراوردی نێوان دوو دۆخ بکەن کە خۆی لە بنەڕەتدا هەر یەک دۆخە. واتای هەژمارکردنی واقیعێک لە سەر ئیسلام کە دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە و واقیعی ئیسلام نییە، کاتێک دەکرێت ئەم واقیعە لە سەر ئیسلام هەژمار بکرێت کە تێیدا ئیسلام حوکم بکات و تەواوی جومگە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بەڕێوە بەرێت، نەوەک یاسا هاوردە خۆرئاواییەکان. بەڵام لەگەڵ ئەم دۆخەی کە تێیدا ئیسلام حاکم نییە و بە تەواوی لە ناوەندی دەسەڵات و بڕیاردان دوور خراوەتەوە، گەر بێتوو بەراوردێک بکەین لەنێوان ئافرەتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی کە تاوەکوو ئێستایشی لەگەڵ بێت لە ژێر کاریگەریی ئیسلامدان، لەگەڵ ئافرەتانی خۆرئاوا، دەبینین ئافرەتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی دۆخیان باشترە و ئازادترن تاوەکوو ئافرەتانی خۆرئاوا، بەو مەرجەی ئەو ناوچەیە لەلایەن خۆرئاواییەکانەوە دووچاری جەنگ و کوشتار نەکرابێت. لە دۆخێکی نەخوازراوی جەنگدا تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بەبێ جیاوازی دەکەونە دۆخێکی نەخوازراوەوە، وەک پشتڕاسکردنەوەی ئەم ڕاستییە ژمارەیەکی بەرچاو لە زانایان و لێکۆڵەرەوان گەواهیی مامەڵەی دروستی پیاوانی موسڵمانیان داوە لەگەڵ ئافرەتەکانیان. لەم بارەیەوە «سالی جان مارش» دەڵێت: "ئەو کێشانەی کە ئافرەتانی خۆرئاوایی لەمڕۆدا تێیدا دەژین، لەڕاستیدا لای ئافرەتانی موسڵمان بوونێکی نییە، بە پێچەوانەی ئافرەتانی خۆرئاواییەوە ئافرەتانی موسڵمان بە هێمنی و ئارامی و خۆشەویستییەوە دەژین."[1]

هەر لەم چوارچێوەیەدا «گۆستاف لوبۆن» باس لەوە دەکات حاڵی ئێستای ئافرەتی موسڵمان زۆر باشترە لە حاڵی خوشکەکانی لە ئەورووپا، ئەوەیش بە هۆی ئیسلامەوەیە کە ئافرەتی بەرز کردەوە و پاراستی لە تەواوی بێڕێزییەکان. ئێمە یەکەم کەس نین کە بەرگریمان لەم جۆرە بۆچوونە کردووە، بەڵکوو خەڵکانێکی

---

(١)المرأة والأسرة المسلمة. عماد الدين خليل، ص ٧٣.

زۆر پێش ئێمە ئەم بۆچوونەیان هەبووە.[١] هەر لە چوارچێوەی پشتڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە «سالی مارشی» دەڵێت: "گەر وا دابنێین ئافرەتی موسڵمان هەندێک کۆتوبەندی لە سەر دانراوە، پێویستە باش لەوە ئاگادار بین کە ئەم کۆتوبەندانە لە بنەڕەتدا لەپێناوی بەرژەوەندیی ئافرەتانە، هەموو ڕێوشوێنەکانی ئیسلام لەپێناوی پاراستن و مانەوە و بەرژەوەندیی بەهێزی ئافرەتاندایە. بە ڕوونی دەبینین ئەو کێشانەی کە دووچاری خێزانە خۆرئاواییەکان دەبێتەوە، لە ناو خانەوادە موسڵمانەکاندا بوونیان نییە."[٢]

«ماکلوسکی» دەڵێت: "ئافرەت لە ژێر سێبەری ئیسلام دەتوانێت ئازادیی خۆی بگەڕێنێتەوە، چونکە ئیسلام پێی وایە ئافرەتان تەواوکەری پیاوانن." پاشان دەڵێت: "ئافرەتی موسڵمان لە تەواوی لایەنەکانی ژیاندا سەربەرز و شکۆمەندە، بەڵام بەداخەوە لە سەردەمی ئەمڕۆدا ئافرەتانی موسڵمان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بانگەشەی خۆرئاواییەکانەوە. بەڵام دواتر تێ دەگات کە ئامانجی خۆرئاواییەکان جگە لە بەلاڕێدابردن زیاتر شتێکی تر نییە."[٣]

ئافرەتانی کوردی موسڵمانیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لە ئافرەتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، ڕۆژێک دێت دەگەنە ئەو ڕاستییەی ئەوانەی بە ناوی مافەکانیانەوە فرمێسکی تیمساحی دەڕێژن، جگە لە نەیارێک لە بەرگی دۆستدا زیاتر شتێکی تر نین. تاوەکوو ئێستایشی لەگەڵ بێت ئافرەتانی کورد لەژێر هەژموونی ئیسلامدان وەک ئایین و لەژێر چوارچێوەی ئەم ئایینەدا تا ڕادەیەکی بەرچاو مافەکانیان پارێزراوە، مەترسییە گەورەکە ئەو کات دەست پێ دەکات کە پێویست دەبێت لە سەر ئافرەتان کار بکەن و بژێوییان پەیدا بکەن وەک ئافرەتانی خۆرئاوایی.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو. لا ٧٣.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو . لا ٧٣.

(٣)هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٣٣-٤٣٦.

گومان نییە لەوەی لە داهاتوو ئەم فۆڕمە لە ژیان لە ژێر ناوی ئازادی و بزاوتی دژە باوکسالاری، مافەکانی ئافرەتان بە سەز کۆمەڵگەی ئێمەدا دەسەپێنن. ئەو کات ئافرەتی کورد دووچاری مەترسییەکی ڕاستەقینە دێن، شوناس و بونیادی کەسایەتییان دووچاری مەترسیی گەورە دێت، ئەمەیە جیاوازیی ڕاستەقینەی نێوان ئیسلام و خۆرئاوا. ئیسلام هەموو هەوڵێک دەدا لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە و هەر چییەک مایەی مەترسی بێت بۆ سەر ژیان و شوناس و کەسایەتیی ئافرەت قەدەغەی کردووە. وەک نووسەری بە ناوبانگی ئافرەت «ئانا ڕورد» دەڵێت: "گەر کچەکانمان لە ماڵەوە خزمەتکار بن، یاخود وەک خزمەتکار بن، باشترە لەوەی کە لە کارگەکاندا کار بکەن. بەو پێیەی کاری دەرەوەی ماڵ دەبێتە مەترسیی ڕاستەقینە لە سەر شوناس و کەسایەتیی ئافرەت. خۆزگەی ئەوە دەخوازم کە وڵاتەکەمان وەک وڵاتانی ئیسلامی دەبوو کە لێوانلێون لە ئابڕوو و داوێنپاکی، بە ڕاستی مایەی نیگەرانی و ئابڕووچوونە بۆ وڵاتێکی وەک ئینگلتەرا کە دۆخێکی نەخوازراو و قێزەونیان بۆ ئافرەتان دروست کردووە. بۆچی ئێمە هەوڵی دۆزینەوەی کارێک نەدەین بۆ ئافرەتان کە هاوتەریب بێت لەگەڵ سروشتی ئافرەتان کە بریتییە لە بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ و وازهێنان لە کاری دەرەوە بۆ پیاوان تا ئافرەتان بە وریاییەوە کار و ئەرکانیان بەرجەستە بکەن."

ئیسلام وەک ئایینێکی خودایی، ئەوەی کە خەڵکی چەندین سەدە بە دوایدا وێڵە بە ئاسانی دەخاتە بەردەستی، ئەوانی تر بۆیە تێگەیشتن لە ئیسلام تەنیا لە یەک زاویەی بچووکەوە جگە لە هەڵەتێگەیشتن شتێکی تر بە دوای خۆیدا ناهێنێت.

وەک ئەوەی گوتراوە نیوەی ڕاستی درۆیە، کە وایە هەر هەواڵێکی ڕاست گەر بێتوو نیوەی لێ بکرێتەوە، ئەوا دەبێتە ناڕاست. ئیسلامیش بە هەمان شێوەیە گەر بێتوو لە یەک لایەنەوە سەیر بکرێت، ئەوا دەبێتە هەڵەیەکی مەترسیدار.

ئەگەر پیاوان باس لەوە بکەن کە بۆچی تەواوی ئەرک و بەرپرسیارێتییەکان و بژێوی لە سەر شانی پیاوانە، ئەمە لە کاتێکدا ئافرەتان وەک پیاوان چێژ دەبینن لە هەستی مادی و مەعنەویی پرۆسەی هاوسەرداریی، یاخود لە بەرانبەر ئەم هەستەی پیاوان ئافرەتان باس لەوە بکەن، کە بۆچی ئێمە نیوەی میراتی وەردەگرین، لە کاتێکدا ئێمە هەمووان لە یەک دایک و باوکین؟ بە ڕوانین لە بابەتەکان بەم شێوە سەرپێیە جگە هەڵە و ناتێگەیشتن شتێکی تر نییە. گەر بێتوو بابەتەکە بەم شێوەیە بخرێتە ڕوو ئەوە هۆکاری یەکەم لەبەر بوونی بەشی دووەمە. هۆکاری دووەمیش بە هۆی دۆخی یەکەمەوەیە، ئیتر ئەو کات بە شێوەیەکی دروست لە بابەتەکان تێ دەگەین و ڕاڤەیەکی دروستمان لە هەمبەر بابەتەکانی پەیوەست بە شەریعەتەوە دێتە پێش چاو.

# میدیا وەک کەرەستەیەک بۆ لەکەدارکردنی ئیسلام

لە چوارچێوەی کەرەستەکانی دژایەتیکردن و ناوزڕاندنی ئیسلامدا، یەکێک لەو کەرەستانەی کە زۆرترین کاریگەریی هەیە لە پرۆژەیەکی لەم شێوەیەدا بابەتی میدیا و ڕاگەیاندنەوە ئەوەی لە ئەدەبیاتی سەدەی نوێدا بە دەسەڵاتی چوارەم ناو دەبرێت. میدیا لە سەر ئاستی جیهانی دەورێکی کاریگەری هەیە لە ئاراستەکردنی دۆخی سیاسی و ئابووریی جیهانی، بە جۆرێک وەک کەرەستە زۆر جار لە سوپایەکی بەهێزی چەکدار کاریگەرترە. دروستتر بڵێین میدیا سیحرێکی نوێی سەردەمە کە هیچی کەمتر نییە لەو سیحرە ئەفسانەییانەی کە لە سەرچاوە کۆنەکاندا باس کراون.

لە کۆندا ئەدەبیاتی ئەورووپییەکان پێداگریی لە سەر ئەوە دەکرد کە هەر کەس ئاڵتوونی هەبێت دەسەڵاتیشی لە بەردەستدا دەبێت، بەڵام لە ئێستادا تێگەیشتنەکە تەواو پێچەوانە بووەتەوە، بە شێوەیەک هەر کەس ڕاگەیاندنێکی بەهێز و کاریگەری لە بەردەستدا بێت بە دڵنیاییی دەسەڵات و کاریگەریی لای ئەوە. کە بە ڕوونی لە کاریگەریی ڕاگەیاندن بڕوانین لە سەر ئاستی ناوخۆیی و جیهانی سەیر نابێت بە لامانەوە کە چۆن ٢٤ ملیۆن دانیشتووانی کۆریای باکوور باوەڕیان کردووە بەوەی کە وڵاتەکەیان گەورەترین و بەهێزترین وڵاتە لە سەر هەر دوو ئاستی ئابووری و سەربازی. هەر لە ژێر کاریگەریی ڕاگەیاندندا، نەیارانی هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق لە ناوخۆی ئەمەریکا بۆچوونیان گۆڕی و پاڵپشتیان لە هێرش و داگیرکاریی وڵاتەکەیان کرد بۆ سەر عێراق. هەر لە ژێر کاریگەریی هەژموون و کاریگەریی ڕاگەیاندندا، تەواوی میللەتانی ئەڵمانیا و ڕووسیا کەوتنە ژێر کاریگەریی سیاسەتەکانی

هیتلەر و ستالینەوە بوونە پاڵپشتی سیاسەتی ئەو دیکتاتۆرانە و سووتویی جەنگ و سیاسەتی پاوانخوازیی ئەو سەرکردانە، هەر لە ڕێی ڕاگەیاندنەوە لە سەرانسەری جیهاندا شەرعیەت دەدرێت بە تەواوی جەنگ و کوشتار و کاولکارییەکان و هەوڵی دروستکردنی ڕایەکی گشتی پشتیوانیی بۆ دەدرێت. هەر لە ڕێی ڕاگەیاندنەوە ڕووداوە گەورەکانی جیهان بچووک دەکرێنەوە و بچووکەکان گەورە دەکرێن.

بە ڕوانین لەم دۆخ و کاریگەرییە، ئیتر بە ڕوونی تێ دەگەین لەوەی کە کێ سیاسەتی جیهانی ئاڕاستە دەکات. کێیە ڕای گشتیی جیهانی بەو شێوەیەی دەیەوێت ئاڕاستە دەکات، کێ سیحر دەکات و جیهان چۆن سیحری لێ دەکرێت.

چەندین ساڵ پێش ئێستا و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٩٧٧دا، لە ڕاپرسییەکی فراواندا کە ژمارەیەکی بەرچاو لە هاوڵاتییان لە تەواوی چین و توێژە جیاوازەکان تێیدا بەشدار بوون، پرسیاری ئەوە لە بەشداربووانی ئەو ڕاپرسییە دەکرا کە چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە زانیارییەکانی خۆت لەبارەی جیهان و ڕووداوە جیهانییەکانەوە وەرگرتووە. لەسەدا نەوەد و پێنجی بەشداربووان باس لەوە دەکەن کە زانیارییەکانیان لەبارەی جیهان و ڕووداو و پێشهاتە جیهانییە جیاوازەکان لە ڕاگەیاندنەوە وەرگرتووە.[1] ئەمە دۆخی نەخوازراوی ئەوانە، چەندین دەیە پێش ئێستا بە دڵنیایی لە ئێستاشدا دۆخەکە ئاڵۆزتر و مەترسیدارترە دەبێت لە سەردەمی ئینتەرنێت و مانگە دەسکردەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان. دۆخەکە لە چ ئاستێکدا بێت، دەزگا میدیایی و ڕاگەیاندنەکان بە شێوە و کەرەستەی جۆراوجۆر پەیڕەوی لە سیاسەت و ئەجێنداکانیان دەکەن.

---

(١) صورة الإسلام في الإعلام الغربي. عبد القادر طاش،: الزهراء للإعلام العربي بمصر ١٩٩٣، ص ٣٠.

هەموو ئەمانە لەپێناو گێلکردن و ئاڕاستەکردنی ئەوەی پێی دەگوترێت، ڕای گشتی وەک ئەوەی «بالوفیر» دەڵێت: "ڕاگەیاندن هۆکارێکە بۆ ژێربارکردن و زەلیلکردنی بیسەران و بینەرانی." هەر بۆیە هەمیشە ئەوانەی لە لوتکەی دەسەڵاتدا بوون، هەوڵیان داوە خەڵکی زەلیل و ژێردەستە بکەن بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیانەوێت ئاڕاستەیان بکەن. وەک قورئانی پیرۆز وێنای ئەم بابەتە دەکات و دەفەرمووێت: ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٥٤﴾﴾ [الزخرف: ٥٤] «فیرعەون هۆزەکەی زەلیل کرد، ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون و ژێردەستەی بوون بە ڕاستی ئەوان گەلێکی فاسیقن.» لەگەڵ ئەوەی ئەم وێنایەی قورئان لەم دۆخەدا مەبەستی فیرعەونە، بەڵام لە چوارچێوە گشتییەکەیدا مەبەستی خستنەڕووی سایکۆلۆژیای تەواوی دەسەڵاتدارانی ستەمکارە بە درێژاییی مێژوو، تاوەکوو داهاتوویشی لەگەڵ بێت. ڕوونتر بڵێین حاڵی هەموو فیرعەونێکە بە درێژاییی مێژوو بە تایبەتی تر فیرعەونەکانی سەدەی بیستەم. وەک ئەوەی قورئان پێمان بڵێت، لەگەڵ ئەوەی فیرعەون لە ڕووە حەقیقییەکەیدا کارەکتەرێکی مێژووییە لە قۆناغێکی دیاریکراودا، بەڵام فیرعەونبوون عەقڵییەت و بیرکردنەوەیە زیاد لەوەی کارەکتەرێک بێت.

لەبارەی مەترسییەکانی ڕاگەیاندن و ئاڕاستەکردنی نادروست، پسپۆڕی بەناوبانگی ئەمریکی «هربرت شیللر» لە پەرتووکەکەی خۆیدا بە ناوی (المتلاعبون بالعقول-یاریکەران بە ژیری و عەقڵ) باس لەوە دەکات کە چۆن خەڵکانێک بە شێوەیەکی ناتەندروست یاری بە عەقڵی خەڵکی دەکەن. ناوبراو لە سەرەتای پەرتووکەکەیدا تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەڵێت: "پێم وایە کە پێویستە لەبارەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە بگوترێت کە گوزارشتە لە کۆمەڵگایەکی چەواشەکار کە میدیای بەکارهێناوە بۆ دەستگرتن بە سەر جیهاندا وەک کەرەستەیەکی سەرەکی لەپێناو دەستبەسەراگرتنی جیهان. کە لە ڕاستیدا لەلایەن چەند دەستە و کۆمەڵە و کۆمپانیایەکی زەبەلاحەوە بە ڕێوە

دەبرێت، بۆیە پێویستە بە وریاییەکی بەرچاوەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم دیاردەیە بکەین."[١] دوابەدوای باسکردنی دۆخی ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی «هربرت شیللر» لە پەرتووکەکەیدا پێنج خاڵ باس دەکات کە لە ڕێیانەوە میدیا دەبێتە کەرەستەیەکی کاریگەر لەپێناوی گەوجاندنی خەڵک، ناوبراو لە سەرەتای باسکردنی ئەم خاڵانە دەڵێت: کەرەستە و هەیمەنەی میدیای لە سەر پێنج ئەفسانە بونیاد نراوە کە بریتین لە:

## ١- ئەفسانەی تاک و مافی تاک:

ئەفسانەی تاک و ئازادییەکانی تاک: یەکێکە لەو کەرەستانەی کە میدیای خۆرئاوایی بە چڕی کاری لە سەر دەکات. لە ڕاستیدا ئەوەی لە جیهاندا پێی دەوترێت مافی تاک جگە لە کەرەستەیەک بۆ هەڵخەڵەتاندنی تاک و کۆمەڵگە زیاتر شتێکی تر نییە. بەو پێیەی مەحاڵە هیچ کات بتوانرێت تاک لە کۆمەڵگە جیا بکرێتەوە، وەک ڕوونە سەرەتای هەموو شارستانیەتێک وەک کوماکس و بیرکوفیتش و چەندین بیرمەند و فەیلەسووفی تر ئاماژەی پێ دەکەن: بەردەوامبوونی ڕەگوڕیشەی هەموو شارستانیەتەکان پەیوەستە بە هاوکاری و پەیوەندیی دەستەی تەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگەوە.

پاشان ڕوونتر لەم بارەیەوە دەدوێت و دەڵێت: "کۆڵەکەی ئازادی لای خۆرئاواییەکان لە ناو ئازادیی تاکدا خۆی دەبینێتەوە، دواتر خۆرئاواییەکان دەگەنە ئەو ڕاستییەی کە ئیسلام لە مێژە جەختی کردوە لە سەر پێشخستنی ئازادیی کۆمەڵگە و ڕەچاوکردنی لە پێش ئازادیی تاک."[٢] هەڵبەت ئەم

---

(١) بڕوانە: پەرتووکەکەی خۆی: المتلاعبون بالعقول، وەرگێڕانی عبد السلام رضوان، عالم المعرفة بالكويت ١٩٧٨. ص ٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ١٤.

بیرۆکەیەی ئیسلام لەبارەی ئازادیی کۆمەڵگەوە واتای فەرامۆشکردن و ڕەچاونەکردنی ئازادیی تاک نییە. لە ئێستادا ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی کار دەکات لە سەر تۆخکردنەوەی ئازادی، بە جۆرێک تاک ئازاد بێت لە تەواوی جووڵەکانی تا ئەوپەڕی سنوور کە تاک بۆی هەیە هەستێت بە کۆیلەکردن و بەکرێگرتنی چەندین کەس بە ناوی ئازادی و مافی خۆی.

ئیسلام وەک پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی دەبێتە ڕێگر لە بەردەم هەندێک لە ئازادییەکانی تاک لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگە. واتا تا ئەو کات تاک ئازادیی هەیە کە نەبێتە مەترسی لە سەر بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە. لە سیستمی دارایی زۆرێکی زۆر لە وڵاتانی جیهاندا تاک بۆی هەیە پارەی خۆی بدات بە قەرز بە سوودی چەند بەرانبەر بەو شێوەیەی کە هەردوولا لە سەری ڕێک دەکەون، بەڵام لە ئیسلامدا قەرزدان بە سوود حەرامە. بەو پێیەی ئەم شێوە لە قەرزدانە دەبێتە مایەی دروستبوونی مەترسیی ڕاستەقینە لە سەر تەواوی کۆمەڵگە و ئەندامانی کۆمەڵگە قورساییەکی زۆری دارایی دەکەوێتە سەر شانیان، بە شێوەیەک کە تەواوی تەمەنی سەرقاڵ بێت بە گێڕانەوەی ئەو سوودە، ئەمە جگە لە خودی قەرزەکە تا ئەو کاتەی خاوەن قەرز ڕاستەوخۆ مافی دەبێت لە بەکۆیلەکردنی ناڕاستەوخۆی کەسی قەرزدار، تا کۆتاییی تەمەنی بەو شێوەیەی دەیەوێت بە کاری دەهێنێت، هەموو ئەمانە بە ناوی ئازادیی تاک و پارێزگاریکردن لە ئازادیی تاک.

## ٢- ئەفسانەی بێلایەنی:

«شیللر» دەڵێت: "بێلایەنی لە جیهانی میدیا و ڕاگەیاندندا گەورەترین درۆی سەردەمی نوێیە، لە ڕاستیدا لە جیهانی میدیا شتێک نییە ناوی بێلایەنی بێت. تەواوی دامەزراوە میدیاییەکانی جیهان لە سەرووی هەموویانەوە دامەزراوە

خۆرئاواییەکان وای نیشان دەدەن کە بە شێوەیەکی زانستی و پرۆفیشناڵانە دوور لە هەر پاڵنەرێکی سیاسی و ئابووری و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی ڕووداوەکان دەگوازنەوە و خوێندنەوە و هەڵسەنگاندن بۆ ڕووداوەکان دەکەن، بەڵام بە شێوەیەک بابەتەکان دەخەنە ڕوو تاوەکوو ئەوەی هەمووان بەو شێوەیە تێ بگەن کە ڕووداوەکان وەک ئەوەی هەیە دەخەنە ڕوو." پاشان دەڵێت: "لە ڕاستیدا تەواوی کەرەستەکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و گۆڤار بەبێ هیچ هەڵاوێردێک لەپێناوی ئامانجێکدا هاتووەتە دامەزراندن. بەشێکی بەرچاو لەم ڕاگەیاندنانە جگە لە ئامانجی بازرگانی ئامانجی سیاسییان لە پشتەوەیە، بەشێکی بەرچاوی داهاتەکانی خۆیان لە ڕێی ڕیکلامی بازرگانییەوە دەستبەر دەکەن." پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "بە ڕوانینێکی خێرا بە نێو دۆخی ڕاگەیاندندا، خەڵکی ئاسایی وا دەزانن سیاسەتی دامەزراوە ڕاگەیاندنەکان سیاسەتێکی ئەبستراکتە و هیچ ئامانجێکی شاراوەی لە پشتەوە نییە، هەر وەک چۆن وا دەردەکەوێت مەبەست لە داڕشتنەوەی تەواوی پرۆگرامەکانی خوێندن لە قۆناغی سەرەتایی تا کۆتایی قۆناغی زانکۆ هیچ ئامانج و پاڵنەرێکی لە پشتەوە نییە، بەڵام لە ڕاستیدا بابەتەکە بەو شێوەیە نییە لە ڕاستیدا قوتابییان لە قۆناغی سەرەتاییەوە تاوەکوو زانکۆ دەکەونە ژێر هەژموونی ئەو پرۆگرامانەوە کە لە قۆناغەکانی خوێندندا لە سەری پەروەردە کراون."[١]

## ٣- ئەفسانەی جێگیرکردنی سروشتی مرۆیی:

لەم بابەتەدا دکتۆر «هربت» تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە چۆن خاوەن دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن مەبەست پێ سیاسییەکانە، چەندین تاوان و کوشتن

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ١٧.

ئەنجام دەدەن، دواتر بە شێوەیەکی بێ باکانە لە سەر کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەیخەنە ڕوو، بە بیانووی ئەوەی مرۆڤ خاوەنی سروشتێکی نەگۆڕە و قابیلی دەرکپێکردنی تەواوی ڕووداوەکان نییە، بە شێوەیەکی دروست تاوەکوو ئەوەی بە شێوەیەکی لاواز و تێکشکاو بمێنێتەوە.[1]

### ٤- خەفەکردن و ونکردنی کێشەکانی کۆمەڵگە:

دکتۆر «هربرت» لە سەروبەندی تیشک خستنە سەر ئەم خاڵە ناوبراو باس لە دەوری کاریگەری میدیا و دامەزراوە ڕاگەیاندنەکان دەکات لە ونکردن و شاردنەوەی کێشە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی نێو کۆمەڵگە و نیشاندانیان وەک بابەتێکی بچووک و لاوەکی بە شێوەیەک کە جێگەی گفتوگۆکردن نییە. ئەو کات دۆخێک دێتە پێش کە خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی سەرقاڵی بابەت لاوەکییەکان دەبن و جەوهەری کێشە سەرەکییەکانیان لە بیر دەچێتەوە، لەم نێوەندەدا دەسەڵات بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت، بابەتەکان ئاڕاستە دەکات ئیتر شتێک نامێنێتەوە بە ناوی نەیاری دەسەڵات.

### ٥ - فرەیی ڕاگەیاندن:

لە چوارچێوەی ئەم بابەتە دکتۆر «هربرت» تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە چۆن زۆریی ڕاگەیاندن و دامەزراوە میدیاییەکان هۆکارێکە بۆ نەمانی متمانە لەنێوان چین و توێژەکانی خەڵکی، بە تایبەتی نەمانی متمانە بە نەیارانی دەسەڵات، تاوەکوو ئەوەی ڕاگەیاندن نەبێتە کەرەستەیەک لەپێناو دروستبوونی گۆڕانکاری. بەو پێیەی بوونی فرەیی ڕاگەیاندن و دامەزراوە میدیاییەکان،

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٢٤.

هۆکاری بەردەوامبوونی دەسەڵاتە ستەمکارەکانە، ئەمەش لە ڕوانگەی ئەدەبیاتی گشتیی (فرق تسد) پەرتکە و سەرۆک بە بەرجەستە دەکرێت.

هەر لەم ڕوانگەیەوە نووسەری بەناوبانگی فەڕەنسی «جان نوێل کابفیریر» یەکێک لە دیارترین پسپۆڕانی ڕاگەیاندنی بازرگانی و پسپۆڕی بواری دەروونناسی لە ژێر ناوی (الشائعات الوسیلة الاعلامیة الأقدم في العالم) (rumeurs le plus vlix media du monde)[1] تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە چۆن دامەزراوە ڕاگەیاندنەکان و کەرەستە میدیاییەکان پڕوپاگەندە بەرهەم دەهێنن، بە شێوەیەک کاریگەریی بەرچاو لەسەر بیرکردنەوەی بینەران و بیسەران دروست دەکات، بە چ شێوەیەک کاریگەریی ئەرێنی لە سەر دۆخی سایکۆلۆژی و دارایی و تاک دروست دەکات. پاشان لە کۆتاییدا باس لە چۆنیەتیی خۆگرتن و خۆپاراستن دەکات لە پێشەکیی پەرتووکەکەیدا دەڵێت: "لە ساڵی ١٩٨١ کۆمپانیای practer adnd gambie کە یەکێکە لە کۆمپانیا گەورەکانی ئەمەریکا، هەزاران پەیوەندیی تەلەفۆنیی پێوە کراوە بەوەی گوایە ئەم کۆمپانیایە پەیوەندیی لەگەڵ شەیتان هەیە، تا وای لێ هات لۆگۆ و ڕەمزی کۆمپانیاکەی گۆڕی." پاشان دەڵێت: "لە ساڵی ١٩٦٦ یەکێک لە فرۆشگا گەورەکانی شاری (ڕوان) لە باکووری فەڕەنسا دووچاری هێرشێکی پڕوپاگەندەی کوێرانە هات، بە شێوەیەک لە کۆتاییدا ناچار بوون فرۆشگاکە دابخەن و بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەیش ناچار سەری خۆی هەڵگرت. دواتر تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە چۆن سیاسییەکان لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەوە هەوڵی چەسپاندنی پێگەی سیاسی و ئابووریی خۆیان دەدەن، لە بەرانبەریشدا هەوڵی تێکشکاندنی نەیارەکانیان دەدەن و لە ڕێیەوە ڕاستییەکان ئاوەژوو دەکەن و دەڵێت: "ئەوەی جێگەی باسە لە ڕووی داراییەوە ئەم جۆرە پڕوپاگەندانە تێچوویەکی ئەوتۆیان نییە، چەکێکی

---

(١) تانیا ناجیا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی... دار الساق بیروت لبنان ٢٠٠٧.

بێ ماڵە و هێندەی ملیۆنان فرانکی فەڕەنسی کاریگەریی هەیە کە لە ڕیکلامە سیاسییەکاندا بە خەرج دەدرێت."[١]

ڕاگەیاندن لە سەرانسەری جیهاندا چەندین کەرەستەی جۆراوجۆر لەپێناوی پێکانی ئامانجەکانیان دەخەنە گەڕ، بە جۆرێک بەشێکی هەرە زۆری خەڵکی بەشێوەیەکی سەرپێیی لە بابەتەکە تێ دەگەن. هەست بەو ئامانجە شاراوەیە ناکەن کە خودی ڕاگەیاندنەکە کاری لە سەر دەکات بە تایبەتی کۆمەڵگە سادە و نارۆشنبیرەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، لە سەرووی هەموویانەوە کۆمەڵگەی کوردی. لە چوارچێوەی تیشکخستنەسەر ئەم بابەتە، خاوەنی پەرتووکی (التربية الاعلامية)[٢] لە بەشێکی تایبەتی پەرتووکەکەیدا نووسیوویەتی بە ناوی (التضليل الإعلامي) گومڕاکردن و سەرلێشێواویی ڕاگەیاندن لەم بەشەدا بە جوانیی جۆرەکانی چەواشەکاریی ڕاگەیاندن دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوەیان بۆ دەکات، ئێمەیش لێرەدا چەندین شێوەی ئەم چەواشەکارییە بە ڕیزبەندی و نموونەوە دەخەینە ڕوو.

١- تیشکخستنەسەر چەند ڕاستییەکی کەم و شاردنەوەی ژمارەیەکی زۆری ڕاستی. بێگومان ئەم ڕێتمە لە زۆرێک لە دامەزراوە جیهانییەکان[؟] پەیڕەوی لێ دەکرێت، ڕاگەیاندنەکان وەک تاکتیک بەشێک لە ڕاستییەکان دەخەنە ڕوو، تاوەکوو ئەوەی جۆرێک لە متمانە بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن. دواتر لە پاڵ ئەم متمانەیەدا تەواوی ئامانجەکانی خۆیان دەپێکن. بۆ نموونە کاتێک ڕووداوێکی نەخوزراوی تەقینەوە یاخود هەر تاوانێک ڕوو دەدات، ئەنجامدەر ئەگەر هەڵگری ڕەگەزنامەی وڵاتێکی عەرەبی بێت ڕاستەوخۆ ئەو تۆمەتە دەخرێتە پاڵ موسڵمانان، دەکرێت هەر کەس هەڵگری ڕەگەزنامەی وڵاتێکی

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٥٦.

(٢) بڕوانە: التربية الاعلامية كيف نتعامل مع الإعلام: فهد بن عبدالرحمن الشميري، مكتبة الملك الفهد الوطنية رياض ١٤٣١. ٢٠١٠، ص ١٠٥.

موسڵماننشین یاخود عەرەبی بوو، ئیتر بە موسڵمان هەژمار بکرێت و ڕاستەوخۆ تاوانەکەی دەخرێتە ملی ئیسلام. ئەمە لە کاتێکدایە ئەو پرسیارە دەخەینە ڕوو، مەرجە هەر کەس عەرەب بوو موسڵمان بێت زیاد لەمە هەر کاتێک موسڵمانێک کارێکی ئەنجام دا. واتای ئەوەیە ئیسلام فەرمانی پێ کردووە و پاڵنەرێکی قورئانیی لە پشتەوەیە. لە دۆخێکی لەم شێوەیەدا تەواوی دەزگا و ناوەندەکانی ڕاگەیاندن بەو شێوەیەی خۆیان دەیانەوێت ئاراستەی دەکەن.

**٢- یاریکردن بە زانیارییەکان:**

یەکێک لەو کەرەستانەی کە ناوەند و دەزگا میدیبیەکان کاری لە سەر دەکەن، بریتییە لە یاریکردن بە زانیاری و ڕووداوەکان، بە شێوەیەک ئەوەی ڕوو دەدات لەلایەن دەزگا ڕاگەیاندنەکانەوە یاریی پێ دەکرێت، بە شێوەیەک کە زانیارییە بەردەستەکان لەگەڵ خودی ئەو ڕووداو و زانیارییە ڕاستەقینەکان یەک ناگرێتەوە. بۆ نموونە، لە دۆخێکی مەزنی وەک بەهاری عەرەبی کە بە یەکێک لە ڕووداوە سیاسییە کاریگەرەکانی سەدە هەژمار دەکرێت، ناوەندەکانی میدیای خۆرئاواییەکان دەیانەوێت پاڵنەرەکانی ئەم ڕووداوە بە شێوەیەکی ڕەها ببەستنەوە بە پاڵنەری ئابوورییەوە، گوایە هاوڵاتییان وڵاتانی عەرەبی تەنیا لەپێناو دۆخێکی دارایی باشتر بۆ ئەوەی لە ڕووی خۆشگوزەرانییەوە وڵاتەکانیان وەکوو ئەورووپای لێ بێت، ئەم جووڵانەوەیان ئەنجام داوە. لە ڕاستیدا دەکرێت ئەمە یەکێک بێت لە پاڵنەرەکانی پشتی بەهاری عەرەبی، بەڵام ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی پاڵنەرەکانی تری وەک نەبوونی ئازادیی ئایینی و سیاسی و بەرجەستەکردنی ئازادییە ئایینییەکان و بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی و داتەپینی دۆخی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی عەرەبی و ئیسلامییەکان پشتگوێ دەخەن، لە بەرانبەردا ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی دەیەوێت ئەو پەیامە بە بینەران و بیسەران و خوێنەرانی خۆی لە خۆرئاوا بگەیەنێت کە گوایە دانیشتوانی وڵاتانی عەرەبی وەک کاردانەوەیەک لە بەرانبەر کۆتوبەندە ئایینی و ستەمی ئایینیی

وڵاتەکەیان ڕاپەڕینی جەماوەرییان ئەنجام داوە.

٣- شێواندنی دۆخەکان و ڕووداوەکان بە هۆی پشتگوێخستنی ڕووداوەکان، تاوەکوو ئەوەی ڕووداوەکان بە شێوەیەک بچێتە پێشچاوی خوێنەر کە نەتوانێت بە دروستی تێی بگات. وەک ئەوەی لە ئێستا لە هەواڵەکانی پەیوەست بە جیهانی ئیسلامی و زوڵم و زۆری سەر شانی موسڵمانانەدا ڕوو دەدات. هەواڵەکانی پەیوەست بە بارودۆخی موسڵمانان لە سەرانسەری جیهاندا بە مەبەست خەفە دەکرێن، یاخود وەک هەواڵێکی سەرپێیی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، یاخود هەندێک جار هەوڵ دەدەن ستەمی سەر شانی موسڵمان لە سەرانسەری دونیا بە هۆی جیاوازیی نەتەوەیی و زمانی و جوگرافییەوە بناسێنن، تاوەکوو ئەوەی ئیسلام وەک ئایینێکی ستەملێکراو و موسڵمانان وەک ستەملێکراو بە هۆی ئایینەکەیانەوە لە سەرانسەری جیهاندا نەناسرێن.

٤- هەوڵی تێکەڵکردنی هەواڵەکان و لەگەڵ یەکتر و تێهەڵکێشکردنی هەواڵەکان لەگەڵ شرۆڤەکانی پەیوەست بە هەواڵەکە. بە شێوەیەک بینەر و بیسەر و خوێنەری هەواڵ، شرۆڤەکانی پەیوەست بە هەواڵەکەوە وەک بەشێک لە خودی هەواڵەکە دەبینێت. بۆ نموونە لە هەواڵەکانی پەیوەست بە دۆخی ئافرەتان، لێدان و سوکایەتیکردن و کوشتن، کاتێک بابەتێکی لەم شێوەیە دەخرێتە ڕوو. دواتر خەڵکانێکی ئایدیۆلۆژی لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیای خۆیانەوە، خوێندنەوەی جۆراوجۆر بۆ ئەم ڕووداوە دەکەن، بە شێوەیەک کە بینەر و بیسەر و خوێنەر ئەم شرۆڤە و شیکارییە ئایدیۆلۆژییانە وەک بەشێک لە خودی هەواڵەکە تێ دەگەن. لە کۆتاییدا ئامانجەکە دێتە دی کە خۆی لە تاوانبارکردنی ئیسلام وەک ئایین و موسڵمان وەک شوێنکەوتوانی ئایینەکە دەبینێتەوە و دەیانەوێت ئەو پەیامە بگەیەنن کە ئیسلام پاڵنەری ئەم ڕووداو و تاوانەیە.

٥- وروژاندنی ئەو زانیاریيانەی کە دوور و نزیک پەیوەندییان بە هەواڵ و ڕووداوەکەوە نییە.

ئەم جۆرە لە چەواشەکاریی میدیایی زیاتر لەلایەن سیاسەتمەدار و حوکمڕانەکانەوە بەکاردێت کە خۆی لە تێهەڵکێشکردنی ڕووداوەکە بە ڕووداوێکی تر دەبینێتەوە. لەوانەش لە سەروبەندی چالاکییەکی زانستی و داهێنان لەلایەن داهێنەرێکەوە، یاخود زانایەکەوە ڕاستەوخۆ یاسایەکی دەوڵەت یاخود وێنەی سەرۆکی دەوڵەت یاخود سەرۆک وەزیران ئاوێتەی نێو هەواڵەکە دەکەن، تاوەکوو ئەوەی خوێنەر وا تێ بگات دەرئەنجامی ئەم دۆزینەوە و داهێنانە زانستییە، بە هۆی یاسای دەوڵەت و یاخود بە هۆی سەرۆک کۆمار، یاخود سەرۆک وەزیرانەوەیە. تاوەکوو هەمووان تێ بگەن لەوەی کە ئەم پێشکەوتنە بەرئەنجامی سیاسەتی دروست و حەکیمانەی سیاسەتمەدارانی وڵاتە.

٦- زەقکردنەوەی ناونیشانی لاوەکیی نێو هەواڵەکە: یەکێک لەو کەرەستانەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن کاری لە سەر دەکەن بریتییە لە چەواشەکردنی خوێنەر، ئەویش لە ڕێی زەقکردن و گەورەکردنی بابەتێکی لاوەکیی نێو هەواڵەکە، بە شێوەیەک کە لەگەڵ جەوهەری هەواڵەکە یەک ناگرێتەوە. ئەم جۆرە چەواشەکردنە بە شێوەیەکی بەرچاو لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لە نموونەی فیسبووک و تویتەر و یووتیووب پێش چاو دەکەوێت.

٧- زەقکردنەوەی وشەیەک یاخود بڕگەیەکی نێو هەواڵەکە: ئەم بابەتە لە جیهاندا زۆرترین جار بە کار دەهێنرێت، واتای بەکارهێنانی بڕگەیەک یاخود وشەی نێو هەواڵێک، یاخود چاوپێکەوتنی کەسایەتییەک بە شێوەیەک ئەم دەربڕینە بیسەر و بینەر و خوێنەر جۆرێک لە بڕیاری ئەرێنی یاخود نەرێنیی لا گەڵاڵە دەبێت. بۆ نموونە لە بۆنەکانی لەدایکبوونی پەیامبەر یاخود کۆچی پەیامبەر(ﷺ) بۆ مەدینە، یاخود لە جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزاندا، ڕاگەیاندنەکان هەواڵەکە

بەم شێوەیە دەخەنە ڕوو (ئەمڕۆ یادی کۆچی پەیامبەری ئیسلامە(ﷺ) بۆ مەدینە... ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی پەیامبەری ئیسلامە، سبەی جەژنی ڕەمەزانە کە تێیدا موسڵمانان ئاهەنگ و خۆشی دەگێڕن) وەک ئەوەی پەیامبەر(ﷺ) و جەژنە ئایینییەکان دوور و نزیک پەیوەندیی بەوانە بێت، یاخود ئەوەی موسڵمانان کەمینەیەکی کەم بن لە نێو جەماوەری کۆمەڵگەی کوردی. بە شێوەیەک هەواڵ و بۆنە و پیرۆزیی موسڵمانان دەخرێتە پێشچاو، وەک ئەوەی باس لە کەمینەیەکی وەک ئێزدییەکان بکرێت، بگرە لەوەیش کەمتر. ئەمە خووی نەیارانی ئایدیۆلۆژییە، ئەوان هەمیشە بە جۆرێک لە گاڵتە و بچووکردنەوە باس لە نەیارەکانیان دەکەن، هەر وەک چۆن بەرپرسانی سەردەمی ئیبراهیم کاتێک ناوی ئیبراهیمیان دەهێنا، بە جۆرێک لە بچووکی و گاڵتەجارییەوە باسیان لێوە دەکرد وتیان : ﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ۝﴾ [الأنبياء: ٦٠]، «گوێبیستی هەرزەکارێک بووین پێیان دەوت ئیبراهیم، باسی خواکانی ئێمەی بە خراپە دەکرد.»

کەواتە ئەم جۆرە لە مامەڵەکردنە سایکۆلۆژیای ئاسایی بێباوەڕانە. هەمیشە بەو شێوەیە گوزارشت لە نەیارەکانی خۆیان دەکەن، هەر بەم شێوەیە ڕاگەیاندنەکانی بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئیسلامی و ڕاگەیاندنی کوردیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لە ڕاگەیاندنی ناوچەکە بە هەمان شێوە مامەڵە دەکات، بەڵام لەو بابەتانەی کە دوور و نزیک پەیوەندیی بە پێکهاتەی زۆرینە موسڵمانی کوردەوە نییە، بابەتەکە بە شێوەیەکی تر دەخرێتە ڕوو. بۆ نموونە کاتێک باس لە شەوی سەری ساڵ دەکرێت دەگوترێت جەژنی سەری ساڵی تازەیە و تەواوی جیهانی خۆی بۆ هاتنی ئەم جەژنە ئامادە کردووە.

٨- چەواشکردنی ڕای گشتی لە ڕێی شاردنەوەی سەرچاوەی هەواڵەکە، تاوەکوو ئەوەی جۆرێک لە سەرلێشێواندن و بێمتمانەیی لای هاوڵاتی دروست بکات لە گەیاندنی زانیارییەکان. بۆ نموونە لە سەروبەندی بڵاوکردنەوەی

پڕوپاگەندەیەک یاخود هەواڵێکدا، دەوترێت سەرچاوەیەکی هەواڵ ڕایگەیاند، یان سەرچاوەیەک کە نەی ویست ناوی ئاشکرا بکرێت. زۆربەی جار ئەم جۆرە هەواڵانە ناڕاستن و دوورن لە ڕاستییەوە، لە ئێستادا لە ڕاگەیاندنەکانی جیهانی عەرەبیدا ئەم سیاسەتە پەیڕەوی لێ دەکرێت. لەوەیش مەترسیدارتر ئەوەیە نارەوشتیی ڕاگەیاندن دەگاتە ئاستێک کە دەسەڵاتی پشت میدیا تەواوی مەترسی و کارەسات و شەڕ و ئاشووبەکان لە سەرانسەری دونیادا دەدەنە پاڵ نەیارەکانیان، بە شێوەیەک گەر لەوپەڕی جیهان کێشەیەک، کارەساتێک ڕوو بدات، ڕاستەوخۆ دەیدەنە پاڵ نەیارە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانیان لە وڵاتی خۆیان. نارەوشتیی میدیایی لە ئاستێکدایە ڕاگەیاندنی میسری جووڵانەوەی هێلەک زەردەکانی فەرەنسای خستە ئەستۆی کۆمەڵەی برایانی موسڵمان!

٩- کورتکردنەوەی بابەتێک لەنێوان دوو بۆچوون و ڕێگە نەدان بە خستنەڕووی خوێندنەوەی تر. ئەم جۆرە لە خستنەڕووی بابەتەکان بەم شێوەیە لەلایەن زۆرێک لە نووسەران و ناوەندە میدیاییەکانەوە کاری لە سەر کراوە. تێیدا بە شێوەیەکی چەقبەستوو بابەتەکان لەنێوان دوو بابەتدا دەخرێنە ڕوو، بە جۆرێک دەرفەت نامێنێتەوە بۆ بۆچوونی زیاتر و ئەگەری خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی زیاتر. ئەم جۆرە لە چەواشەکارییە میدیاییە ترسناکترین کەرەستەی مەترسییە لە سەر ئیسلام کە لە تەواوی ڕاگەیاندنە نەیارە خۆرئاوایی و عەرەبییەکاندا کاری لە سەر دەکرێت. لە نموونەی خستنەڕووی بابەتێکی ئایینیی هەستیار و بانگهێشتکردنی دوو بانگخواز، یاخود دوو کەسایەتیی موسڵمانی نزیک لە بابەتەکە، یەکیان پەڕگیر و ئەوی تریان شلگیر، بەرئەنجامی ئەم گفتوگۆیە نەبوونی بۆچوونی سێیەم و زیاتر جۆرێک لە بێ متمانەیی و ئاڵۆزیی لای بینەر دروست دەکات. ئەمە لە کاتێکدا ڕاستیی بابەتەکە نە بۆچوونی یەکەمە نە بۆچوونی دووەم و تەواوی بۆچوونەکانی تر لە نێوەندی ئەم بۆچوونە پەڕگیر و شێلگیرەدا ون دەبێت و خەڵکی لە بارەیانەوە بێئاگا

دەمێننەوە. هەر لەم چوارچێوەیەدا جۆرێکی تر لە چەواشکاری میدیایی بەرانبەر بە ئیسلام دەگیرێتە بەر، بەو شێوەی پرسیارێک ئیسلام دەخاتە نێوانی دوو پرسیارەوە کە هەر دووکیان بە تەواوی هەڵەن. بۆ نموونە دەپرسن ئایا خۆشەویستی لە ئیسلامدا حەڵاڵە یاخود حەرام؟ یاخود پرسیاری ئەوە دەکرێت ئیسلام ئایینیەکانی تری قەبووڵە یاخود نا؟ یاخود پرسیار دەکرێت کەنیزەک لە ئیسلامدا بوونی هەبووە یاخود نا؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری تر کە لە بنەڕەتدا خودی پرسیارەکان هەڵەن و پێویستیان بە ڕاستکردنەوە و داڕشتنەوە هەیە. بە پێچەوانەوە کەسی وەڵامدەر دەکەوێتە هەڵەوە، کەناڵەکان و دامەزراوە میدییەکان ئەم جۆرە پرسیارانە دەکەن بە مانشێتی میدیاییی سەرنجڕاکێش بە شێوەیەک کە سەرنجی خوێنەر و بیسەر بە لای خۆیاندا ڕادەکێشێت.

١٠- خستنەڕوو و زەقکردنەوەی چەند بابەتێکی لاوەکی و پشتکردن لە بابەتە گرنگ و جێسەرنجەکانی پەیوەست بە بیروباوەڕ و ژیانی خەڵکییەوە. ئەم جۆرە لە مامەڵەکردن لە جیهانی ڕاگەیاندنی ئەمڕۆدا بە شێوەیەکی چڕ کاری لە سەر دەکرێت. بۆ نموونە بەشێکی زۆر لە ناوەندەکانی ڕاگەیاندن و دەزگا میدیاییەکان فۆکەسێکی فراوان دەخەنە سەر تێچووی گەشتی حەج و عەمرەی موسڵمانان، وەک هۆکاری دروستبوونی هەژاری و بردنەدەرەوەی پارە و سەرمایەی وڵات دەیناسێنن. لەم چوارچێوەیەدا چەندین بەرنامەی جۆراوجۆر ڕێک دەخەن لە سەر ئەم تێچوە کەمە، لە کاتێکدا دزینی داهات و سەروەتی میللەت پشتگوێ دەخەن و دوور و نزیک باس لە ملیۆنان دۆلاری تێچووی فیلم و دراما تەلەفزیۆنییەکان ناکەن.

١١- خستنەڕووی ژمارەیەکی زۆر زانیاریی جۆراوجۆر بە شێوەیەکی فراوان. لە دۆخێکی وا دا بینەر و بیسەر دووچاری ئاڵۆزی دێن لە بەرانبەر ئەو ژمارە زۆرەی زانیاری و ناتوانن لەهەمبەر هەڵسەنگاندن و لێکجیاکردنەوە و دابەشکردنیان بڕیار بدەن. لە کۆتاییدا هزری خوێنەر دووچاری جۆرێک لە ئاڵۆزی دێت کە

ناتوانێت لەم ژمارە زۆرەی هەواڵ هیچ بۆ خۆی دەستەبەر بکات. ئەم جۆرە لە چەواشەکارییە میدیایە زیاتر لە کاتی ڕوودانی ئابڕووچوونێکی سیاسی یاخود ئابڕووچوونێکی ڕەوشتیی سیاسییەکان زیاتر کاری لە سەر دەکرێت، لە نموونەی ئەم بابەتە کاتێک ئابڕووچوونێکی دارایی دەسەڵاتداران ڕوو دەدات، هێند ژمارە و لێکدان و زانیاریی جیاواز لەبارەی بابەتەکە دەخەنە ڕوو کە بیسەر و بینەر و خوێنەر دوور و نزیک ئاگای لە بنەڕەتی بابەتەکە نامێنێت.

١٢- گەورەکردنی ڕووداو و پێشهاتە بچووکەکان. ئەم جۆرە لە چەواشەکاری لە سەرانسەری جیهاندا بە شێوەیەکی فراوان کاری پێ دەکرێت و پەیڕەویی لێ دەکرێت، بە تایبەتی لە بابەتەکانی پەیوەست بە ئیسلام و دۆخی موسڵمانانەوە. گەر بێتوو موسڵمانێک هەڵەیەک بکات یاخود لە وڵاتانی خۆرئاوای تاوانێک ئەنجام بدات، دەبینین تەواوی ڕاگەیاندنە جیهانییەکان فۆکەس دەخەنە سەر ئەم ڕووداوە و پەخشی ڕاستەوخۆی دەخەنە خزمەت و سەدان لێدوانی جۆراوجۆری لەبارەوە دەخەنە ڕوو. ئەمە لە کاتێکدا گەر بێتوو موسڵمانان دووچاری هەر تیرۆر و کوشتوبڕ و تراژیدیایەک ببنەوە، لە هەر جێگەیەکی دونیا دامەزراوە میدیاییەکان یان ئەوەتا باسی ناکەن، یاخود تەنیا وەک سەرەقەڵەمێک و ڕووداوێکی سادە باسی لێوە دەکەن.

١٣- کەمکردنەوەی نرخی هەواڵ و ڕووداوەکان. دەزگا میدییەکان ڕاهاتوون لە سەر ئەوەی کە نرخی ئەو هەواڵانە کەم بکەنەوە کە لە بنەڕەتدا گرنگییەکی بەرچاویان هەیە، بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان لە بەرژەوەندیی ئەجێندای سیاسیی پشت دەزگا میدیاییەکان نییە.

١٤- هەڵگێڕانەوەی واقیع و ڕووداوە ڕاستییەکان بە ئاڕاستەیەکی تەواو پێچەوانە. لە دۆخێکی لەم شێوەیەدا بە هۆی هەڵگێڕانەوەی هەواڵەکان تەواوی ڕاستییەکان ئاوەژوو دەبنەوە، بە شێوەیەک تاوانبار بە بێتاوان و بێتاوانیش

بە تاوانبار دەناسێنێت. لە نموونەی دۆخی ئێستای کورد و خۆرئاوا. دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی، کوردستان وەک بەشێک لە میراتی دەوڵەتی عوسمانی کەوتە ژێر دەستی ئیمپریالیستی خۆرئاوایی و بە شێوەیەک کە خۆیان ویستیان دابەشیان کرد. دواتر لە ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆ سنووری نوێی نێوان وڵاتانی ناوچەکە کێشرا و خاکی کوردستان دابەش کرا بە سەر چوار وڵاتی ناوچەکەدا. کەچی بە پێچەوانەوە عالەمانییەکانی کوردستان تەواوی نەهامەتییەکانی کورد دەخەنە ئەستۆی ئیسلام. ئایا ئیسلام بەرپرسیارە بەرانبەر نەهامەتییەکانی نەتەوەی کورد، یاخود عالەمانییە خۆرئاواییەکان؟ ئیتر ئەم هێرشە ناڕەوایە بۆ سەر ئیسلام بۆ؟ لەوەش زیاتر تەواوی کەلتوور و سیاسەت و ئابووریی ئەورووپا و خۆرئاوای دابەشکاری کورد لە سەروو هەموویانەوە بەریتانیا پیرۆز دەکەن و تەواوی نەهامەتی و دواکەوتووییەکان دەخەنە سەر ئەستۆی موسڵمانان. بە پێچەوانەوە ئەوە ئیسلام بوو مەترسیی بەریەککەوتنی بەردەوامی فارس و ڕۆمەکانی لە سەر زەویی کوردستان دوور خستەوە و سەرکەوتوو بوو لەوەی کورد لە میللەتێکی ژێردەستەوە بکاتە میللەتێکی خاوەن شوناس. دواتریش سەرکردە ئیسلامییەکانی پێش سەدەی نۆزدەهەم، دەورێکی کاریگەرییان هەبوو لە پاراستنی شوناسی کورد، کەچی بە پێچەوانەوە عالەملنییەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی لە ناو ئەوانیشدا، عالەمانییە کوردەکان هەمیشە بە چاوی گەورەیی و پیرۆزییەوە لە خۆرئاواییەکان دەڕوانن و بە چاوی دوژمن و نەیاریشەوە لە ئیسلام و موسڵمانان دەڕوانن.

١٥- بەکارهێنانی چەمک و زاراوە سیاسییەکان بە مەبەستێکی نادروست. لە دونیای میدیایی جیهانیدا، ناوەندە میدیاییەکان چەمکێکی یاخود زاراوەیەک دەخەنە نێو ئەدەبیاتی خۆیانەوە کە مەبەستێکی دیاریکراویان هەیە لە بەکارهێنانی ئەو چەمکەدا، بۆ نموونە بەکارهێنانی زاراوەی تیرۆریست لە فەرهەنگی میدیاییی نوێدا بە شێوەیەک هەمیشە بیسەران و بینەران و خوێنەران هۆشیان

دەچێت بە لای موسڵماندا، واتای ئەوەی چەمکی تیرۆریست هاوتەریبە لەگەڵ ناوی موسڵمان. وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا ئەم زاراوەیەیان وەک شوناس بۆ موسڵمانان داتاشیوە. بەرئەنجام بەکارهێنانی ئەم وشەیە مەبەست لێی موسڵمانە و تاوانبارکردنی موسڵمانانە. بەرمەبنای ئەم تێگەیشتنە هیچ کات نابینین لە میدیا جیهانییەکاندا تیرۆر ببەسترێتەوە بە ئایینی مەسیحییەوە، یاخود جوولەکە و تیرۆر ناویان لە پاڵ یەکدا بخرێتە ڕوو.

١٦- بەکارهێنانی چەمک و زاراوەکان لە سیاقێکی هەڵە و ناپێویستدان. ئەم جۆرە چەمک و زاراوانە لە بنەڕەتدا کۆمەڵێک چەمک و زاراوەی جێگیرن، بەڵام زۆر جار لە سیاقێکی هەڵەدا بە کار دەهێنرێت کە پەیوەندییان بەو چەمک و زاراوەیە نییە، بە مەبەستی چەواشەکردن بەو شێوەیە بە کار دێن، وەک دوورخستنەوەی چەمکی ئازادی لە واتا و مەبەستە ڕاستەقینەکەی و بەکارهێنانی وەک جێگرەوی بێسنووری سێکسی و بەدڕەوشتی و تەواوی لادانە باوەکانی نێو کۆمەڵگە. لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکانی نەیاری دەوڵەت و دەسەڵات وەک کەرەستەیەک بە تەنیا بۆ ئازادیی ڕادەربڕین و بە ئازادیی قسەکردنی خۆیان دەخەنە پێشچاو و ئیسلامخوازانیش ئەم چەمکە بە بەرجەستەکردنی ئازادیی سرووتە ئایینییەکانیان پێناس دەکەن.

١٧- خستنەڕووی ژمارە و داتای ساختە. ئەم جۆرە لە چەواشەکاری یەکێکە لەو چەواشەکارییانەی کە دەزگا و ناوەندە میدیاییەکان لە سەرانسەری جیهاندا بە مەبەستی ئامانجی تایبەتی خۆیان پەیڕەوی لێ دەکەن و زۆر پەرەی پێ دراوە لە سەرانسەری جیهاندا. ئەمەش وەک کەرەستەیەک لەپێناو لێدان و لاوازکردنی نەیارانی پشت دەزگا میدیاییەکان، لە نموونەی ئەم بابەتە گوایە دەوترێت داتایەکی نوێ پێمان دەڵێت: ڕێژەی ئەوەندەی تاوان لە سەرانسەری جیهاندا لەلایەن موسڵمانانەوە ئەنجام دەدرێن، یاخود داتاکان پێمان دەڵێن: لە سەداپەنجای ئافرەتانی موسڵمان لە فلان ناوچە پێش تەمەنی ١٨ساڵی بە شوو

دەدرێن، یاخود لە سەدانەوەتی ئافرەتانی موسڵمان دووچاری سترێسی دەروونی هاتوون لە ماڵەوە و دەیانەوێت لە دەرەوەی ماڵەکانیان کار بکەن ...هتد. بەم شێوەیە داتا و سەرژمێرییەکان بە شێوەیەکی زەق نیشان دەدەن و ناسروشتییانە گەورەیان دەکەن، زۆربەی ئەو داتا و سەرژمێرییانەی کە بە شێوەیەکی نەرێنی بە سەر ئیسلام و موسڵماناندا دەشکێنەوە زەق دەکرێنەوە و بڵاو دەکرێنەوە، بە پێچەوانەوە داتا ئەرێنییەکان هیچ کات دوور و نزیک باسیان لێوە ناکرێت و بە شێوەیەکی مەترسیدار خەفە دەکرێن.

١٨- هەڵبژاردنی وێنەی کەسایەتییەک لە ڕوانگەیەکی دیاریکراوەوە و پاشان خستنەڕووی تایتڵێکی هەواڵی بە شێوەیەک دواتر خوێنەر یا بیسەر بەهۆی وێنە و تایتڵەکەوە جۆرێک لە تێکەڵیی بۆ دروست دەبێت. ئەم جۆرە چەواشەکارییە زیاتر بەرانبەر کەسایەتی و بانگخوازە ئیسلامییەکان بەکاردێت، بۆ نموونە هەر لەگەڵ باسکردنی ڕێکخراوێکی وەک داعش، ڕاستەوخۆ لە تەنیشتییەوە ئاڵای (لا اله الا الله) دەخرێتە پاڵی، تاوەکوو ئەوەی ئەو بیرکردنەوەیە لای بیسەر و بینەر و خوێنەر دروست ببێت کە هەر کەس پەرچەمی (لا اله الا الله)ی کردە شیعار و پرۆگرامی خۆی ئەوا کار و کردەوە و بیرکردنەوەی وەک داعشە. دواتریش وێنای تر بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە لە پاڵ مانشێتێکی سەرکوتکردن و بەکۆیلەکردندا، وێنای ئافرەتێکی باڵاپۆش یاخود گەنجێکی ڕیشدار نمایش دەکەن بە مەبەستی نمایشکردنی ئەوەی کە ڕیش و باڵاپۆشی ڕەمزی سەرکوتکردن و کۆیلایەتین و بە پێچەوانەوە سفوور و ڕووتی ئاماژەن بۆ ژیانی ئازادی پڕ بەختەوەری.

١٩- چەواشەکاری لە ڕێی دروستکردنی کاریکاتێری سیاسی و کۆمەڵایەتی بە شێوەیەک کە خەڵکی وا تێ بگەن، ئەمە تەنیا بۆ جۆرێک لە پێکەنینە. ئەمە لە حاڵێکدا لە دۆخی پشتەوەی ئەم بابەتە جۆرێک لە نهێنیی گەورەی تێدایە و خزاندنی بانگخوازان و مامۆستایانی ئایینی بۆ نێو ئەم بابەتانە، لە نموونەی

تێکەڵکردنی وێنەی کارەکتەرێکی بانگخواز و لە کاتی کاری بانگەواز و تێکەڵکردنی لەگەڵ وێنەیەک لە کاتی ئاساییی خۆی، کێشانی وێنەی نوێژخوێنان لە کاتی نوێژ و نیشاندانی ئەم نوێژخوێنانە لە دەرەوەی مزگەوت لەپێناو ئەوەی جۆرێک لە وێنای ئاڵۆز و شێواوی نوێژخوێنان بخەنە ڕوو.

٢٠- چەواشەکاریی لە ڕێی دەستنیشانکردنی کەسێکی نەخوێندەوار و بێئاگا بە مەبەستی قسەکردن لە سەر بابەتێکی گەورە و گرنگ. ئەمەیش لەپێناوی بێنرخکردن و کەمکردنەوەی بەهای ئەو بابەتە گرنگەی کە قسەی لە بارەوە دەکرێت، لەوەیش زیاتر هەڵبژاردنی هەندێک کەسایەتی و کارەکتەر لەپێناوی قسەکردن و گفتوگۆکردن لەبارەی بابەتێکەوە کە دوور و نزیک کارەکتەرەکان پەیوەندییان بەو بابەتەوە نییە. هەندێک جار مامۆستایانی ئایینی دەخزێنە نێو ئەم بابەتانەوە لەو چوارچێوەیەدا زۆر جار بەشێک لە مامۆستایانی ئاییني بێئاگا و کەم شارەزا دەیانخزێنە نێو گفتوگۆ و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کەسایەتییەکی شارەزا و قسەزان لە سەر بابەتێکی هەستیاری ئیسلامی. هەندێک جار دوو مامۆستای ئایینیی جیاواز لە هەندێک بابەت دێنە بەرانبەر یەکتر لەپێناو گفتوگۆکردن لە سەر بابەتێکی جیاوازی نێوانیان، تاوەکوو ئەوەی زیاتر وێنای گفتوگۆکە قاڵ ببێتەوە، جۆرێک لە زمانی زبر و توندوتیژی بکەوێتە نێوانیان، بە شێوەیەک هەردوو کەسایەتییەکە لە ڕووی مەعنەوییە دووچاری جۆرێک لە شکان دەبن لە پێش چاوی بینەران و گوێگران. هەندێک جاری تر چەواشەکاریی میدیایی لەو ئاراستەیەوە دێت کە بەشێک لە کەناڵ و دامەزراوە میدیاییەکان مامۆستایەکی ئایینی شارەزا دەخزێنە نێو تەوەرەی بەرنامەیەکەوە کە پسپۆڕیی ئەو نییە و لە کۆتاییدا بابەتەکە لە زیانی خودی مامۆستا و موسڵمانانیش کۆتایی دێت. هەندێک جاری تر مامۆستایەکی شارەزای قسەزان بانگهێشتی بەرنامەیەک دەکرێت، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان بە پلان دەرفەتی پێویست نادرێتە ئەو مامۆستایە، تاوەکوو ئەوەی بە

شێوەیەکی دروست تێڕوانینەکانی بگەیەنێت.

٢١- چەواشەکاریی هزریی لە ڕێگەی خستنەڕووی دووبارەکردنەوەی هزر و بیرکردنەوەی هەڵە لەپێناو تۆخکردنەوە و چەسپاندنی ئەو هزرە لە عەقڵ و بیرکردنەوەی تاکی موسڵماندا. هەندێک جاری میدیا هەوڵی گەورە نیشاندانی کەسانێکی لادەر و هزرنەخۆش دەدات، تاوەکوو ڕەواجێکی گەورە بە بیرکردنەوەکانی بدرێت، بۆ ئەوەی جۆرێک گەورەکردن لە بیرکردنەوەی خەڵکیدا دروست بکەن. ئەمەیش جۆرێکە لە هەوڵدان بۆ گەوجاندن لە سەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە. ئەم فۆڕمە لە گەوجاندن زیاتر لەو وڵاتانی خۆرهەڵاتدا تۆخ دەبێتەوە. ناوەندە میدیاییەکان کار لە سەر ئەوە دەکەن کە تەواوی بابەتە دژە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی دووبارەکردنەوەی بەردەوامەوە لای تەواوی خەڵکی ئاسایی بکەنەوە، تاوەکوو لە کۆتاییدا لە ڕێی زۆر دووبارەکردنەوەوە ئاساییبوونی ئەم بابەتانە لە هزری تەواوی خەڵکیدا بچەسپێنن، ڕاگەیاندنەکان سەرکەوتوو بوون لەوەی زۆرێک لە پێوەرە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان لە نێو جەماوەر کاڵ بکەنەوە، بە جۆرێک لە کۆتاییدا وا نیشان دەدرێت کە ئەم شێوەیە لە بیرکردنەوە و مامەڵەکردنە سروشتی ئاسایی کۆمەڵگەیە، بە شێوەیەک بە ئەستەم دەتوانرێت هەست بە بابەتەکان بکرێت لە بەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- فرەڕەنگی و فرەجۆریی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن: بە ڕێگوزەرێکی خێرا بە نێو ئامێری تەلەفزیۆنەکان تێ دەگەین لەوەی کەناڵە ئاسمانییەکان جیهانێکی فراوانی سەربەخۆن بۆ خۆیان، ئەمە جگە لە تۆڕە کۆمەلایەتییەکانی فەیسبووک و تویتەر و یووتیووب، دەبینین لە سەدا حەفتای بابەتە پەخشکراوەکان بابەتی دژە ئایینی و دژە ڕەسەنایەتیی کۆمەڵایەتین. ئەم فراوانییە لە زەقکردنەوە و برەودان بە ناڕاستی و نەیاریکردنی ئیسلام جۆرێک لە بێ متمانەیی و دڵکرمۆڵیی لای لایەنگرانی حەق دروست دەکات. وەک ئەوەی «ئیبراهیمی

کوڕی ئەدهەم» دەفەرمووێت: "كثرة النظر إلى الباطل تذهب بمعرفة الحق من القلب" واتە: "زۆر ڕوانین لە باتڵ و ناڕەوا، هۆکارە بۆ دارمانی ڕاستی لە دڵدا."[١]

٢- سیحری سەرنجڕاکێشیی بابەتە میدیاییەکان: بە ڕێگوزەرێکی خێرا بە نێو بابەتە میدیاییەکاندا، دەبینین بابەتەکان بە شێوەیەک نماییش دەکرێن کە ڕاستەوخۆ سیحر لە مرۆڤ دەکەن. هەر لە داڕشتنەوەی هەواڵ و خوێندنەوە و وێنە و خستنەڕووی بابەتەکان و لێدوانی جیاواز و تەواوی تەکنیکی ڕاگەیاندنەکان بە گشتی دەبنە کەرەستەیەکی سیحراوی لە سەر عەقڵیەتی بیسەر و جۆرێک لە گومان و لای بینەر دروست دەکەن.

٣- کاردانەوەی بیسەر و بینەر لەگەڵ مادە و هەواڵە میدیاییەکان: بینەر کاتێک لە هەواڵێک یاخود پرۆگرامێکی میدیایی دەڕوانێت لە هەواڵی ئەنجامدانی تاوان یاخود هەڵەی موسڵمانێک، ئەو بیرکردنەوەیەت لا دروست دەکەن وەک ئەوەی لە سەرانسەری دونیادا هیچ هەڵە و تاوانێک ڕووی نەدابێت، هەڵە و تاوانی بابای موسڵمان نەبێت. بە شێوەیەک بینەری موسڵمان دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە هەواڵەوە، جۆرێک لە بێمتمانەیی بەرانبەر بە موسڵمان بۆ دروست دەبێت. زۆر جار لە دروستبوونی دۆخێک یاخود ڕوودانی تاوانێک یاخود کارێکی تیرۆریستی، ڕاستەوخۆ موسڵمانان تاوانبار دەکرێن. وەک کاردانەوەیەکیش ڕاستەوخۆ زۆرێک لە زانایانی ئیسلامی و ناوەندە ئیسلامییە جۆراوجۆرەکان بەیاننامەی سەرکۆنەکردن دەردەکەن، بێ ئەوەی دڵنیا بن لە ڕاستی و دروستیی ڕووداوەکە و تێوەگلانی موسڵمانان لە کارێکی لەم شێوەیە. بەشێکی بەرچاوی ئەم هەڵوێستانە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیی موسڵمانانی ترە، تاوەکوو ئەوەی هەموو لایەک دووچاری گرفت و دژواری نەیەن.

---

(١)حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، لأبي نعيم الأصفهاني رقم الحديث ١١٤٢٨، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع.

٤- ئاسانی بە دەستگەیشتن بە تەواوی بڕگە و بابەتەکانی نێو جیهانی ڕاگەیاندن بە شێوەیەک لە ئێستادا جیهان بووەتە گوندێکی بچووک، لەپاڵ ئەمەدا هەموو ئەو بابەتانەی دەبنە کەرەستەیەک بۆ تێکدانی کۆمەڵگە، بە شێوەیەکی ئاسان لە ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییە هەمەچەشنەکان بەردەستە. سایکۆلۆژیای جەماوەر وایە زووتر لەگەڵ بابەتە هاوردەکراوەکان ئاشنا دەبێت و بە چاوێکی گرنگییەوە لێیان دەڕوانێت، بە پێچەوانەی بابەتە خۆماڵییە ڕەسەنەکان، نابنە مایەی گرنگی و جێڕەزامەندیی خەڵکی.

٥- پەیوەست نەبوون و بێباکی: پابەند نەبوون بە سنووری قیەم و بەهاکانەوە یەکێک لەو دۆخە نارەوشتییانەیە کە بەشێکی زۆر لە ڕاگەیاندنەکانی پێدا گوزەر دەکات، بابەتی بێباکییە کە زۆرێکی زۆر لە ناوەندەی ڕاگەیاندنەکان لە سەرانسەری جیهاندا تێوەی گلاوە. ڕاگەیاندنی کوردیش وەک بەشێکی دانەبڕاو لەو دۆخە جیهانییە دووچاری هەمان حاڵەت بووە. بە شێوەیەک زۆر جار بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ پێوەرێکی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و پیشەیی کار لە سەر بابەتەکان دەکەن دواتر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەم بابەتانە کاریگەریی نەرێنییان لای خوێنەر و بیسەر و بینەر دروست دەکەن.

ئەم هۆکارانەی کە ئاماژەمان پێ کردن پەیوەندیی خودییان بە ڕاگەیاندنەوە هەیە. ئەمە جگە لە هۆکارە ناخودییەکانی ڕاگەیاندن، ئەوەی پەیوەندییان بە شێوازی بیرکردنەوە و سایکۆلۆژیای جەماوەری بەردەم ڕاگەیاندنەوە هەیە، بە تایبەتی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە ئارەزووی سێکسی و مۆدێل و ستایلی جلوبەرگ و ماڵ و دارایی و دەوڵەمەندی و هتد ...یەوە هەیە. لە نێو ئەم کەرەستانەدا سینەما دەورێکی نەرێنیی کاریگەریی هەیە لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگە و شێواندنی ڕاستییەکان. هەر لەم چوارچێوەیەدا لەنێوان ساڵانی ١٩٨٢ بۆ ساڵی ١٩٨٥ لێکۆڵەری ئەمریکی «تیری» لە لێکۆڵینەوەیەکی وردا هەستا بە خستنەڕووی وێنای عەرەب و موسڵمانان و هاوڵاتییانی خۆرهەڵاتی

ناوەڕاست. وێنای عەرەب و موسڵمان لەو فیلمانەدا وەک کارەکتەرێکی دوژمن و پیاوخۆری دژە خۆرئاوا دەخرێتە ڕوو کە ئامانجی سەرەکی و کۆتاییان وێرانکارکردنی شارستانیەتی ئەورووپایە. لە بەرانبەردا دەیانەوێت بە شێوەیەک وێنای خۆرئاواییەکان و لە نێویشیاندا ئیسرائیلییەکان بخەنە ڕوو کە هەمیشە و هەموو کات خەڵکانێکی زیرەک و بلیمەت و بە توندترین شێوەوە لە کەمترین ماوەدا دەتوانن بەرەنگاری نەیارەکانیان ببنەوە. هەمیشە و هەموو کات لە بەرەی دادپەروەریدا و دژ زوڵم و زۆر و هەوڵە تیرۆرکارییەکانی جیهان دەوەستنەوە. هەڵبەت وێنای بەرانبەر بریتییە لە کارەکتەرێکی موسڵمانی تیرۆریست کە نەوان ڕووبەڕووی هەوڵە دوژمنکارییەکانی دەبنەوە. هەر لە چوارچێوەیەدا ئەم وێنایەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی لە ئاوێنەی فیلمسازیی خۆرئاوایی بە گشتی و ئەمریکی بە تایبەتی ئەوەیە کە موسڵمانانی خۆرهەڵاتی بەرگەی تەواوی ناڕەحەتییەکانی ژیان دەگرن پێویستە ئەو خێروبێرەی لە بەردەستیاندایە وەربگیرێتەوە و بخرێتە بەردەم خۆرئاواییەکان و ئەمریکییەکان.

«تیری» بەردەوام دەبێت و تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە دوای نەمانی شیوعییەت و کۆتاییهاتنی یەکێتیی سۆڤییەت و پەرتەوازەبوونی وڵاتانی نێو ئەم یەکێتییە. دوای نهمانی بلۆکی خۆرهەڵاتی و ڕووخانی یهکێتیی سۆڤییهت سینەمای خۆرئاوایی ڕووی لە جیهانی ئیسلام کردووە. کاتی خۆی سینەمای خۆرئاوایی و بە تایبەتی سینەمای ئەمریکی، یابانی و ڕووسەکانی وەک دوو لایەنی دوژمنی خۆرئاوا و ئەمەریکا دەناساند، بەڵام دوای داتەپینی یەکێتیی سۆڤیەت ئاڕاستەی سینەمای ئەمریکی بەرەو بەدوژمن ناساندنی ئیسلام و موسڵمانان هەنگاوی نا.[1]

---

(١)صورة الإسلام في الغرب، بين حملات التشويه و واجب التصحيح، مجموعة من الباحثين طبعة ٢٠٠٦، ص ٥٥.

# ئیسلام و سینەمای خۆرئاوایی

لە ئێستادا خۆرئاواییەکان و ئەمریکییەکان هەوڵەکانیان لەم بارەیەوە چڕ کردووەتەوە و دوژمنایەتییەکانیان بۆ جیهانی ئیسلام تۆختر کردووەتەوە.

فیلمە ئەمریکییەکان هەوڵی ناساندنی ئیسلام وەک ئایینێکی هاندەری تیرۆر و موسڵمانیش وەک تیرۆریست دەناسێنێت. ئەم جۆرە ناساندنە کاریگەریی نەرێنیی ڕاستەوخۆی دەبێت لە سەر بیرکردنەوە و ئاڕاستەکردنی تاکی ئەمریکی، بە شێوەیەک نەوەیەکی دوژمن بە ئیسلام و قینە لەدڵ بەرانبەر موسڵمانان دروست بووە. لەم بارەیەوە دکتۆر «جاک شاهین» یەکێک لە پسۆڕانی بواری میدیا و ڕاگەیاندن لە پەرتووکەکەی خۆیدا بە ناوی عەرەب و تەلەفزیۆن (The Arab TV) بە سوودوەرگرتن لە دووسەد و پەنجا سەرچاوەی جۆراوجۆر هەڵسەنگاندن و شرۆڤەکردنی زیاتر لە چوارسەد فیلم و سەدان بەرنامەی تەلەفزیۆنیی جۆراوجۆر لێکۆڵینەوەیەکی گرنگی خستوەتە ڕوو، تێیدا تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە هەردوو وشەی عەرەب و موسڵمان دوو ناون کە دووچاری زۆرترین شێواندن هاتوونەتەوە و بەشێکی زۆر لە هاوڵاتییانی ئەمریکی لە ژێر کاریگەریی سینەمادا گەییشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە ئەو وێنایەی سینەمای ئەمریکی لەبارەی موسڵمانەوە دەیخاتەڕوو ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە و موسڵمانان لە ڕاستیدا هەر بەم شێوەیەن.

پاشان تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە لە دوای جەنگی کەنداوی دووەمەوە، هۆلیۆد زیاتر لە چل فیلمی بەرهەم هێناوە کە تێیدا زیادەڕەوییەکی بەرچاو دەبینرێت لە قێزەون نیشاندانی موسڵمانان و ناساندنیان وەک هێزێکی دڕندە و

خەڵکانی وەحشی و هەمەجی و مایەی مەترسین بۆ سەر خۆرئاوا و ئەمەریکا.

لە نموونەی فیلمەکانی (لعبة القتل، نينجا الأمريكي والأبادة، في الشمس، الدرع البشري)[1] کەناڵە کوردییەکانیش بە دۆبلاژکراوی و ژێرنووسکراوی لە کەناڵەکانەوە پەخشی دەکەن و لە سەر ئاستی ڕاگەیاندنی کوردیش وەشاند و پەخشکردنی ئەم جۆرە فیلمانە مەبەست و مەغزایەکی تایبەتی لە پشتەوەیە.

زیاد لەمە بەرهەمە سینەماییە کوردییەکان ئەم جۆرە لە سیناریۆیانە جارێکی تر بەرهەم دەهێننەوە و بە شێوەیەکی تر ئاڕاستەی کۆمەڵگەی کوردیی دەکەنەوە. لە پاڵ ئەوەی لە چوارچێوەی دراما کوردییەکان بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ گاڵتە بە پیرۆزییەکان دەکرێت و خەڵکانی موسڵمان وەک کارەکتەرێکی دزێو و ستەمکار و خووی ناتەندروست دەناسێنرێت، بە پێچەوانە خەڵکانی ناموسڵمان وەک فریادڕەس و کارەکتەرێکی تەندروست و پڕ خێروخۆشی بۆ کۆمەڵگە دەناسێنرێن، بە شێوەیەک تاکی موسڵمان لە درامای کوردیدا تاکێکی شەڕەنگێز و چاوچنۆک و هەلپەرست و بەرژەوەندیخوازە.

ئەم ئاقارە لە وێناکردنی موسڵمانان، جۆرێک لە بێهەستی بەرانبەر موسڵمان لای ئەوانی تر دروست دەکات. شارەزایانی بواری سینەما و کاریگەرییە سینەماییەکان باس لە کاریگەریی نەرێنیی فیلم و دراماکان دەکەن لە سەر چەواشەکردن و ئاڕاستەکردنی ناتەندروستی هاوڵاتییان، لەم چوارچێوەیەدا ڕۆژنامەنووسی بیانی «ئریک هرستادیوس» (erice horstadins) لە ڕاپۆرتێکی لە گۆڤاری سلیتز (slitz)ی سویدی کە لە دوای شەڕی کەنداو نووسیویەتی: "ئێمە گەیشتووینەتە ئاستێک، گەر سەد هەزار موسڵمان بکوژرێت، هیچ مووچڕکەیەک بە دڵماندا نایەت، بە پێچەوانەی هێزە

---

(١) بڕوانە: صورة الإسلام في الإعلام الغربي، للدكتور محمد بشاري، دار الفكر _ دمشق، ٢٠٠٤ ص ٤٩.

خۆرئاواییەکان، بە شێوەیەکی سەیر خۆشەویستم هەیە بۆ خۆرئاواییەکان، بەڵام کاتێک ناوی عەرەب و موسڵمان دێت موچورکە بە جەستەمدا دێت و دووچاری ترس و تۆقاندن دێم."

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە لە بیرکردنەوە بەرانبەر ئازار و نارەحەتیی موسڵمانان دووچاری جیهانی ئیسلامی هاتووە، بە جۆرێک شتێک نییە ناوی هاوسۆزی بێت. ڕاگەیاندنی کوردیش لە ژێر کاریگەریی ئەم دۆخەدان بە جۆرێک لەکاتی بوونی مەترسییەک لە سەر مەسیحییەک، یاخود ئێزیدییەک، ڕاگەیاندنی کوردی تەواوی ماکینەی خۆی دەخاتە گەڕ، بەڵام هەواڵەکانی پەیوەست بە دۆخی موسڵمانانەوە بە هیچ شێوەیەک گرنگییان پێ نادرێت و وەک ڕووداوێکی سادە و سەرپێیی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. ڕاگەیاندن بە تەواوی جۆرەکانییەوە دەورێکی کاریگەریی هەیە لە ناشرینکردنی ئیسلام لە سەرانسەری دونیادا. لێرەدا چەند نموونەیەکی نزیک لەم بابەتە دەخە ینەڕوو:

لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٩/١٠ ڕۆژنامەی «دەیلی تەلەگرامی»ی ئەمریکی لە ڕاپۆرتێکدا لە ژێر ناوی «کاریگەریی ڕاگەیاندن و بەشداری لە بابەتی ئیسلامفۆبیا» تێیدا بۆچوونەکانی ئەمینداری گشتیی ئەنجوومەنی ئیسلامی بەریتانی تۆمار دەکات و لەو بارەیەوە دەڵێت: "لە ڕاستیدا ڕاگەیاندن هۆکارێکی سەرەکیی ناشرینکردنی وێنەی موسڵمانانە. ڕاگەیاندنەکان بێویژدانانە تیشک دەخەنە سەر ئەو هەڵە و زیادەڕۆییانەی کە لێرە و لەوێ خەڵکانێکی موسڵمان پێ هەڵدەسن، کاری ئەو موسڵمانانەی تر لە پێش چاو ناگرن کە لە سەر ئاستی تاوان کەمترین ڕێژەی تاوان لەناو ڕیزی موسڵماناندایە و زۆرترین پابەندییان بە یاساوە هەیە."[١]

---

(١)بڕوانە: اثر الإرهاب في تشويه صورة الإسلام والمسلمين في الإعلام الغربي، الشيخ عبد الحق بن ملا حقي التركماني رابطة العالم الإسلامي ٢٠١٥، ص ١٥.

ئەم هێرشە بە شێوەیەکە بەپێی دانپێدانانەکانی خۆیان تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە سەدا نەوەد و یەکی هەرچی بابەت و وتار و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی هەیە لە دژی ئیسلام نووسراون، بۆیە وەک لێکۆڵەری بەریتانی «لورا براون» دەڵێت: "بەپێی بەرزبوونەوەی گوتاری دژە موسڵمانان لە ڕاگەیاندنەکاندا، ڕێژەی توندوتیژی لە واقیعدا زیاتر و زیاتر دەبێت."[1] ئەم حاڵەتە تەنیا پەیوەست نییە بە بەریتانیاوە، بەڵکوو بۆ ژمارەیەکی بەرچاوی وڵاتانی تری خۆرئاوایی بە هەمان شێوە ڕاستە، بەڵکوو زۆرێک لە وڵاتانی خۆرئاوایی دۆخیان لە بەریتانیان خراپترە. هەر لەم چوارچێوەیەدا یەکێک لە لێکۆڵەرانی سویدی بە ناوی «گویل تید گورد» لە لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریدا، ساڵی ٢٠١١ کە لە بەناوبانگترین ڕۆژنامەی سویدیدا بڵاوی کردووەتەوە دەڵێت: "هەر یەکێک لەم ڕۆژنامانە خاوەنی ئاراستەی سەربەخۆن لە «لیبراڵی، موحافزین و سۆسیالیستی و دیموکراتی» ناوبراو هەستاوە بە لێکۆڵینەوەی شیکاریی ئەو بابەت و ڕاپۆرتانەی کە لە زۆرێک لە پەرتووک و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو وڵاتە بەرانبەر بە ئیسلام بڵاو دەکرێنەوە لە کۆتایی لێکۆڵینەوە شیکارییەکەیدا گەیشتووەتە ئەم دەرئەنجامانە:

یەکەم: لە دونیای ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنی خۆرئاواییدا هەمیشە وشەی «ئەوان» بۆ موسڵمانان بەکار دەهێنرێت بە مەبەستی جیاکردنەوەیان لە جیهانی خۆرئاوایی، تاوەکوو ئەوەی زیاتر ئەو تێگەیشتنە لە عەقڵییەتی تەواوی هاوڵاتییانی خۆیاندا بچەسپێنن کە موسڵمان بە هیچ شێوەیەک سەر بە شارستانیەتی ئەوان نیین. ئەوان سەر بە جیهانێکی ترن و دوور و نزیک پەیوەندییان بە جیهانی خۆرئاواوە نییە. زیاد لەمە لە ئەدەبیاتی نووسین و فەرهەنگی ڕۆژنامەوانیی خۆرئاوایی بە شێوەیەکی گشتی پێداگریی دەکەن لەسەر تۆخکردنەوەی چوار خاڵی گرنگ کە لە ڕێگەیانەوە هەوڵی لێدان و

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو. لا ١٦.

لاوازکردنی جیهانی ئیسلامی دەدەن.

دووەم: وێناکردنی وڵاتانی ئیسلامی بە کۆمەڵێک وڵاتی دواکەوتوو و دژە دیموکراتی و هیچ بنەمایەکی بەڕێوەبردنی دروستی تێدا نییە و بە پاڵنەری سۆزی کەسی و ئایینی بەڕێوە دەبرێت.

سێیەم: نووسین لە سەر کێشمەکێشم و بەریەککەوتنی شارستانییەتەکان و بە دیاریکراوی شارستانیەتی ئیسلامی و شارستانیەت خۆرئاوایی.

چوارەم: بەشێکی زۆر لە وتاری ڕاگەیاندنەکان بە ئاڕاستەی بەستنەوەی ئایین بە تیرۆر کار دەکەن.[1]

دوا خاڵ کە جەوهەریترین خاڵە کە ناوەندە میدیاییەکانی خۆرئاوا کاری لە سەر دەکەن ئەوەیش ناساندنی موسڵمان وەک تاکێکی ترسناک و تیرۆریست و ناساندنی خودی ئیسلامیش وەک کەرەستەیەکی بەرهەمهێنانی تیرۆر. ئەم هەوڵە هەنگاوە میدیاییە بە دروستی ئامانجی خۆیان پێکا و سەرکەوتوو بوون لە ناشرینکردنی وێنای موسڵمان لە بیرکردنەوەی تاکی خۆرئاوایی.

پرسیارە لۆژیکییەکە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت تا ئێستایشی لەگەڵ بێت موسڵمانان چ زیانێکیان بە خۆرئاوا گەیاندووە؟ خاکیان داگیر کردوون، خێروبێری وڵاتیان بردوون و بوونەتەوە مەترسی لە سەر بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەوان؟ بە دڵنیایی نەخێر، ئیتر بۆچی و لە سەر چی ڕقیان لە موسڵمان دەبێتەوە، لە کاتێکدا جگە لە دەستەبژێرێک، زۆربەی هەرە زۆری خۆرئاواییەکان هیچ لەبارەی خۆرهەڵاتی ئیسلامییەوە نازانن و هیچ زانیارییەکیان لەبارەی ئیسلامەوە نییە. هەندێک جار بابەتەکە لەمە قووڵترە، بەشێکیان تەنانەت نازانن بەشێک لە وڵاتانی موسڵماننشیین دەکەونە کوێی نەخشەی جوگرافیای

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١.

جیهانییەوە، کەچی بە شێوەیەکی زیرەکانە ئەم ڕقوکینەیە لە ناخیدا دروست کراوە و ژمارەیەکی بەرچاو لە لێکۆڵەرانی خۆرئاوایی ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردووەتەوە.

هەر دوو خانمە لێکۆڵەر «هەیفا جواد» و «تنسین بین» لە زانکۆی بێرگنهام دوای لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ لەبارەی کاریگەریی ڕاگەیاندنە خۆرئاواییەکان لە سەر عەقڵییەت و بیرکردنەوەی تاکی خۆرئاوای دەڵێن: "لە ڕاستیدا ئەو دوژمنایەتییەی لە خۆرئاوا بەرانبەر ئیسلام و موسڵمانان دەکرێت، پەیوەندییەکی تەواوی بە ڕاگەیاندنەوە هەیە کە لە گوتاری خۆیدا ئیسلامی وەک ئایینێکی دڕندەی بیابانشینی ئارەزووپەرست ناساندوە." لە ڕاستیدا ئەم جۆرە وێناکردنەی ئیسلام و موسڵمانان تەنیا تایبەت نەبوو بە ڕاگەیاندنی ئەورووپی و خۆرئاواییەکانەوە، بەڵکوو ئەم تێڕوانینە پەلی کێشا بۆ نێو قووڵاییی جیهانی ئیسلامی. ڕاگەیاندنی کوردیش وەک بەشێک لە ڕاگەیاندنی ناوخۆیی و کاریگەر لە ژێر هەژموونی ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی کار دەکات، بە دروستترین شێوە هەمان ئەزموونی خۆرئاوایی تاقی دەکاتەوە لە ناساندنی موسڵمان وەک تاکێکی دواکەوتوو و شەڕەنگێزان وێناکردنی خێزانی موسڵمان وەک خێزانێکی لێوانلێو لە دیکتاتۆریەت و باوکسالاریی لکاندنی شوناس و ناسناوی تیرۆر بە ئیسلام و موسڵمانانەوە.

لە خودی خۆرئاوا ژمارەیەک لە خەڵکانی بە ویژدان و خاوەن پرەنسیپی ڕەوشتیی بەتوندی دژایەتیی ئەو جۆرە لە هەنگاوی میدیاکانی خۆرئاوا دەکەن و لە ڕێی گوتار و نووسینەکانیانەوە تیشک دەخەنە سەر ئەوەی کە ئەم جۆرە لە شێواندنی وێنای ئیسلام و موسڵمانان جگە لەوەی کارێکی نارەوشتییە، هاوکات لە کۆتاییدا بە زیانی سیاسەتی خۆرئاوای تەواو دەبێت. «جۆن ڕیشتارد سۆن» یەکێکە لەو ڕەخنەگرانە و لە پەرتووکی «شێواندنی ئیسلام»دا ڕەخنەی توند لە ڕاگەیاندنە خۆرئاواییەکان دەگرێت بە دیاریکراوی ناوەندی میدیایی

و ڕاگەیاندنەکانی بەریتانیا، لە سەر ئەو هەنگاوە نارەوشتییەی پەیوەست بە ناشیرینکردن و زڕاندنی ناوی ئیسلام لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەوەی جێی سەرنجە لە سەدا هەشتا و پێنجی ناونیشانی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بەریتانیا گوزارشتن لە ناشرینکردنی وێنای موسڵمانان بە شێوەیەکی دڕندانە. وێنای موسڵمانان دەکەن وەک ئەوەی کۆمەڵێک شەڕانگێز بن و مایەی مەترسیی ڕاستەقینە بن لە سەر کۆمەڵگەی بەریتانی. ئەم کاریگەرییە میدیاییانە بە شێوەیەک کاریگەرییان جێ هێشتوە تەنانەت، ئەگەر بێتوو تەواوی موسڵمانانی دونیا بکوژرێن و لە ناو ببرێن، هەندێک کەس بە هیچ شێوەیە هاوسۆز نین لەگەڵیان و پێیان وایە بە هۆی خراپی و توندیی خۆیانەوە دووچاری دۆخێکی لەم شێوەیە هاتوون، لە وێنا گەورەکەدا کاریگەریی ڕاگەیاندنەکە بە شێوەیەکە، ئەو بۆچوونەی لای ژمارەیەکی بەرچاو لە خۆرئاواییەکان دروست کردووە کە پێویستە بە هەر نرخێک بێت موسڵمانان لاواز بکەن و تواناکانیان لە قاڵب بدەن تاوەکوو ئەوەی هیچ کات نەبنە مەترسی لە سەر جیهانی خۆرئاوایی.

ئەم تێڕوانینە مێژوویەکی پێشتری هەیە، سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا هەمیشە گەلانی خۆیان لە مەترسیی گەلانی ئیسلامی ئاگادار دەکەنەوە، بە بیانووی ئەوەی گوایە گەلانی موسڵمان گەلانێکی دڕندە و نەخوێندەوارن و بە ناوی ئیسلامەوە کۆ دەبنەوە بە مەبەستی لەناوبردنی شارستانیەتی خۆرئاواییی مەسیحی. سیاسەتمەدارانی ئەورووپا ئەو کات و ئێستایشی لەگەڵ دابێت، هەمیشە وایان پیشانی میللەتانی خۆیان داوە کە موسڵمانان خەڵکانێکی دڕندە و توندڕەون گەر دەسەڵاتیان هەبێت، دێن و خەڵکانی ئەورووپا دەخۆن و پارچەپارچەیان دەکەن. دەبینین لە ژێر کاریگەریی ڕاگەیاندن و ڕێکخراوە دژە ئیسلامی و کۆچبەرییەکانی ئەورووپادا، چەندین خۆپیشاندان و ناڕازایی ئەنجام دەدرێت دژی ئیسلام و حیجاب و ڕیش و هەژموونی ئاشتییانەی موسڵمانان لەو وڵاتانە و سەرهەڵدانی چەندین بزووتنەوەی دژی ئیسلام و موسڵمانان

لە نموونەی بزاوتی پێگیدا(Pegida). سەرهەڵدانی بزوتنەوەی پێگیدا بە شێوەیەک بابەتی گەرمی ئێستای ئەڵمانیای فیدراڵ و زۆرێکی ترە لە وڵاتانی خۆرئاوایی و ماوەیەکە سیاسەتمەداران و میدیاکان و هاوڵاتییانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، هەندێک لە هاوڵاتییان لە ئەڵمانیا مەترسیی بڵاوبوونەوە و فراوانبوونی ئایینی ئیسلامیان هەیە و لەوە دەترسن پاشەڕۆژ ئیسلام سەرانسەری وڵات بگرێتەوە!! بزوتنەوەی (Pegida) کورتکراوەی (Patriotische Europäer gegen Islamisierung des Abendlandes) و دژ بە ئیسلامبوونی ئەڵمانیا و ئەورووپا کار دەکەن و دەیانەوێت هەڵگرانی ئیسلام لە ئەورووپا وەدەر بنێن و لە ڕێگای خۆپیشاندان و قۆستنەوەی بۆنەکانی ترەوە هەوڵ دەدەن لەوێوە زیاتر پەیامەکانیان بگەیەنن. لایەنگرانی ئەم بزاوتە سەرەتای ئۆکتۆبەری (٢٠١٤) لە شاری (Dresden) ژمارەیان (٥٠٠) کەس بوو دەستیان بە خۆپیشاندان کرد. لە مانگی دیسێمبەری هەمان ساڵدا ژمارەیان گەییشتە (١٥٠٠٠) کەس و دواتر پەلیان کێشا بۆ زۆرێکی تر لە وڵاتانی خۆرئاوایی. ڕۆژی ٢٠١٥/١/١٩ لە کۆپنهاگن خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێک خست، دواتر لە ٢٠١٥/٢/١٦ لە سویسرا بە هەمان شێوە خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێک خست، دواتریش لە ڤیەننا گردبوونەوەیەکی گەورەیان ئەنجام دا، ئەڵمانیا یەکێکە لەو وڵاتانەی کە بزووتنەوەی پێگیدا تێیدا تەواو چالاکە، بەڵام خۆشبەختانە بە پێی ڕاپرسییەک، لە سەدا ٦١ی هاوڵاتییانی ئەو وڵاتە پشتگیریی لەو خۆپیشاندانانە ناکەن.

بەپێی ڕاپرسییەک دەرکەوتووە کە لە سەدا ٢٩ی خەڵکی ئەڵمانیا، پشتگیریی خۆپیشاندانەکان دەکەن لە دژی بە ئیسلامکردنی خۆرئاوا و لە سەدا ١٠ی بەشداربووانی ڕاپرسییەکە دەنگ بە پارتێکی سیاسی دەدەن کە دژی ئیسلام بێت. هاوکات لە ٦١٪ی بەشداربووانی ڕاپرسییەکە ئیسلام بە مەترسیی نازانن بۆ سەر وڵاتەکەیان و وڵاتانی تری خۆرئاوا.

دواتریش بە هۆی ئاکاری جوانی موسڵمانان و پێگەی ڕەسەن و بەهێزیی خودی ئیسلامەوە، تەواوی هەوڵەکانیان بەم ئاڕاستەیە شکستی هێناوە لە بەرانبەر بزووتنەوەی «پێگیدا» بزووتنەوەی «ئەنتی پێگیدا» سەری هەڵدا، لە بەرانبەردا چەندین چالاکییان دژی بزووتنەوەی «پێگیدا» و ڕەتکردنەوەی ڕاسیزم ئەنجام دا.[1] لە ڕاستیدا دەمانەوێت ئەو پرسیارە جەوهەرییە بخەینە پێش چاوی هەموو لایەک، ئایا ئەورووپا چ زیانێکی لە ئیسلام کردووە وا لێی دەترسێت؟ ئایا لە ژێر مەترسیی کام شمشێردا هەنگاو بە هەنگاو ژمارەیەکی زۆر لە خۆرئاواییەکان دێنە ناو ئیسلامەوە؟ دەپرسین ئەو ترسەی خۆرئاواییەکان لە ئیسلام بۆچی و لەپێناوی چییدا؟ ئایا ئەم ترسە ڕاستەقینە و واقیعە یان فۆبیایەکە و ناوەندە میدیاییەکان دروستیان کردووە.

دەکرێت وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لای نەیاران تەواو قورس و دژوار بێت، پرسیاری ئەوە دەخەنە ڕوو ئەی ڕاگەیاندن لە ژێر هەژموونی کێدا ئەم کارانە دەکات؟ لە ڕاستیدا، هەوڵی خۆرئاواییەکان بە ئاڕاستەی ناشرینکردنی ئیسلام لە دوو هۆکارەوە سەرچاوە دەگرێت:

١- پاڵنەری سیاسی: دەکرێت پاڵنەری سیاسی بە دیارترین و بگرە سەرەکیترین هۆکار بێت بەو پێیەی پاڵنەری بەشێکی زۆر لە هەنگاوەکانی

---

(١) ڕۆژی ٢٠١٤/١٢/٢٢ لە شاری (Dresden) نزیکەی ٤٥٠٠ کەس لە گرووپی ئەنتی پێگیدا خۆپیشاندانیان کرد.

- ڕۆژی ٢٠١٤/١٢/٢٢ لە شاری (میونشن München) نزیکەی ١٢٠٠٠ کەس لە ئەنتی پێگیدا خۆپیشاندانیان کرد.
- ڕۆژی ٢٠١٤/١٢/٣٠ جارێکی تر لە میونشن خۆپیشاندان ئەنجام درا.
- لە شاری (بۆن Bonn) پێگیدا بە ژمارەی ٢٥٠ کەس و لە بەرانبەردا ئەنتی پێگیدا بە ژمارەی ٢٥٠٠ کەس خۆپیشاندانیان ئەنجام دا.
- لە شاری (کاسڵ Kassel) پێگیدا بە ژمارەی ٢٠٠ کەس و لە بەرانبەردا ئەنتی پێگیدا بە ژمارەی ٢٠٠ کەس خۆپیشاندانیان ئەنجام دا.
- لە (ڤۆرسبێرگ Würzburg) پێگیدا بە ژمارەی ٢٠٠ کەس و لە بەرانبەردا ئەنتی پێگیدا بە ژمارەی ٧٠٠ کەس خۆپیشاندانیان ئەنجام دا.

خۆرئاوا دژی ئیسلام بە درێژاییی مێژوو پاڵنەری سیاسی بووە. بەو پێیەی زڕاندن و شێواندنی بەرانبەر هەمیشە هۆکارێک بووە بۆ جوان نیشاندانی خود و قێزەون نیشاندانی دوژمنان. لە قۆناغی ئێستاشدا سەیر نییە کە خۆرئاواییەکان هەستن بە ناشرینکردنی وێنای ئیسلام و موسڵمانان، تاوەکوو ئەوەی لە ڕێیەوە بتوانن تەواوی نەوت و سامانی وڵاتانی ئیسلامی بۆ خۆیان بەرن.

لەم چوارچێوەیەدا «لیۆنارد بایندر» مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی شیکاگۆی ئەمریکی، هۆکاری لێکۆڵینەوە و گرنگیپێدانی خۆرئاواییەکان بە خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە گشتی و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی دەگەڕێنێتەوە بۆ پاڵنەری سیاسی و ئامانجی سەرەکیی خۆرئاواییەکان بەهێزکردنی پێگەی سیاسیی خۆیانە لە ناوچەکەدا، پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "تەواوی لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەناڵێنن بە دەست دەمارگیری و بێبابەتیبوون و لادانی ئایینی و ناشرینکردنی ئایدیۆلۆژییەوە."[1]

٢- سەرچاوەی ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی و زڕاندنی ناوی ئیسلام لای ئەورووپییەکان بریتییە لە پەرتووکە پیرۆزەکانی ئایینی مەسیحی، هەر وەک نووسەر و لێکۆڵەری گەورە «دانیال نۆرمان» لە پەرتووکی (الإسلام والغرب) تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەڵێت: "بە هۆی کاریگەریی گوتار و نووسینی کڵێساکان و پیاوانی لاهوتەوە لە سەدەی نۆهەمی میلادییەوە، ئەو هزرە لای تەواوی مەسیحییەکان چەسپاوە کە موحەممەد مەسیحی دەجالە." هەڵەمان نەکردووە کە ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو و خوێنراوی ئێستای خۆرئاوایی بە درێژەپێدەری سیاسەت و گوتاری کڵێسا بزانین.

---

(١) بڕوانە: صورة الإسلام من وسائل الاعلام الغربية. محمد كمال الدين امام رياض ١٤٠٥ الهجرية، ص ٦ وەرگیراو لە پەرتووکی: صوره الإسلام فی الأعلام الغربی، ص ٥٨.

هەر لە سەدەی نۆیەمی زانینەوە تاوەکوو ئێستا سەرچاوەی خودی ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت لە ڕاگەیاندنەکانی خۆرئاوا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کڵێسا. لێکۆڵەرانی خۆرئاوایی «ڕیتشارد سوزرن» و «نورمان» ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە بە هۆی پەرتووکی پیرۆزەوە وێنای ئیسلام لای خۆرئاواییەکان ناشرین بووە.((١)) کە وایە ئەو وێنایەی ئێستا لە بیرکردنەوەی زۆرێک لە هاوڵاتییانی خۆرئاواییدا لە ڕاستیدا بیرکردنەوەی سادە و سەرپێیی نییە، بەڵکوو بیرکردنەوەیەکی ڕەسەنە و خاوەنی ڕەگوڕیشەی لەمێژینەیە و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێڕوانینی ڕادیکاڵییانەی لەمێژینەی کڵێسا و ئەورووپا بۆ ئیسلام بە گشتی.

ئەم دوو هۆکارە دیارترین هۆکارەکانی سەرچاوەی ڕقوکینە لەدڵی دەزگا میدیاییەکانی خۆرئاوایە بەرانبەر بە ئیسلام، لەگەڵ ئەوەی ئەم دوو هۆکارە بە دیارترین پاڵنەرەکانی ڕقوکینەی ناوەندە میدیاییە خۆرئاواییەکان دادەنرێت سەبارەت بە ئیسلام، بەو پێیەی لە تەواوی پەرتووکەکەدا زیاتر بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ تیشکمان خستوەتە سەر ئەم دوو بابەتە، بۆیە لێرەدا درێژە بەم بابەتە نادەین باسی ئەو هۆکارە لاوەکییانە دەکەین کە بوونەتە هۆی زڕاندنی ناوی ئیسلام و موسڵمان لە خۆرئاوا بە گشتی و ناوەندە میدیایی و ڕاگەیاندنەکان بە تایبەتی:

**یەکەم:** ڕیتم و شێوازی کارکردنی ڕاگەیاندن. لەگەڵ ئەوەی زۆرێک لە خەڵکی پێیان وایە کە میدیاکان و ناوەندەکانی ڕاگەیاندن بەوپەڕی ئازادییەوە کار دەکەن و لە ژێر هیچ سانسۆر و ئەجێندایەکدا کار نەکەن! بێگومان بانگەشەیەکی لەو شێوەیە تەواو دوورە لە ڕاستییەوە، تەواوی ڕاگەیاندنەکانی

---

(١) بڕوانە: وێنای ئیسلام لە ئەورووپا ڕیشتارد سوزرن، وەرگێڕانی رضوان السید بیروت، معهد الإنماء العربي ١٩٨٤، ص ٥٠.

دونیا خاوەنی ستراتیژ و ئەجێندان و خودی سروشتی ڕاگەیاندن لەگەڵ سروشتی ئایین و ڕۆشنبیری و سیاسەتی ژینگەکەی کار دەکات، لەم بارەیەوە ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگی خۆرئاوایی «ئیریل لورو» لە کۆنفرانسێکی میدیاییدا دەڵێت: "ڕێگەم بدەن هەر لە سەرەتاوە ڕاشکاوانە بڵێم کە من سەر بە لایەکم، پێویستە هەمووومان بە ئازایانە دان بنێین بەوەی کە هەر یەک لە ئێمە سەر بە لایەنێکین و هەمووان بە ئامانجی لایەنێک کار دەکەین."[1]

**دووەم:** هەژموونی زایۆنیەتی جیهانی بە سەر تەواوی دامەزراوە میدیاییە جیهانییەکان و دارشتنەوەی سیاسەت و ئەجێنداکانیان بە ئاڕاستەی بەرژەوەندیی جوولەکە و زایۆنییەکانی جیهان و لە سەروو هەموویانەوە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل. لەگەڵ ئەوەی ئەم بابەتە لە بەشێکی لە ناوەندەکانی خۆرئاوا و بە تایبەتی ئەوروویا وەک بابەتێکی لاوەکی هەژمار دەکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا هەژموونی زایۆنییەکان و باڵادەستییان بە سەر میدیا و ڕاگەیاندنە جیهانییەکاندا ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە. ناوەندەکانی هەواڵی زایۆنی لە سەرانسەری جیهاندا بوونەتە سەرچاوەی هەواڵی میدیاکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و لەلایەن چەندین کارەکتەری سیاسی و بزنسمانی زایۆنییەوە بە ڕێوە دەبرێن و ئاڕاستە دەکرێن. لە دیارترین کارەکتەرە بەهێزەکانی ئەم بوارە سەرمایەداری گەورەی ئەمریکی بە ڕەچەڵەک ئوستوراڵی کە بە جاڵجاڵۆکەی میدیا و ڕاگەیاندن ناسراوە و خاوەنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی ڕاگەیاندنە لە کەرەستەی بینراو و بیستراو و خوێنراو، بەم شێوەیە:

-لە ئوستورالیا خاوەنی ٢١ ڕۆژنامە و گۆڤارە.

-لە دوورگەکانی فیجی خاوەنی ٣ ڕۆژنامەیە.

---

(١)هەمان سەرچاوەی پێشوو لا١٣٠ .

-ڕۆژنامەیەک لە کۆماری کینیای نوێ.

-لە بەریتانیا خاوەنی ڕۆژنامەی بەناوبانگی The Times - The (Sun)ە.

-لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا خاوەنی New York Post - Wall) (Street Journalە.

ئەمە جگە لە چەندین کەناڵی ڕاگەیاندنی جۆراوجۆر لە سەرانسەری جیهاندا. لە نموونەی هەر دوو کەناڵی (فیول) و (سبیدد)ی جیهانی و کۆمەڵەی کەناڵەکانی «ناشناڵ جیوگرافیک» تۆڕی کەناڵی «بیگ تن»ی ئەمریکی و تۆڕی «ییس»ی وەرزشیی ئەمریکی و تەواوی کەناڵەکانی «ستار»ی ئاسیایی و تەواوی کەناڵەکانی «سکای» لە سەرانسەری جیهان لە دیارترینیان «سکای نیوز» و «سکای نیوز عەرەبیە» و «سکای سپۆرت»ی وەرزشی. لە هەر یەک لە بەریتانیا و ئەڵمانیا و نیوزلەندا و زۆرێکی تر لە کەناڵە هەواڵییەکانی جیهان لە نموونەی «کەناڵی دە» لە ئۆرۆگوای و کۆمەڵەی کەناڵەکانی «ثای تیڤی»ی بەریتانی و کەناڵی «بی وان» ڕۆمانی و ڕادیۆو تەلەفزیۆنی «ئامیدی» لە جۆرجیا و کەناڵی «دە»ی زایۆنی و کەناڵی «تشییلو»ی ئیتاڵی و کەناڵی «ئێن تیڤی»ی ئیندۆنیسی کەناڵی «نۆ» لە ئوستورالیا و کەناڵی «بەیبی تیڤی»ی تایبەت بە منداڵان سەر بە کۆمەڵەی کەناڵەکانی فۆکسی جیهانی.

لە فەڕەنسا «جیمس گولد سمیس - James Goldsmith» خاوەنی چەندین دەزگای ڕاگەیاندنی جۆراوجۆرە لە سەر ئاستی ئەمەریکا، لە سەدا نەوەدی ڕۆژنامە و گۆڤار و ناوەندەکانی تەلەفزیۆن و خاوەندارێتییان بۆ جوولەکەکان دەگەڕێتەوە، یاخود ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەریی ئەواندان، بە شێوەیەک دوو ڕۆژنامەی بەناوبانگی ئەمریکی «نیویۆرک تایمز» خاوەندارێتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ (Arthur Hays Sulzberger)

کە سەرمایەدارێکی زایۆنییە و دووەمیان ڕۆژنامەی «واشنتۆن پۆست» کە خاوەندارییەتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ «ئۆجین مایر» ی جوولەکە.[١] لە کەناڵی ڕاگەیاندنەوە سێ تۆڕی گەورەی میدیایی لە ئەمەریکا هەن:

١- کەناڵی «سی بی سی» خاوەندارێتییەکەی بۆ «ولیام بیلی» دەگەڕێتەوە. بەڕێوەبەری گشتیی کەناڵەکەیش «ڕیتشارد سالانت» ە کە هەر دووکیان دوو کەسایەتیی زایۆنین.

٢- «ئێن بی سی» خاوەندارێتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ «ئەلفر سلفرمان» کە ئەویش جوولەکەیە.

٣- «ئەی بی سی» خاوەنەکەی «لیۆنارد جۆنسۆن»ە و بەڕێوەبەری گشتییەکەی «مارتن ڕدینشتاین»ە و هەردووکیان جوولەکەن.[٢] بەشێک لەم ژمارە و ڕاپۆرتانە داتا و ڕاپۆرتی پێش ساڵی ٢٠٠٠ دەبێت هەژموون و دۆخی دەستەباڵایی یەهوودییەکان و زایۆنییەکان لە ئاستێکی تەواو مەترسیدار دابێت. ئێستا لەوە سەیرتر ئەوەیە، کام دەزگای میدیایی و ڕاگەیاندن هەیە لە ژێر هەژموونی جوولەکەکاندا نەبێت.

**سێیەم:** کۆچکردنی ژمارەیەکی بەرچاو لە موسڵمانان لە سەرانسەری دونیاوە بە تایبەتی موسڵمانانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی ئاسیا و زۆربوونی ژمارەی موسڵمان لە وڵاتانە بە شێوەیەکی لەبەرچاو و دامەزراندنی چەندین جالیەی ئیسلامی و دروستکردنی مزگەوت و چەندین سەنتەری ئیسلامی و ناوەندی لێکۆڵینەوە و فێربوونی ئیسلام لە تەواوی وڵاتانی خۆرئاوا ترسێکی گەورەی لای سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا دروست کرد، بە شێوەیەک سیاسییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە چەند ساڵێکی تر موسڵمانان ببنە زۆرینە و

---

(١)هەمان سەرچاوەی ڕابردوو، لا ١٣٨.

(٢)هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٨.

هەژموونی کۆمەڵایەتیی خۆیان بە سەر تەواوی خۆرئاوادا بسەپێنن. ئەوەی ئێستا پێی دەگوترێت «ئیسلامۆفۆبیا» بە مەبەستی ڕێگرتن لەم دیاردەیە. ماکینەی ڕاگەیاندنەکانی ئەورووپا کەوتنە کار لەپێناو قێزەون نیشاندانی ئیسلام و موسڵمانان و هەژمارکردنیان وەک مەترسییەکی گەورە لە سەر داهاتووی خۆرئاوا.

**چوارەم:** نەبوونی ڕاگەیاندنێکی ئیسلامیی بەهێز لە بەرانبەر ئەو مەترسییە گەورەیە. ڕاگەیاندنی خۆرئاوا لە سەرانسەری جیهاندا دەبینین، ڕاگەیاندنی بەهێزی جیهانی و بگرە ناوخۆییەکانیش هەموویان بە دەستی ناموسڵمانانەوەن، بگرە زۆر جاریش وەک کەرەستەیەک دژی ئیسلام و موسڵمانان بە کار دەهێنرێن. ئەوەی جێگەی هەڵوێستەکردنە زۆرجار ڕاگەیاندنە ئەورووپی و خۆرئاواییەکان ڕەوشتیانەتر مامەڵە دەکەن لە هەمبەر بابەتەکانی پەیوەست بە جیهانی ئیسلامی، تاوەکوو ڕاگەیاندنەکانی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی. بەو پێیەی ڕاگەیاندنە خۆرئاواییەکان لانی کەم شتێکی تێدا دەهێڵنەوە، یاخود لەبەر ناوبانگی خۆیان درۆیەکی زەق ناکەن کە ببێتە مایەی ئابڕووچوونیان. ڕوونتر بڵێین زیرەکانەتر سیناریۆکان دادەڕێژنەوە و بە جۆرێکی زیرەکانە کار بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان دەکەن، بەڵام ڕاگەیاندنی وڵاتانی ئیسلامی دوور لە هەموو بەهایەکی ڕەوشتی و پسپۆڕی بە خراپترین شێوە کار دەکەن لە سەر ناشرینکردن و قێزەون نیشاندانی تاکی موسڵمان، تەنانەت لە دروستکردنی درۆ و سیناریۆی نالۆژیکی و ئاوەژووکردنەوەی ڕاستییەکان تەواوی سنوورەکانیان بەزاندوە.

ئەمانە بە کورتی چەند هۆکارێک بوون بۆ ناشرینکردنی ئیسلام و قێزەون نیشاندانی لەلایەن ناوەندە میدیاییە جیهانییەکانەوە، هەر لە ژێر کاریگەریی ڕاگەیاندنی خۆرئاوایی، لە خۆرئاوا بە گشتی و ئەورووپا بە تایبەتی چەندین ڕێوشوێنی توند دژی موسڵمانان و لەپێناو لەقاڵبدانیان گیرایەبەر. لە دیارترینی ئەم هەوڵانە لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٣ فەڕەنسییەکان لە تەواوی قوتابخانە و

ناوەندە فەرمییەکانی دەوڵەتدا باڵاپۆشییان قەدەغە کرد، دواتر بەشێکی بەرچاو لە نووسەرانی خۆرئاوای وەک هۆشداری لەم مەترسییە، وەک خۆیان دەڵێن قەڵەمیان خستەکار و هەر لەو ساڵەدا واتە ساڵی ٢٠٠٣ نووسەری ئەمریکی «دانیال بایبس» پەرتووکی (الإسلام المسلح یصل امریکا)ی بڵاو کردەوە. تێیدا باس لە مەترسیی بڵاوبوونەوە و تەشەنەسەندنی ئیسلام دەکات و وەک مەترسییەکی ڕاستەقینە دەیناسێنێت لە سەر ئەزموونی خۆرئاوا بە گشتی و ئەمریکی بە تایبەتی. دواتر نووسەری ئەمریکی «ستیفن ئیمرسون» پەرتووکێکی بە ناوی (الأرهابیون الذین یعیشون وسطنا) «ئەو تیرۆریستانەی لە ناوماندا دەژین»ی نووسی و تێیدا باس لە مەترسیی بوونی ئەو ژمارە زۆرەی موسڵمانان دەکات لە خۆرئاوا و وەک بۆمبێکی تەوقیتکراو دەناسێنێت کە دەکرێت لە هەر ئانوساتێکدا بتەقنەوە و ببنە مەترسیی گەورە لە سەر ئەزموون و شارستانیەتی خۆرئاوا، دواتریش چەندین دامەزراوە بە شێوەیەکی ستراتیژی و پلانبۆدارێژراو چالاکییەکانیان لەپێناو لێدانی ئیسلام خستە گەڕ.

بەستنی کۆنگرەکان یەکێکە لەو پلانانەی کە نەیارانی ئیسلامە لە ڕێیەوە کار و پلانەکانیان لە هەمبەر وڵاتانی ئیسلامی دەخەنە پێش چاو. بە تایبەتی تر لە سەرەتای ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوە لە دیارترین ئەو کۆنگرانە، کۆنگرەی ساڵانەی پەیمانگای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست—وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە.

دواتریش هەوڵەکانی دامەزراوەی «ڕاند» جێگەی هەڵوێستەکردنن. دەزگای ناوبراو ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی لە ژێر ناوی (الإسلام المدني الدیمقراطي) بڵاو کردەوە، تێیدا نەخشەڕێگای سیاسەتەکانی ئەمەریکا دەکێشێت و لەم ڕاپۆرتە پسپۆڕان و لێکۆڵەرانی ئەم ناوەندە باس لە ستراتیژی گرنگیپێدان بە ئیسلامییە عالەمانییەکان دەکات، تاوەکوو ئەوەی وەک هێزێکی کاریگەر دژی هەژموون و دونیابینیی ئیسلامییە ئوسوڵییەکان بووەستنەوە.

دوای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و بەرەوپێشچوونی هونەری فیلمسازی، ئیتر هەنگاوەکان بە ئاراستەی بەکارهێنانی فیلم وەک کەرەستەیەک بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام و شێواندنی وێنای موسڵمانان بەرەوپێشچوونیان بە خۆیانەوە بینی. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ لە هۆڵەندا فیلمێک لەبارەی پێگە و مافی ئافرەت لە ئیسلام و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی موسڵمانان بەرهەم هێنرا. پەیامی فیلمەکە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئیسلام وەک ئایینێکی دژە شارستانی و مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی دڕندانە وێنای ئافرەت دەکات و موسڵمانانیش بە شێوەیەکی قێزەون مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان دەکەن و بە هیچ شێوەیەک مافیان پێ نادەن و دەیانچەوسێننەوە. قۆناغی دواتر هێرشەکان بۆ سەر ئیسلام کەوتنە قۆناغێکی توندەوە و لێرە و لەوێ چەندین هێرش کرایە سەر ئیسلام و بەبێ هیچ پەردەیەک لە چەندین ناوەندی ڕاگەیاندنەوە، هێرش کرایە سەر ئیسلام و وەک ڕێکخراوێکی تیرۆریستی دەیناسێنن. دواتر بابەتەکە کەوتە قۆناغێکی مەترسیدارترەوە، هێرشەکان بۆ سەر ئیسلام و کەسایەتیی پەیامبەر(ﷺ) کەوتە قۆناغێکی مەترسیدارەوە و ساڵی ٢٠٠٥ ڕۆژنامەیەکی دانیمارکی لە هەنگاوێکی مەترسیداردا چەند وێنەیەکی کاریکاتێری پەیامبەریان کێشا دواتر وەک شێوەیەک لە گاڵتەکردن بە هەستی موسڵمانان بەشێک لە گۆڤارە ئەوروپییەکان بە تایبەتی فەرەنسی و نەرویجییەکان دووبارەیان کردەوە.

دواتر لە قۆناغێکی مەترسیداردا بەشێک لە سیاسەتمەدار و بەرپرسانی ئەورووپا پشتگیریی خۆیان بۆ ئەو کاریکاتێرە دەربڕی، پاشان لە مانگی دووی هەمان ساڵدا، گۆڤاری ئەسکەندەڤی و چەند گۆڤارێکی تری ئەورووپی پێشبڕکێی کێشانی تازەترین و گاڵتەجاڕیترین دژی پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) دەکرد. بێڕێزییەکان هەر بە کاریکاتێر و گۆڤارەکانەوە نەوەستا، دواتر وەک هەوڵێک بۆ لێدانی ئیسلام ژمارەیەک نووسەر چەندین هەوڵی دوژمنکارایان خستەگەڕ.

لەو چوارچێوەیەدا ملیاردێری ئەمریکی خاوەن چەندین دامەزراوەی میدیای جیهانییە «جریج وین» پەرتووکێکی بە ناوی (نبي الشؤم مذهب الإسلام الأرهابي في كلمات محمد الخاصة) (prophet of doom_ islams terrorist do gma in muhmmad s ownwords) هەیە، ناوبراو بە یەکێک لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام هەژمار دەکرێت. ئەو لەم پەرتووکەدا بە شێوەیەکی نازانستیی مەترسیدار ژمارەیەکی زۆر ئایەت و فەرموودەی پچڕپچڕ لەپێناو کۆمەڵێک مەرامی تایبەتی خۆی دەخاتە پێش چاوی خوێنەر. بە شێوەیەک هەر کەس زانیاریی پێشوەختەی نەبێت، یاخود وێنای گشتیی ئایەتەکانی لە پێشچاو نەبێت، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەم پەرتووکەوە. کاریگەریی ئەم پەرتووکە لە سەر ئەوروپییەکان بابەتێکی حاشاهەڵنەگر دەبێت، بەو پێیەی خۆرئاواییەکان زانیاریی پێویستیان لە سەر ئیسلام نییە و بەخێرایی دەکەونە ژێر کاریگەریی هەر بابەتێکەوە کە بۆیان پێشنیار بکرێت.

# لاوازکردنی هەستی ئایینی و گرینگیدان بە هەستی نەتەوایەتی

یەکێکی تر لەو کەرەستە و ڕێگایانەی کە خۆرئاواییەکان گرتووینەتە بەر بۆ لێدانی ئیسلام و لاوازکردنی و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی جیهانی ئیسلامی و پارچەپارچەکردنی وڵاتانی ئیسلامی و نەهێشتنی هەست و سۆزی ئایینی لەنێوان موسڵمانان و هەوڵدان بۆ جێگیرکردنی هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی و ڕەچەڵەکی وەک جێگرەوەی هەست و سۆزی ئایینی. ئەمە لە کاتێکدا ئیسلام تەواوی ئەو پەیوەندییانەی سڕییەوە و پەیوەندیی ئایینی و بیروباوەڕی کردە جێگرەوەی و تەواوی پەیوەندییەکانی تر وەک قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾﴾ [الأنبياء: ٩٢]، لە جێگەیەکی تردا قورئانی پیرۆز تیشک دەخاتە سەر گرنگیی برایەتی و پەیوەندیی ئایینی و پێکەوەیی و مەترسیی لێکدابڕان و لێکترازان و دوورکەوتنەوە لە بەرنامەی خودا وەک دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ [الأنفال: ٤٦]

ئەمە و چەندین ئایەتی تر کە باس لە کۆدەنگی و برایەتی و پێکەوەیی دەکات و نکۆڵی دەکات لە دەمارگیری و پەرتەوازەیی ئوممەت. وەک پشتڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە، هەر کات موسڵمانان لە هەر کوێیەکی ئەم جیهانە و لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا پشتگیر و پشتیوانیی یەک بووبن ئەوە سەرکەوتوو بوون لەوەی بە بەهێزی بمێننەوە و بەرەنگاری نەیارەکانیان ببنەوە، هەر بۆیە هەمیشە و بە درێژاییی مێژوو خۆرئاواییەکان تەبایی و یەکڕیزیی موسڵمانیان وەک مەترسییەکی گەورە لە سەر خۆرئاوا ڕاوانیوە. وەک «لۆرانس براون» دەڵێت: "هەر کات موسڵمانان یەک بگرن، ئەوا دەبنە

مایەی شوومی و نەفرەتی بۆ تەواوی زەوی، بەڵام گەر پەرتەوازە و لاواز بن و بێ هیچ هێز و دەسەڵاتێک دەمێننەوە، هیچ کات نابنە مایەی مەترسی لە سەر ئەوانی تر."[١]

مێژوونووسی بەناوبانگی بەریتانی «توینی» لەبارەی مەترسیی یەکڕیزیی ئیسلامییەوە دەڵێت: "لە ڕاستیدا یەکڕیزی و یەکبوونی ئیسلامی نوستووە، بەڵام دەبێت ئێمە ئاگادار بین هیچ کات بە ئاگا نەیەتەوە."[٢] موسڵمانان لە ئێستا لە دۆخێکی بێئاگاییدان کە هیچ کات لە مێژوودا وێنەی نەبووە، عالەمانییەت و قەومییەت و بەرنامەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان کردووەتە پەیڕەو و پرۆگرامی خۆیان و بە تەواوی پشتیان لە بەرنامەی پەروەردگار کردووە، یەکێک پڕ گەرووی هاوار دەکات:

**امنت بالبعث ربا لاشریک له وبالعروبة دينا ماله ثان**

یەکێکی تر دەڵێت:

**و هل أنا إلا من غزية ان غوت غويت وإن ترشد غرته أرشد**

تێڕوانینەکانی ئەوان بۆ بێ ئاگایی موسڵمانان دروستە و تەواو لە شوێنی خۆیدایە. پرسیاری ڕاستەقینە ئەوەیە هۆکاری ئەم بێئاگاییەی موسڵمان چییە و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین موسڵمانان بۆچی وایان لێ هاتووە و بەم ئاستە لاوازەی ئێستا گەیشتوون، بێگومان هۆکاری دروستبوونی پەرتەوازە و لێکدابڕانی موسڵمانان سەرچاوەی سەرەکی و کۆتایی دەگەڕێتەوە بۆ خۆرهەڵاتناسەکان. ئەمە تەنیا بانگەشە نییە، بەڵکوو بە شاهیدیی وەزیر موستەعمەراتی بەریتانی «ئۆمیس گو» دەڵێت:

---

(١) الفكر الإسلامي وسموم التغريب والتبعية أنور الجندي، ص ٢٢٣.

(٢) بڕوانە: الإسلام والغرب والمستقبل، أرنولد تويني، وهي عبارة عن محاضرة ألقاها سنة ١٩٥٢. ص ٧٣.

"ئێمە شەڕکردن فێری کردووین کە یەکرپزیی موسڵمانان گەورەترین مەترسییە کە دەبێت ئاگاداری بیت، نەک تەنیا ئێمەی بەریتانی، بەڵکوو دەبێت فەرەنسا و تەواوی وڵاتانی تری خۆرئاوایی ئاگاداری ئەم مەترسییە ڕاستەقینەیە بن بۆ ئێمە ستراتیژ و سیاسەتمان ئەوەیە کە ناهێڵین موسڵمانان یەکرپز بن و پێویستە ئەم سیاسەتەی ئێمە بۆ هەمیشە وەک خۆی بمێنێتەوە."[1] ڕەنگە ئیتر خوێنەر لەو ڕاستییە تێ بگات کە بۆچی پەرتەوازەیی و لێکدابڕانی جیهانی ئیسلامی، خراوەتە ئەستۆیی خۆرهەڵاتناسە ئەورووپییەکان. ئەوە هێزە ئیمپریالیستەکان بوون سنووری جیهانی ئیسلامیان دروست کرد و خاکی ئیسلامیان پارچەپارچە کرد، بەڵام پرسیاری لەوە گرنگتر ئەوەیە خۆرهەڵاتناسەکان کێن؟ چین؟ چۆن توانییان ئەو هەموو زانیارییە لە سەر جیهانی ئیسلامی کۆ بکەنەوە و بەو شێوە زیرەکانە جیهانی ئیسلامی دابەش بکەن و سنوورەکانی دیاری بکەن؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری تر کە پێویستە لە سەرەتاوە وەڵامیان بدەینەوە پاشان بچینەوە سەر بنەڕەتی بابەتەکەی خۆمان.

---

(١) بڕوانە: هموم الداعية للشيخ محمد الغزالي، ص ٧٣.

# خۆرهەڵاتناسی

وەک ڕوونە وشەی خۆرهەڵاتناسی لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە لە وشەی (شرق)ەوە وەرگیراوە، سێ پیتی (أ، س، ت) بۆ زیاد کراوە، ئەم سێ پیتە بە پێی بنەماکانی زمانی عەرەبی بۆ داخوازیکردن بەکاردێت کەوایە (الاستشراق) واتە داواکردنی خۆرهەڵات[1]. ئەوەی جێی ئاماژەیە لەگەڵ ئەوەی فەرهەنگە زمانەوانییە عەرەبییە کۆنەکان هەزاران وشەیان لەخۆ گرتووە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئاماژەیان بەم وشەیە نەکردووە.

## مێژووی سەرهەڵدانی:

بۆ یەکەمین جار چەمکی (Orientalist) سەرەتای ساڵی ١٧٦٦ بەکارهات کە لە سەروبەندی ناساندنی باوکە «بولینو» لە ئینسۆکلۆپیدیای لاتینی بەکارهاتووە[2]، وەک ئەوەی بەشێک لە مێژوونووسان ئاماژەی پێ دەکەن سەرەتای بەکارهێنانی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٧٩-١٧٨٠ لە ئینگلتەرا[3]، دواتر ساڵی ١٧٩٩ ئەم چەمکە پەڕییەوە بۆ نێو زمانی فەڕەنسی و ساڵی ١٨٣٨ لە ئینسۆکلۆپیدیای ئەکادیمیای فەڕەنسی بەکارهات[4]. ساڵی

---

(١)ابن منظور لسان العرب بيروت الطبعة الأولى ١٩٩٠، ص ١٧٣.

(٢) - الاستشراق والتاريخ الإسلامي، فوزى، فاروق عمر، الأهلية للنشر، اردن ١٩٩٨ م. ص ١٢

(٣) لاستشراق والدراسات الاسلاميه، دكتور علي بن ابراهيم الحمد النملة، مكتبة التوبة، رياض، ١٤١٨، ص ٣٣.

(٤)السيد محمد الشاهد. «الاستشراق ومنهجية النقد عند المسلمين المعاصرين» في الاجتهاد. عدد ٢٢، السنة السادسة، شتاء عام ١٤١٤هـ/١٩٩٤م، ص ١٩١ و دواتر.

١٨١٢یش هەمان چەمک لە ئینسۆکلۆپیدیای ئۆکسفۆردا بەکارهات[١]

لە هەندێک سەرچاوەی نوێدا هاتووە: خۆرهەڵاتناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە زانست و کەلتوور و زمانی میللەتانی خۆرهەڵات. خۆرهەڵاتناس بەو کارەکتەرە دەوترێت کە شارەزایی و ئاگاییەکی وردی هەیە بە سەر لایەنەکانی زمان و کەلتوور و ئادابی وڵاتانی خۆرهەڵاتییەوە.[٢]

(ئیگنازیۆ گویدی- Guidi Ignazio) لە پێناسەی خۆرهەڵاتناسیدا دەڵێت: "کەرەستەیەکە لەپێناو لێکۆڵینەوە لە هەژمونی ئاڵوگۆڕی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا». پاشان تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە خۆرهەڵاتناسی لە چوارچێوە زانستییەکەیدا کورت نەبووەتەوە لە سەر لێکۆڵینەوە لە زمان و شێوەزارەکان و گۆڕانکارییە مێژووییەکان. نەخێر، بەڵکوو دەکرێت بڵێین لە بونیاتنانی پەیوەندیی لەنێوان شارستانیەتی خۆرهەڵات و خۆرئاوا لە ڕاستیدا زانستی خۆرهەڵات دەرگایەکی گرنگیی مێژووی مرۆڤایەتییە."[٣]

لە فەرهەنگی (لاروس-Larousse Petit Le)دا بەم شێوەیە پێناسەکراوە: "بریتییە لەو بابەتانەی ئامانجەکانی خۆی لە لێکۆڵینەوەی شارستانیەتەکانی خۆرهەڵاتدا دەبینێتەوە." لێکۆڵیاری ئەڵمانی«ڕودی پارت» لە پێناسەی خۆرهەڵاتناسیدا دەڵێت: "وشەی خۆرهەڵاتناسی لە وشەی خۆرهەڵاتەوە وەرگیراوە. وشەی خۆرهەڵات واتای جێگەی خۆرهەڵات. بەم شێوەیە خۆرهەڵاتناسی واتای زانستی خۆرهەڵات یاخود زانستی جیهانی خۆرهەڵات" بەڵام «پارت» پێی وایە، جۆرێک لە ناڕوونی هەیە لە هەمبەر ڕوونکردنەوەی

---

(١) تاريخ حركة الاستشراق، الدراسات العربية والاسلامية فى اوربا حتى بداية القرن العشرين، المستشرق يوهان فوك، تعريف عمر لطفى العالم، دارقتيبة، دمشق، ١٤١٧. ص ١٩ و دواتر.

(٢) أحمد سمايلوفيتش. فلسفة الاستشراق وأثرها في الأدب العربي المعاصر.» القاهرة ص ٢٢.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٢٣.

چەمکی خۆرهەڵات کە بەپێی کات و شوێن گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. خۆرهەڵات بە دیدی یابانییەک، عەرەبێک، ئەڵمانییە، یاخود ئەمەریکییەک جیاوازە. دیسان خۆرهەڵات لە دیدگای خەڵکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە تەواو جیاواز بووە لەوەی ئێستا هەیە. لە سەردەمی نوێیشدا چەمکی خۆرهەڵات ئاراستەیەکی تری وەرگرتووە، بە تایبەتی دوای دۆزینەوەی هەر دوو ئەمریکا. پاشان باس لەوە دەکات چەمکی خۆرهەڵات جۆرێک لە ناڕوونیی پێوە دیارە، بەو واتایەی ئایا مەبەست لێی سنوورێکی جوگرافی یاخود مەبەست لێی وێنایەکی شارستانییە.[1]

لە بەرانبەردا بەشێک لە لێکۆڵەران پێیان وایە: خۆرهەڵاتناسی گوتارێکی سەربەخۆیە، گوتارێک هەڵگری باگراوندی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژیی دوور لە واقیع و وێنای جۆرێک لە بابەتی ویستراو دەکات. ڕوونتر بڵێین کێشانی وێنەی ئەوانەی تر بەو شێوەی کە ئێمە دەمانەوێت.[2]

«ئانا ماری شیم» باس لەوە دەکات: "خۆرهەڵاتناسی زانستە. زانستیش هەڵگری بنەڕەت و یاسا و میتۆدی سەربەخۆی خۆیەتی." بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی زانست دەستەبەرکردنی ڕاستەقینەیەکی ڕووتە، تەنانەت لە سەروبەندی دەرکەوتنی ئیسلام و دەستپێکی سەرەتای بانگەوازی ئیسلام ژمارەیەک لە زانایانی مەسیحی و جوولەکەی ناوچەکە وەک بەشێک لە پێکهاتەی ناوچەکە بە گرنگییەوە لە دەرکەوتنی ئەم ئایینە نوێیەیان دەڕوانی و تەنانەت بەشێک لە مەسیحییەکانی ناوچەی نەجران بە مەبەستی لە نزیکەوە ئاگابوون

---

(١)رودي بارت، الدرسات العربية والإسلامية في الجامعات الألمانية، ترجمة مصطفى ماهر دار الكتاب العربي ١٩٦٧، ص ١١.

(٢)سالم يفوت، حفريات الأسشتراق المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء الطبعة الأولى، ص ٨.
بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مکسیم ڕودنسون. "الصورة الغربية والدراسات الغربية الإسلامية." في تراث الإسلام القسم الأول تصنيف شاخت وبوزورث. ترجمة محمد زهير السمهوري، الكويت: سلسلة عالم المعرفة، ١٩٧٨م. ص٢٧-١٠١.

لەم ئایینە نوێیە و گفتوگۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پەیامبەری ئەم ئایینە، خۆیان گەیاندە مەدینە و زانیاریی ڕاستەوخۆیان لەبارەی ئەم ئایینەوە دەست خست. لەگەڵ گەڕانەوەیان بۆ ناوچەکانی خۆیان تەواوی ئەم زانیارییەیان بۆ خەڵکانی خۆیان گواستەوە. هاوکات نامەکانی پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) و بۆ سەرۆک و سەرکردەی ئیمپراتۆریەت و دەسەڵاتەکانی ناوچەکە هەنگاوێکی تر بوو لە ئاگاییی ئەوانی تر لەبارەی ئایینی نوێوە. لەم چوارچێوەیەدا ژمارەیەک مێژوونووسی خۆرهەڵاتناسی باس لە مێژوویەکی دوورتر لەم مێژووە دەکەن و دەستپێکی لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسییەکان دەگێڕنەوە بۆ ساتەکانی کۆچی هاوەڵانی «موحەممەد» بۆ حەبەشە بۆ لای نەجاشی و مانەوەیان بۆ ماوەیەکی زۆر لەو وڵاتە، تیشک دەخەنە سەر ئەوەی لە ماوەی مانەوەی هاوەڵانی موحەممەددا، ژمارەیەک کاهینی مەسیحی قەڵەم بەدەست و بیرتیژ کەوتنە لێکۆڵینەوەی ئایینە نوێیەکە.

پێم وایە هەڵەمان نەکردووە ئەگەر خاڵی دەستپێکی خۆرهەڵاتناسی بگەڕێنینەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام و پەیامی «موحەممەد» پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) بە دیاریکراوی لە سەروبەندی ناردنی وەفدی پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) بۆ لای قەیسەری ڕۆم. لەو کاتەوە خۆرئاوا بە ئاڕاستەی ئاگایی لە بارەی ئایینی نوێ و پەیامبەرەکەیەوە هەنگاوی نا. بەبێ لەبەرچاوگرتنی پاڵنەرەکانی پشت ئەم گرنگیدانە."[١] هەر نزیک لەم مێژووە و لە چوارچێوەی ئەم بۆچوونەدا، ژمارەیەک لە لێکۆڵەران دەستپێکردنی بزووتنەوەی خۆرهەڵاتناسی دەگێڕنەوە بۆ مەسیحییەکانی نەجران، کاتێک «موحەممەد» پەیامبەر(ﷺ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە و کیانێکی سەربەخۆی دروست کرد و مەسیحییەکانی ناوچەکە بوونی ئەم کیانەیان لە مەدینە بە مەترسییەکی ڕاستەقینە دەزانی.

---

(١)عبد السلام هارون، تهذيب سيرة ابن هشام، المؤسسة العربية الحديثة الطبعة الثانية ١٩٦٤، ص ٣٣.

ئیتر لەو کاتە بە دواوە خوێندەوار و قەڵەم بەدەستەکانیان دەستیان دایە وردبوونەوە لێکۆڵینەوەی دیاردەی ئایینیی نوێ، هەر بۆ ئەم مەبەستە وەفدێک کە پێک هاتبوون لە چەند کەسایەتییەکی دیاری مەسیحییەکانی نەجران و ڕوویان کردە مەدینە و لەگەڵ «موحەممەد» پەیامبەری ئیسلام(ﷺ) کەوتنە گفتوگۆیەکی دووردرێژ، ئەوەی لە سەرچاوە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا بە «چیرۆکی مەسیحییەکانی نەجران» ناسراوە ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسانی مەسیحی ڕاستیی ئەم ڕووداوەیان پشتڕاست کردووەتەوە.

نزیک لەم مێژووە بەشێک لە لێکۆڵەران سەرەتای سەرهەڵدانی خۆرهەڵاتناسی دەگەڕێننەوە بۆ سەرەتای جەنگ و هێرشی سەربازیی موسڵمانان، بە تایبەتیتر لە سەروبەندی جەنگی موئتە لە ساڵی هەشتی کۆچی لە باکووری جەزیرەی عەرەبی کە بە خاڵی پەلهاویشتی موسڵمانەکان هەژمار دەکرێت لە دەرەوەی سنوور جوگرافیایی دیاریکراوی خۆیان.[1]

پاڵنەری سەرەکیی خۆرهەڵاتناسی خۆی لە دژایەتیکردنی ئایینی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی مەسیحییەتدا دەبینێتەوە، نووسین و بەرهەمەکانی «یۆحەنای دیمەشقی» باشترین بەڵگەن لە سەر ئەم ڕاستییە. «یۆحەنا» یەکێک بوو لە فەرمانبەرە باڵاکانی دەوڵەتی ئومەوی و بە یەکەمین مەسیحی دادەنرێت کە بە شێوەیەکی ئاشکرا و فەرمی چالاکییەکانی لەپێناو لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئیسلام چڕ کردووەتەوە و چەندین پەرتووکی لە بەرپەرچدانەوەی موسڵمانان نووسی. لە نموونەی (محاورة مسلم) (ارشادات النصاری في جدل الملسمین)ی لەگەڵ ئەوەی خودی «یۆحەنا» هاوڵاتییەکی خۆرهەڵاتی بووە، بەڵام دەکرێت بە دامەزرێنەری میتۆدی خۆرهەڵاتناسیی ڕادیکاڵی دژە ئیسلام هەژماری

---

(١) قاسم السامرائي، الإستشراق بین الموضوعیة والإفتعالیة الریاض، دار الرفاعي ١٩٨٣، ص ١٩.

بکەین.[١]

ئەم ئاڕاستە ڕادیکاڵییە دژە ئیسلامییەی «یۆحەنا» دواتر بووە ڕێچکەیەک بۆ زۆرێکی تر لە لێکۆڵەرانی مەسیحی، لەوانە: «پیۆ فانس بیزەنتی» کە دەکرێت بە دووەمین خۆرهەڵاتناسی تەبشیریی ڕادیکاڵیی دژە ئیسلام لە دوای «یۆحەنا»ی دیمەشقییەوە هەژماری بکەین (٢٠٢ک=٨١٧) مردووە «پیۆ فانس» لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی «ژیانی موحەممەد» دەڵێت: "پەیامبەر ئیسلام بە هیچ شێوەیەک پەیامبەر نەبووە، بەڵکوو هەموو ئەوەی دەیلێت لە زانا مەسیحی و جوولەکەکانی شامەوە وەری گرتوە، هاوەڵانیشی وەک مەسیحی مژدەدەر لێیان دەڕوانی."[٢]

دواتر ژمارەیەک لە خۆرهەڵاتناسانی مەسیحی لەپێناو بەدەستهێنانی ئامانجەکەیان هەستان و بە وەرگێڕانی قورئان. پێ دەچێت هەوڵەکانی «بەتروسی بەڕێز» یەکەمین هەوڵی ئەم بوارە بوو بێت.

ناوبراو لە فەڕەنسا لەدایک بووە، لە سەرەتای منداڵییەوە دەستی کردووە بە خوێندنی زانستە ئایینییەکان، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا لە سەر دەستی «قەدیس هۆکس» بووەتە ڕاهیب، لە تەمەنی سی ساڵیدا و دوای چەندین ساڵ لە خوێندنی کەهەنووتی بووەتە سەرۆکی دێری کلۆنی (Cluny) لە

---

(١)یۆحەنای دیمەشقی ٦٧٥-٧٤٩ز یەکێکە لە گەورەترین ڕاهیب و لاهوتی مێژووی مەسیحی و کارەکتەرێکی گرنگی کڵێسای خۆرهەڵاتی دەناسرێت، نەوەی حەفیدی کوڕی سەرجونی وەزیر موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان، خاوەنی ئاگاییەکی باش بووە لەبارەی وردەکارییەکانی ئیسلامەوە چەندین بەرهەمی گرنگی نووسیوە لەوانە: محاورة مسلم، ارشادات النصارى في جدل الملسمين، منهل المعرفة. پەرتووکێکی مەوسوعیی گەورەی هەیە لە دووتوێی سێ بەرگدا، سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ کاریگەریی هزری ئایینی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاست، بڕوانە: منير البعلبكي، موسوعة المورد، ج٦، ص١٧.

(٢) سەرچاوەی پێشوو لا ٢١.

خۆرهەڵاتی فەڕەنسا.[1] ساڵی ١١٤٣ز بۆ یەکەمین جار لە سەر دەستی ناوبراو قورئانی وەرگێڕردرایە سەر زمانی یۆنانی. هەڵبەت ئەمە واتای ئەوە نییە کە هەوڵەکانی ناوبراو یەکەمین هەوڵن لەبارەی وەرگێڕانی قورئانەوە، بەڵکوو لێرە و لەویٚ چەندین هەوڵ هەبوون، بەڵام چەند بەشێکی دیاریکراویان وەردەگێڕا ئەویش بە مەبەستی لێڵ و ناڕوون. بە گشتی هەر یەک لە «بەتروسی بەڕێز» (١٠٩٢-١١٥٦) و «ڕیموندلول» (١٢٣٥-١٣١٦) لە قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستدا بە دیارترین ئەو خۆرهەڵاتناسانە دادەنرێن کە جێپەنجەیان لە سەر ئەم بابەتە بەجێهێشتووە. هەوڵەکانی هەر یەکیان دەکرێت بە قۆناغێکی گرنگی ئەم بوارە هەژمار بکرێت، چونکە کاریگەریی زۆریان هەبوو و مشتومڕی زۆریان بە دوای خۆیاندا هێنا.[2] دواتریش لەگەڵ پەلهاویشتنی ئیسلام بۆ ناوچەکانی خۆرئاوا و پەڕینەوەی موسڵمانان بەرەو ئیسپانیا و قووڵاییی ئەورووپا، ئەم هەنگاوانە بوونە مایەی ترسی کڵێسا. بە هۆی ئەم مەترسییانەوە ژمارەیەکی بەرچاو لە قەشە و پیاوانی ئایینیی خۆرئاوا کەوتنەکار لەپێناو ئاگایی و ناساندنی ئایینی و بەرکەوتەی نویٚ لە نموونەی ڕاهیبی فەڕەنسی «گربرت» لە سەدەی دەیەمی زایینی و «بەتروسی بەڕێز» لە سەدەی یازدەهەمی زایینی هەوڵەکانیان لەم بوارەدا بە تەواوی چڕ کردەوە. تەواوی هەوڵەکانیان لە بابەت ئاگایی لە ئیسلام و فێربوونی زمانی عەرەبی و وەرگێڕانی قورئان و ڕەخنەگرتن لە قورئان.[3]

بێتوانایی و لاوازیی هەوڵەکانی کڵێسا لە بەرەنگاربوونەوەی هزری موسڵمانان ناچار بوون ڕێوشوێنی سەربازی بگرنە بەر و جەنگێکی گەورەیان بۆ ماوەی دوو

---

(١) نجيب العقيقي. المستشرقون. ج١ القاهرة: دار المعارف، بدون تاريخ، ص ٦٧

(٢) اسماعيل أحمد عمايرة: بحوث في الأسشتراق واللغة، كلية للأدابة الجامعية الأردنية دار وائل للنشر، ص ٤٢٧.

(٣) يوهان فوك: تاريخ حركة الاستشراق، ص ١٥ نقد الخطاب الاستشراقي، ص ٤٤.

سەدە بەرپا کرد کە دواتر بە قۆناغی جەنگی خاچییەکان ناسرا کە لەپاڵ پاڵنەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەدا، پاڵنەری ئایینی ئامادەیی بەهێزی هەبووە. دواتریش لە چەند قۆناغێکی دیاریکراودا خۆرئاواییەکان بەردەوام بوون لە دزینی کەرەستە و بنەماکانی شارستانیەتی خۆرئاوایی، پاشانیش بە مەبەستی لە نزیکەوە ئاگابوون لە فەرهەنگی موسڵمانان و وەک هەنگاوێک بۆ دژایەتیکردنی چەندین قوتابخانەی لێکۆڵینەوەی زمانی عەرەب و زانستە ئیسلامی و خۆرهەڵاتییەکانیان لە سەرانسەری ئەورووپادا دامەزراند. «لولوس» (Lull raymon) دامەزرێنەری یەکەمین سەنتەری فێرکاری بە مەبەستی ڕاهێنان و فێرکردنی زمانی عەرەبی و زانستە ئیسلامییەکانە، ساڵی ١٢٣٢ لە دوورگەی مالاما ئیسپانی لەدایک بووە باوکی یەکێک بووە لە جەنگاوەرانی دژی موسڵمانان. «لولوس» لەنێو دۆخێکی ئاڵۆزی جەنگی نێوان موسڵمانان و مەسیحییەکان پەروەردە بوو، لە ژینگەیەکی پڕ لە ڕقی دژە موسڵماندا پەروەردە کرابوو. بە جۆرێک ڕقێکی بێسنووری بەرانبەر بە موسڵمان و خۆرهەڵاتی ئیسلامی هەبوو. «لولوس» پێی وابوو کە ڕۆحی ئایینی و لە نێو جەنگی مەسیحییەکان دژی ئیلحادی موسڵمانان بوونی نییە، پێی وابوو مەحاڵە بەرەنگاربوونەوەی ئایینی نوێ بەبێ گەڕانەوە و گرنگیپێدانی پیاوانی مەسیحی بە دەقەکانی قورئان و ئاگایی لە بنەماکانی ئایینی نوێ بەو واتایەی تەنیا لایەنی سەربازی، کەرەستەیەکی سەرکەوتوو نییە بۆ ڕاوەستاندنی هەژموونی موسڵمانان و لاوازکردنیان. هەر بۆ ئەم مەبەستە پشتی لە هەموو خۆشی و مادییەکانی کرد و بە تەواوی خۆی یەکلایی کردەوە بۆ فێربوونی زمانەکانی خۆرهەڵات و زانستە ئیسلامییەکان. دوای نۆ ساڵ لە هەوڵ و ماندووبوونی پەرتووکێکی گرنگی بە ناوی (major Ars) نووسی لەبارەی بنەماکانی مونازەرە لەگەڵ بەڵگەی لۆژیکیی پەیوەست بەم بابەتە. لە چوارچێوەی بۆچوونەکانیدا باس لە پێویستیی دامەزراندنی «سەنتەری فێربوونی زمانی

عەرەبی و بەهێزکردنی توانای مژدەدەرەکانی دژە ئیسلام» دەکات لەپێناوی بەرجەستەکردنی ئەم ئامانجە. داوای دەستخستنی ڕەزامەندی لە یەعقووبی یەکەم و مەلیک جیمزی دووەم کرد، ئەم دامەزراوەیە چالاکییەکانی لە ڕێگەی پەروەردەکردن و ئاراستەکردنی سیازدە مژدەدەرەوە دەست پێ کرد، دواتر ویستی ئەم پرۆژەیە فراوانتر بکات. پاپا «نیکۆلای سێیەم» و «هونوریوسیی چوارەم»ی لەم پرۆژەیە ئاگادار کردەوە، بەڵام هیچ کام لەوانە باوەڕیان بە سەرکەوتنی پرۆژەی لەم شێوەیە نەبوو. پێیان وا نەبوو کە سەرکەوتوو بن لەوەی لە ڕێی چالاکی و مژدەدانەوە بتوانن کاریگەری لە سەر موسڵمانان دروست بکەن. لەگەڵ ئەوەی «لولوس» لە ناوەندی کڵێسا پشتیوانییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام سوور بوو لە سەر هیوا و ئەزموونە تەبشیرییەکان و هەوڵەکانی پەیوەست بەم بابەتە، بەم هۆیەوە پەرتووکێکی لەبارەی ئەزموونی مژدەدەرانی خۆیەوە نووسی بە ناوی «Blanguerna» و ساڵی ١٢٨٥ بڵاوی کردەوە.

دوای سەرکەوتنی بۆ پلەی ئەسقەفی و دواتریش بابەوی، دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پلانی لەمێژینەی خۆی. دەسەڵاتە ئایینییە کاریگەرییەکەشی باش بوو بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی. لە هەنگاوی یەکەمدا چەندین دەستەی مژدەدانی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕێبازی کاسۆلیکی و فێربوونی زمانە جیاوازە جیهانییەکانی ڕەوانەی زۆرێک لە وڵاتانی جیهان کرد.

دواتر ئەم بابەتە پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، بە تایبەتی لە دوای کۆنگرەی ڤیەننا کە تێیدا پاپا «پۆلس» لە کۆتاییی تەمەنیدا فەرمانێکی دەرکرد بەپێی ئەو فەرمانەی پاپا هەر پێنج زانکۆ بەناوبانگەکەی ئەورووپا: «پاریس، ئۆکسفۆرد، بولونیا، سالامانکا، زانکۆی ئیدارەی ناوەندی پاپا»ی ناچار کرد کە چەند مامۆستایەک دەستنیشان بکەن بۆ ئەوەی قوتابییان

فێری زمانەکانی خۆرهەڵات (عەرەبی، عیبری، یۆنانی و کلدانی...)[١] بکەن. کۆنگرەی ڤیەننا، گوزارشتە لە شوورای گشتیی کەشیشەکانی جیهان لە کڵێسای شاری ڤیەننا. ساڵی ١٣١٢ز بە پێشنیاری «ڕوجەر بیکون» و پێداگریی پاپا «لولوس» لەو کۆنگرەیەدا، بڕیار درا بە خوێندنی زمانە خۆرهەڵاتییەکان (عەرەبی، یۆنانی، عیبری و سریانی) لە هەر یەک لە زانکۆکانی «پاریس، ئۆکسفۆرد، بولونیا، ئافینیون، سالامانکا، زانکۆی ناوچەی پاپا «Kurie»»[٢].

دواتر چەندین قوتابخانەی فێربوونی زمان تایبەت بە زمانە خۆرهەڵاتییە زیندووەکان لە فەڕەنسا بە سەرکردایەتیی خۆرهەڵاتناسی فەڕەنسی «سلفستر دی ساسی» (Sacy de Silvester) کە هەر یەکێک لەو قوتابخانانە دەورێکی کاریگەریان هەبوو لە سەر ئاشناکردنی ناوەندە گرنگ و زانستییەکانی خۆرئاوا بە زمانی عەرەبی و کەلەپووری ئیسلامی. لەو سەردەمەدا ڕۆشنبیران ئەو کەسانە بوون کە لە ژێر کاریگەری و هەژموونی خۆرهەڵاتی و ئیسلامیدا بوون. بە پێچەوانەی ئەوەی ئێستاوە باشترین بەڵگە بۆ بوونی ئەو ژمارەی دەستنووسەیە لە پەرتووکخانە و دەستنووسخانەکانی وڵاتانی خۆرئاوایی هەن. لە ئێستایشدا بە هەزاران دەستنووس لە ناوەندە زانستی و ئەکادیمی و مۆزەخانەکانی ئەوروپادا پارێزراون، لە نموونەی ئەکادیمییەکانی خۆیان پاراستووە. لەوانە: پەرتووکخانەی ئەسکوریال، پەرتووکخانەی مەدریدی نیشتمانی، پەرتووکخانەی کۆمەڵەی لێکۆڵینەوە نیشتمانییەکان (المکتبة العربیة الإسبانیة - hispana - arabico bibliotheca)[٣].

لە چوارچێوەی گرنگیدان بە لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسییەکان، پەرتووکخانەی بەرلینی نیشتمانی زیاد لە دە هەزار دەستنووسی لە خۆ گرتووە. تەنیا پێرستی

---

(١) یوهان فوک: تاریخ حرکة الاستشراق، ص٣١.

(٢) إدوارد سعید: الاستشراق، ص ٩٥.

(٣) محمود علي مکي: فرانشسکو کودیرا، دار الکتب والوثائق ٢٠٠٢، ص ٣.

دەستنووسە ئیسلامی و عەرەبییەکان نێو پەرتووکخانەکەی لە چوارچێوەی ١٠ بەرگدا کۆ کراونەتەوە. لە پەرتووکخانەی زانکۆی «جوتنجن» باشووری ئەو وڵاتە سێ هەزار دەستنووسی تێدا هەڵگیراوە.

خۆرهەڵاتناسی وەک بزووتنەوەیەکی ئایینی پەرتوبڵاو، بەڵام دواتر دوای جەنگی خاچییەکان و قۆناغی سەردەمی ئیمپریالیستی، وەک بزاوتێکی ڕێکخراو پێشچاو کەوت. بەتایبەتیتر دوای سەردەمی ئیمپریالیستی دەستیان کرد بە چەندین چالاکیی ڕێکخراو[1] لە دیارترین چالاکییەکانیان:

**یەکەم:** دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەی پەیوەست بە لێکۆڵینەوە ئیسلامی و خۆرهەڵاتییەکان بە چەندین زمانی جیاواز لەوانە: «گۆڤاری ئیسلام» بە سەرپەرشتیی خۆرهەڵاتناس «کارل بیکر» و لەلایەن پەیمانگای زمانە خۆرهەڵاتییەکانی سەر بە زانکۆی هامبۆرگ دەردەچووکە یەکێکە لە دیارترین خۆرهەڵاتناسە ئەڵمانییەکان[2] چەندین چالاکیی زانستی ورديان پێشکەش کرد.

گۆڤاری «ئۆیانس» Oriens تایبەت بە لێکۆڵینەوەی خۆرهەڵاتناسی و گۆڤاری (Asiatique Jonurnl) ڕۆژنامەی (کۆمەڵەی ئاسیایی بەنگالی – Asiatic the of Journal) زمانحاڵی کۆمەڵەی (Society Bengal of) لە هیند و گۆڤاری «کۆمەڵەی مەلەکیی ئاسیایی».

**دووەم:** ئەنجامدانی چەندین کۆنگرەی نێودەوڵەتیی «یەکێتیی ئەکادیمیی نێودەوڵەتییەکان» یاخود «یەکێتیی نەتەوەیی کۆڕە زانستییەکان» هاتە دامەزراندن کە چاوێردیکردنی کۆنگرە خۆرهەڵاتناسییە نێودەوڵەتییەکانی لە ئەستۆدا بوو. بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٨٧٣ز لە پاریس یەکەمین کۆنگرەی

---

(١) بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٢٣

(٢) محمد عوني عبدالرؤوف: جهود المستشرقين في التراث العربي المجلس الأعلى للثقافة ٢٠٠٤، ص ٢٣

خۆی گرێ دا.[١] دواتر چەندین کۆنگرە و کۆنفرانسی تر بەستران، لەوانە:

١- کۆنگرەی خۆرهەڵاتناسیی نێودەوڵەتیی (بیست و هەشت):

ئەم کۆنگرەیە ساڵی ١٩٤٨ لە پاریس بەسترا، تێیدا چەندین بابەتی گرنگی پەیوەست بە خۆرهەڵاتەوە گفتوگۆ کرا. لەوانە: مێژوو، ئاداب، لێکۆڵینەوە قورئانییەکان، فەلسەفە، زمان، شێوەزارە خۆرهەڵاتییەکان و کاریگەریی زمانە خۆرئاواییەکان لە سەر زمانە خۆرهەڵاتییەکان. هەر لەم کۆنگرەیە پێشنیاری پێداچوونەوە بە دائیرەتولمەعەریفی ئیسلامیدا کرا. ئەمە جگە لە پێشنیاری زیادکردنی بەشی لێکۆڵینەوە مەسیحییەکانی خۆرهەڵات و هێنانەپێشەوەی زمانی عەرەبی لە پاڵ زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی و تورکی لە کۆنگرەی داهاتووی گرێدراو لە ئیستەمبوڵ.[٢]

٢- کۆنگرەی خۆرهەڵاتناسانی نێودەوڵەتیی (بیست و دووەم):

لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥١ بە ڕێوە چوو. کۆنگرەکە پازدە لایەنی گرنگی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لەوانە زمانی عەرەبی و ئادابەکانی «مێژوو و ڕۆشنبیری کۆمەڵناسی»، ژمارەیەکی بەرچاو لە خۆرهەڵاتناسان تێدا بەشدار بوون. لەوانە خۆرهەڵاتناسی بەناوبانگ: «هاملتون جب»، «لوی ماسنیون»، «گارسیا گۆمینت»، «مینورسکی» ئەمە جگە لە بەشداریی ژمارەیەکی بەرچاو لە پیاوانی دیاری ئایینی مەسیحی لە نموونەی قەشە «لاتور- Lator» قەشە «باریخا - Pareja»[٣]

---

(١) بروانە: تاريخ الدراسات العربية في فرنسا، ص١٩٦، مطبقانى المؤتمرات الاستشراقية الحديثة مجلة الشريعة والدراسات الاسلامية الكويت عدد ٤٦.

(٢) فؤاد افرام البستاني، مؤتمر المستشرقين الدولي الحادي والعشرون. في المشرق، السنة الثانية والأربعون، تشرين أول – كانون الأول ١٩٤٨، ص ٤٨١-٥٠٠.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٢-١١٦.

**٣- کۆنگرەی خۆرهەڵاتناسیی نێودەوڵەتیی (بیست و چوار):**

ئەم کۆنگرەیە لە ٢٨ی ئۆگستۆی بۆ ٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٧ لە میونخ بە بەشداریی دەیان خۆرهەڵاتناسی ئەورووپی و ڕووسی لێکۆڵیاری عەرەبیی مەسیحی و موسڵمان بەڕێوە چوو.

**٤- کۆنگرەی نێودەوڵەتیی لێکۆڵینەوە ئاسیاییەکان و باکووری ئەفریقا (سی و پێنج):**

لە ١٩٩٧/١٢/٧ لە بۆدابست بە ڕێوە چوو، جیاواز لە کۆنگرەکانی تر گرنگییەکی سیاسیی گەورەی پێ درا، هەر یەک لە وەزیری دەرەوەی سعوودی و سەرۆکی ئەردەن و سەرۆکی مەجەڕ و چەندین کەسایەتیی گەورەی سیاسی و ئەکادیمیی نێودەوڵەتیی تێیدا بەشدار بوون و چەندین بابەتی گرنگی پەیوەست بە لێکۆڵینەوەی خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی ئیسلامی خرانە ڕوو.

**٥- کۆنگرەی ساڵانەی پەیمانگای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست - ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

پەیمانگای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ساڵی ١٩٤٧ وەک یەکەمین پەیمانگای ئەکادیمیی گرنگیدەر بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دامەزرا. ئامانجی سەرەکیی ئەم پەیمانگایە لێکۆڵینەوەی ورد بوو لە دۆخی سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتیی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، وەک گەرمترین ناوچەی سیاسیی جیهان. لە ڕووکەشدا ئەم پەیمانگایە پەیوەندییەکی ئەوتۆی نییە بە حوکوومەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە، بەڵام بە جۆرێکی تر چەندین لێکۆڵینەوەی گرنگی پێشکەشی دامەزراوە سەربازی و سیاسی و هەواڵگرییەکانی ئەو ویلایەتانە کردووە. بە مەبەستی سوود لێ وەرگرتنیان لە داڕشتنەوەی سیاسەتی ئەمەریکیی دروست سەبارەت بەو ناوچانە، ئەم پەیمانگایە لە ئێستا بە گەورەترین و چالاکترین پەیمانگای خۆرهەڵاتناسی بە گشتی و خۆرهەڵاتناسی (خۆرهەڵاتی ناوەڕاست)

دەناسرێت. لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرتەکانی لە نێوەندە سیاسی و ئەکادیمییەکانی جیهاندا پێگە و گرنگیی تایبەتیی خۆیان هەیە. لە ماوەی دروستبوونییەوە چەندین کۆنگرەی گرنگی پەیوەست بە بابەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەستووە، لەوانە:

- کۆنگرەی ساڵانەی ساڵی ١٩٥٠، لە ژێر ناوی «ئیسلام لە جیهانی نوێدا» لە ٩-١٠ مارسی ساڵی ١٩٥١ بەڕێوە چوو. ژمارەیەکی بەرچاو لە خۆرهەڵاتناسان بەشدارییان تێدا کرد لەوانە: «بایرد دودج»، «فیلیب حتی»، «ولفرد کانتول سمیت»، «فیلیب ئایرلاند«.[1]

- کۆنگرەی ساڵانەی ساڵی ١٩٩٥: لەم کۆنگرەیەدا چەندین بابەتی گرنگی وەک کێشەی قودس و کێشەکانی جەزائیر و کەنداو و دەوڵەتانی ناوەند و باشووری ئاسیا و خرانە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

- کۆنگرەی ساڵانەی دیسەمبەری ١٩٩٦: بەستنی ئەم کۆنگرەیە هاوکات بوو لەگەڵ تێپەڕینی پەنجا ساڵ بە سەر دامەزراندنی ئەم پەیمانگەیە. کۆنگرەکە لە ژێر ناونیشانی «پەنجا ساڵ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست» بە ئامادەبوونی نزیکەی شەشسەد ئەندامی پەیمانگە و لێکۆڵەران، نوێنەری دامەزراوە سیاسی و زانستییەکان و خوێندکارانی زانکۆ بە ڕێوە چوو. وتاری کردنەوەی کۆنگرە لەلایەن پرۆفیسۆر «جۆن واتربری» لە ژێر ناوی «خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەنێوان فۆکۆیاما و سەددام حوسەین» خوێنرایەوە. کۆنگرەکە چەندین بابەتی گرنگی پەیوەست بە دۆخی سیاسی و ئابووری و گەشەسەندن و پاشەکشەی ڕۆشنبیری و عالەمانییەت و ئیسلام و دەوڵەت و کۆمەڵگە لە خۆ گرتبوو.

---

(1) Preface to Islam in The Modern World. edited by Dorothea Seelye Franck Washington: Middle East Institute, 1951.

لە محمد حسین، الإسلام والحضارة الغربية... سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣٣.

- کۆنگرەی ساڵانەی ساڵی ١٩٩٧: ئەم کۆنگرەیە لە ژێر ناونیشانی «خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە بەردەم سەدەی بیست و یەکەم» لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٧ بە ڕێوە چوو. تێدا چەندین بابەتی گرنگی لە نموونەی «کێشەی فەلەستین-ئیسرائیل، بزووتنەوە ئیسلامییەکانی خۆرهەڵات و ئیسلام و کۆمەڵگە و پێگەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، وزە لە ناوەڕاستی ئاسیا، پرۆسەی ئاشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.» لەخۆ گرتبوو.[1]

جگە لەم کۆنگرانە بەپێی قۆناغە جیاوازەکان چەندین کۆنگرەی تر بەستران کە بە شێوەیەکی فراوانتر، کۆنگرەی سیاسی و پەیوەست بە ڕووداوە سیاسییەکانی خۆرهەڵاتەوە لەوانە،

کۆنگرەی «ئاشتی و جیهاد – هاوپەیمانییەتیی ئیسلامییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوینی گۆڕراودا»، ئەم کۆنگرەیە لە ٣٠ی مارسی تا ١ی ئەپرێلی ساڵی ١٩٩٦ لەلایەن سەنتەری موشیەدایان بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە بەشداریی چەندین لێکۆڵیاری و خۆرهەڵاتناسی ئەمەریکی و ئەورووپی و بەڕێوە چوو، تێدا چەندین بابەتی گرنگ لەبارەی ئاشتی و جیهاد و هەستانەوەی ئیسلامییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەڕێوە چوو. وەزیری پێشووی دەرەوەی ئیسرائیل «شیمۆن پێرێز» وتاری دەستپێکی کۆنگرەکەی خوێندەوە و تیشکی خستە سەر ئەوەی کە «تیرۆری ئیسلامی» (بە گوتەی ئەو) مەترسیی ڕاستەقینەیە لە سەر پرۆسەی ئاشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. دواتر چەندین لێکۆڵیاری گەورەی خۆرئاوای بابەتەکانیان پێشکەش کرد، لەوان «دانیال بایبس» Daniel Pipes «ئان ئەلیزابیس مایور» Ann Elizabeth Mayer «گودیس میللر Judith Miller».[2]

---

(1) The Middle East Institute Newsletter. Vol. 48, No. 6, November 1997

(2) The Moshe Dayan Center for Middle Eastern and North African Studies Bulletin. No. 24, Fall 1996.

خۆرهەڵاتناسەکان جگە لە مەسیحییەکان و ناوەندەکانی بڕیاری مەسیحی لەلایەن چەندین گرووپ و کۆمەڵەی خۆرهەڵاتییەوە پشتیوانی دەکران، لە بەرانبەردا ئەوانیش پشتیوانیی هەر جووڵانەوەیەکی دژە ڕەسەنایەتیی ئیسلامی خۆرهەڵاتیان دەکرد و لەم لایەنەوە پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ شیوعییەکانی خۆرهەڵات دروست کردبوو. ساڵی ١٩٢٠ کۆمەڵەیەک دروست بوو بە ناوی «ڕابیتەی ئازادکردنی خۆرهەڵات» لەپێناو پەروەردەکردن و ئاڕاستەکردنی شیوعییەکانی خۆرهەڵات بەگشتی و وڵاتانی ئیسلامی بەتایبەتی [١] دواتر دەیان سەنتەری جۆراوجۆر سەبارەت بە چاودێریکردن و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانی جیهانی ئیسلامی دەرکەوتن لە نموونەی «ڕابیتەی ئەمەریکی بۆ لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتییەکانی ناوەڕاست» ساڵی ١٩٤٦- ١٩٦٥ ژمارەی زانکۆ ئەمریکییەکان کە خوێندنی باڵای پەیوەست بە خۆرهەڵات و بە دیاریکراوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەخۆ گرتبوو بۆ بیست و هەشت زانکۆ، بە شێوەیەک مادەکانی خوێندنی نێو ئەم زانکۆیە ٨٥٠ مادەی لەخۆ گرتبوو، ژمارەی مامۆستاکانی نێو ئەم بوارە گەییشتە ٣٠٠ مامۆستا.[٢] دواتر لێکۆڵەرانی نێو ئەو بوارە بە شێوەیەک ژمارەیان زیادی کرد ساڵی ١٩٩٢ «ڕابیتەی لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتییەکان»لە ڕاپۆرتێکدا ناوی لێکۆڵەرانی ئەم بوارە بە هەزاران لێکۆڵەر دەخەمڵێنێت. تەواوی لێکۆڵینەوە شیکارییەکانی ئەم کۆمەڵەیە، ئاڕاستەی بەرپرسە سەربازی و سیاسی و حوکمییەکانی ئەمەریکا دەکرێن، تاوەکوو لە ڕێیەوە ستراتیژیەتی سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەکیی ئەمەریکا دابڕێژن.

---

(١) الاسلام قوه الغد ص ٢٤٥.

(٢)- هەمان سەرچاوە، لا ٥٣.

# پاڵنەرەکانی بزووتنەوەی خۆرهەڵاتناسی

## یەکەم: پاڵنەری ئایینی

پاڵنەری ئایینی یەکێکە لە دیارترین پاڵنەرەکانی خۆرهەڵاتناسی. ئیسلام لە سەرەتاوە وەک ئایین دیاردەیەکی نامۆ بوو بەرانبەر بە مەسیحییەت، وەک ئایینی و خۆرئاوا وەک کیانێکی مەسیحی، زیاد لەمە مەسیحییەکان بە مەترسییەوە لە هەژموونی ئیسلامیان دەڕوانی. هەڵەمان نەکردووە گەر پاڵنەری سەرەتایی خۆرهەڵاتناسی بە بەرگریکردن لە مەسیحییەت لە بەرانبەر هەژموونی ئایینی ئیسلام بزانین.

زیاد لەمە وێناکردنی ئەم ئایینە وەک ئایینێکی لێوانلێو لە گومڕایی لەم پێناوەیشدا ئاگایی لەبارەی زمانی ئیسلام و شارەزایی لە هەمبەر بابەتەکانی پەیوەست بە ئایینی نوێوە پێویست بوو، وەک ئەوەی «بەتروسی بەڕێز» وێنای دەکات و تیشک دەخاتە سەر ئەوەی تێگەیشتن لە ئیسلام مەحاڵە بەبێ ئاگایی لە زمانی عەرەبی زمانی ئیسلام و خاڵە لاوازەکانی ئەو ئایینە. هەر لەم ڕوانگەیەوە لە قۆناغی دواتردا پاڵنەری ڕۆحیی دوژمنایەتیی ئایینی بووە مایەی هەڵگیرساندنی هێرشی خاچییەکان. هەموو ئەم هەوڵانەی پیاوانی کەنیسە لەپێناوی بەرگریکردن و پاراستنی هزری ئایینیی مەسیحییەکان بوو لە گومڕایی و زەندیقییەکانی ئیسلام.

دواتر ئەم بابەتە هەنگاوی بەرەو پێشتری نا کە خۆی لە هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئایینی موسڵمانان‌دا دەبینییەوە وەک ئەوەی «ڕوجر بیکون» (١٢٩٤ز) باس لەوە دەکات پێویستە کڵێسای خۆرئاوایی تەواوی هەوڵەکانی لەپێناو

گۆڕینی ئایینی موسڵمانەکان بۆ مەسیحییەت بە شێوەیەکی ئاشتییانە بخاتە گەڕ. هەر بەم هۆیەوە لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکان لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە خۆرئاواییەکان پشکی شێری بەرکەوت، تەنانەت بە مەبەستی تێگەیشتنی زیاتر لە ئیسلام قەشە «بەتروس سالْف» ساڵی ١١٤٣ز هەستا بە بڵاوکردنەوەی یەکەم وەرگێڕانی لاتینیی قورئانی پیرۆز، بە جۆرێک ئەم وەرگێڕانە بووە سەرچاوەی زۆرێک لە لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە قورئان و ئیسلام هەتاوەکوو سەدەی حەڤدە.[١]

کەواتە پرۆژەی بەمەسیحیکردن یەکێک لە پاڵنەرەکانی خۆرهەڵاتناسی و سەرقاڵبوونی پیاوانی کڵێسا بە وەرگێڕانی قورئانی و پیرۆز و گرنگیدان بە زانستەکانی زمانی عەرەبی[٢] وەک ئەوەی «یوهان فوک» لە چوارچێوەیەکی گشتیدا خۆرهەڵاتناسی بە کەرەستەیەک بۆ بزووتنەوەی مژدەدان دەناسێنێت، وەک دەڵێت: "خۆرهەڵاتناسی لە سەرەتاوە جگە لە کەرەستەیەک بۆ خزمەتی مژدەدان زیاتر شتێکی تر نەبوو"[٣]

هەوڵەکان بۆ زیندووکردنەوەی بزاوتی مژدەدان جۆرێک لە پاشەکشەی بە خۆیەوە بینی و دواتر پیاوانی کڵێسا جۆرێک لە بێئومێدییان سەبارەت بەم بابەتە بۆ دروست بوو، هەر بەم هۆکارە ساڵی ١٣١٢ز لە کۆڕبەندی کەنەسی لە «فین» لە باشووری خۆرهەڵاتی فەرەنسا گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی «بە هۆی دڵڕەقیی موسڵمانەکان گۆڕینی ئایینی موسڵمانەکان بۆ سەر مەسیحییەت مەحاڵە، ئەوان بە خراپترین شێوە بەبێ بەها لە پەرتووکی پیرۆز دەڕوانن.»[٤]

---

(١) موسوعة المستشرقيين، عبد الرحمن البدوي، ص ١١١.

(٢) يوهان فوک، تاريخ حركة الإستشراق ص١٦.

(٣) ساسي سالم الحاج، نقد الخطاب الاستشراقي ٤٢/١-٤٣.

(٤) ضياء الدين ساردار، الأستشراق: صورة الشرق في الأداب والمعارف الغربية، ترجمة فخري صالح نشر هيئة أبو ظبي للسياحة والثقافة الطبعة الأولى ١٤٣٣ هـ ص ٥٤.

لێکۆڵەری میسری «عومەر فەرووخ» دەڵێت: "دەستپێکی بزووتنەوەی خۆرهەڵاتناسی لە سەردەستی ڕاهیب و پیاوانی ئایینی مەسیحی دەستی پێ کرد. بەو پێیەی زانست و خوێندەواری لەو کاتەی ئەورووپا تا ئاستێکی بەرچاو کورتکراوە بوو لە پیاوانی ئایینی مەسیحیدا، هەر لەبەر ئەوە سەیر نییە کە «جربرت gerbert» ی فەڕەنسی کە دواتر بە «بابا سلفستر» ٩٩٩-١٠٠٣ز ناسرا بە یەکەمین خۆرهەڵاتناس ناو ببەین.[١]

ئەمە جگە لە «بەتروسی بەڕێز» کە لە یەک کاتدا چەندین ناوەندی زانستی ئەکادیمی و ئایینی بەڕێوە دەبرد و هەر یەک لە «بسکواڵی» ئیسپانی و «ئیدوارد بوکوک» کە زۆربەیان ڕاهیب و پیاوانی ئایینی مەسیحی بوون.

بابەتی بەڕێوەبردنی ناوەندە ئەکادیمییەکان لەلایەن کڵێساوە ڕاستی پاڵنەری ئایینی پشتی بزووتنەوەی خۆرهەڵاتناسی پشتڕاست دەکەنەوە لەوانە دامەزراندنی پەیمانگای زمانە خۆرهەڵاتییەکان لە فەڕەنسا لەلایەن پاپا «هۆنۆریۆس» لە ناو ئەو دامەزراوانەدا زۆرترین تیشک خراوەتە سەر بابەتە ئیسلامییەکانی وەک قورئان و فەرموودە و فیقهی ئیسلامی. زیاد لەمە بە ڕێگوزەرێکی خێرا بە نێو بەرهەم و لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵتناسەکان دەبینین زۆرترین بابەتیان لەبارەی ئیسلام و ناشرینکردنی ئیسلام و بەهێز نیشاندانی ئایینی یەهوودی و مەسیحی نووسیووە. هەر لەم چوارچێوەیەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە خۆرهەڵاتناسەکان ساڵی ١٩٠٧ لە کۆنگرەی لەندەن، بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی جوولەکەیان خستە پێشچاوی بەرپرسانی بەریتانی، دواتر بەرپرسانی بەریتانیا کاریان بۆ ئەم بابەتە کرد و دواتر دەوڵەتی ئیسرائیلی هاتە دامەزراندن.[٢]

---

(١) عمر فروخ: الإستشراق بحث للمستشرقين مالهم وما عليهم سلسلة كتب الثقافة المقارنة بغداد العدد ١ بدون تاريخ طبع، ص ٤٥.

(٢) الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، للدكتور محمود حمدي زقزوق، دار المعارف بمصر_القاهرة. ص٣٧.

## دووەم: پاڵنەری سیاسی و داگیرکاری

یەکێکی تر لە پاڵنەری پشت بزاوتی خۆرهەڵاتناسی، داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامی و تێکشکاندنی ئیرادەی سیاسیی موسڵمانان بوو. هەر لە سەرەتای هێرشی خاچییەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، خودی کڵێسا و پاپا و پیاوانی کڵێسا ڕاستەوخۆ سەرکردایەتیی ئەم هێرشانەیان دەکرد بە بانگەوازی خودی پاپا و کڵێسا بە دەیان هەزار چەکداری مەسیحی ڕەوانەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی کران کە مەبەستیان لێی داگیرکاریی خاکی موسڵمانان و پووکاندنەوە هەژموونی سیاسی و سەربازییانە بوو.

بە درێژاییی مێژوو هەتاوەکوو ئێستاشی لەگەڵ بێت، هیچ هێرشێک نەکراوەتە سەر جیهانی ئیسلامی بەبێ لێکۆڵینەوە و ئاڕاستەکردنی پێشوەختەی خۆرهەڵاتناسان و لێکۆڵەرانی پەیوەست بە خۆرهەڵات. دواتر لە قۆناغی ئیمپریالیستیی نوێشدا بە هەمان شێوە داگیرکەران بە چاوساغیی خۆرهەڵاتناسان سەرکەوتوو بوون لە دابەشکردنی جیهانی ئیسلامی و تێکشکاندنی تواناییی و سیاسی و سەربازی و ئابووریی جیهانی ئیسلامی. وەک دکتۆر «موحەممەد فەتحوڵڵا زیادی» ئاماژەی پێ دەکات و باس لەوە دەکات کە ڕەنگە زۆرێک لە خەڵکی نەزانن کە «ناپلیۆن» بە سوودوەرگرتن لە پەرتووکی (الكونت دی فولنی)ی فەرەنسی بە ناوی «گەشتێک لە میسر و سووریا» پلانی هێرش و داگیرکاریی بۆ سەر جیهانی ئیسلامی داڕشت، ئەم پەرتووکەی ناوبراو ساڵی ١٧٨٧ لە دوو توێی دوو بەرگدا چاپ و بڵاو کرایەوە. «فولنی» دوای چەندین ساڵ لە گەڕان و لێکۆڵینەوە لە وڵاتانی ئیسلامی، گەیشتوەتە ئەو بڕوایەی کە خۆرهەڵات دەکرێت پاروویەکی چەور بێت بۆ ئەوەی فەرەنسا زۆر بەئاسانی داگیری بکات و بتوانێت هەژموونی ئیمپریالیستیی خۆی بە سەردا بسەپێنێت.[1]

---

(١)بڕوانە: دەقی قسەی دکتۆر موحەممەد فەتحوڵڵا الزيادی لە پەرتووکەکەی خۆیدا بە ناوی الإستشراق اهدافه و وسائله، لا: ٣٩، ب: دار قتيبة ١٩٩٨.

هەنگاوی پاڵنەری خۆرهەڵاتناسی بە پاڵنەری سیاسی دوای بڵاوبوونەوەی هەژموونی عوسمانییەکان و ئازادکردنی بەشێک لە ئەورووپا و نوێبوونەوەیان لە ڤییەنا، زیاتر پەرەیسەند. دواتر هەژموونی عوسمانییەکان لە سەر ئەورووپا بووە جێگەی مەترسی بۆ تەواوی پیاوانی ئایینی و سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا.

لە ڕاستیدا خۆرئاواییەکان جگە لە ئیسلام، وەک پاڵنەر و عوسمانییەکان وەک موسڵمان، تێڕوانینێکی تریان نەبوو بۆ عوسمانییەکان وەک ئەوەی «ڕۆدنسۆن» ئاماژەی پێ دەکات، لەو قۆناغەدا ئیسلام و تورک وەک دووانەیەکی دانەبڕاو لە یەکتر مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا و تا ئاستێک وشەی (Turc - تورک) ببووە هاوتای وشەی موسڵمان.[1] ئیتر تورکە موسڵمانەکان بوونە سەرکردەی بەهێزترین ئیمپراتۆریەت لە ئەورووپا، بوونە خاوەنی شارێکی گرنگ و گەورەی سەرسوڕهێنەری وەک قوستەنتینە کە لە ئێستا بە هۆی پێشکەوتنی کەرەستەکانی گەیاندنەوە لە ناوەندی ئەورووپاوە تەواو نزیک بووەتەوە.

هەژموونی بابولعالی (سەرکردایەتیی دەوڵەتی عوسمانی) هەستێکی سەیر و جۆرێک لە ترسی لای ئەورووپییەکان دەست کردبوو.[2] ئیسلام وەک پاڵنەر و داینەمۆی توانایی تورکەکان بوو، بە جێگەی تێڕامان بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە خاڵە بەهێز و لاوازەکان تێگەیشتن لە هەستی ئایین و پاڵنەری ئایدیۆلۆژی و هزری تورکەکان، بەشێک لە لێکۆڵەران بە پاڵنەری ئابووری و سیاسی و ئایینی دەستیان کرد بە پێشکەشکردنی لێکۆڵینەوەکانیان لەبارەی ئیسلامەوە کە گوزارشت بوو لە هێزی مەعنەویی عوسمانییەکان.

---

(١) جاذبية الاسلام مكسيم ردونسون، ترجمة الياس مرقص، الطبعة الأولى دارالتنوير للطباعة والنشر، لبنان، ص ٣٨.

(٢) جاذبية الاسلام هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٩

دەستنیشانکردنی خۆرهەڵاتناسان وەک نوێنەر و باڵیۆزی وڵاتانی ئەورووپا و خۆرئاوایی لە وڵاتانی ئیسلامی پشتڕاستکەرەوەی ئەم بابەتەیە.

زۆرێک لە وڵاتانی خۆرئاوای کەسانی لێکۆڵەر و ڕۆژهەڵاتناسیان دەکردە نوێنەری فەرمی و سیاسیی خۆیان لە وڵاتانی ئیسلامی لە نموونەی «ئەمیلیو ڤارجیا جومیز» بەڕێوەبەری پەیمانگای ڕۆشنبیریی ئیسپانیی گرنگیدەر بە کاروباری خۆرهەڵات کە بۆ ماوەیەک باڵیۆزی ئیسپانیا بووە لە بەغداد و لوبنان، چەندین لێکۆڵینەوەی گرنگی پەیوەست بە مێژوو و ئەدەبی ئیسلامی هەیە. «لیونی کایتانی» (١٨٦٩-١٩٢٦) و «هودی جی» «جرترودبل» و «لۆرنس» و «سانت فیلی» و هەموو ئەمانە لە یەک کاتدا لێکۆڵەر و خۆرهەڵاتناس و نوێنەری فەرمی و سیاسیی خۆرئاوا بوون لە جیهانی ئیسلامیدا.

## سێیەم: پاڵنەری ئابووری

پاڵنەرێکی ئامادەیی خۆرهەڵاتناسییە، چ لە سەر ئاستی کۆمپانیا و بەرهەمهێنەران، چ لە سەر بەرژەوەندیی ئابووریی وڵاتانی خۆرئاوا وەک درێژەدانێک بە خودی پاڵنەرە سیاسییەکە.

بەو پێیەی پاڵنەری سەرەکیی پاوانخوازییە سیاسی و سەربازییەکانی خۆرئاوا لە بنەڕەتدا بە پاڵنەری ئابووری ئەنجام دراون. داڕێژەرانی ستراتیژیەتی خۆرئاوایی پێش ئەنجامدانی هەر هێرشێک لێکۆڵینەوەیەکی وردیان لە سەر جیهانی ئیسلامی ئەنجام داوە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە لایەنی ئابووریی خۆرهەڵاتی ئیسلامییەوە، تاوەکوو ئەوەی بتوانن لە ڕێگەیەوە زۆرترین سەروەت و داهاتی جیهانی ئیسلامی بۆ خۆیان بەرن و تاکی موسڵمان بکەنە تاکێکی دەستپانکەرەوە، بە جۆرێک کە هەمیشە چاوەڕوانی دەستی ئەوانی تر بێت.

ئەوەی ئاماژەمان پێ کرد ڕێگوزەرێکی خێرا بوون بە نێو خۆرهەڵاتناسی و دیارترین پاڵنەرەکانی پشتی ئەم بزاڤە، تاوەکوو ئەوەی کاتێک دەگوترێت خۆرهەڵاتناسەکان دەورێکی کاریگەریان بنیووە لە پەرتەوازەکردن و لێکهەڵوەشاندنەوەی جیهانی ئیسلامی.

بە لای موسڵمانانەوە جێگەی سەرسامی نەبێت ئەوەی کە «ئومیس غو» پێشتر ئاماژەی پێ کرد، کاتێک باسی لەوە دەکرد کە «هیچ کات ڕێگە نادەین موسڵمانان یەکڕیز بن، دەبێت بۆ هەمیشە پەرە بەم سیاسەتەمان بدەین.»[1]

بەدڵنیایی تەواو ڕاستگۆ بوون لە بانگەشەکەیان، بێگومان ئەو فۆڕمە لە سیاسەتکردن دژی موسڵمانان بەردەوامە، بگرە زیاتر و زیاتر برەوی پێ دراوە و بە شێوەیەکی مەترسیدار لە نێو جیهانی ئیسلامیدا ڕەگی داکوتیوە و چەندین لق و پۆپی جیاوازی لێ جیا بووەتەوە. بۆ ئاگادار بوون لە تەواوی ڕەگ و لقەکانی پێویستە چاوێکی خێرا بخشێنین بە دۆخی جیهانی ئیسلامیدا. ئەوەی جێگەی هەڵوێستەکردنە هەمیشە خۆرئاواییەکان هزری ستۆکی خۆیان بۆ جیهانی ئیسلامی هەناردە دەکەن، ئەوەی کە خۆیان هیچ سوودی لێ نابینن لە نموونەی هزری نەتەوەیی.

هزری نەتەوەیی یەکێکە لەو بابەتانەی کە خۆرئاواییەکان هەناردەی جیهانی ئیسلامییان کردووە، دەبینین دوای ئەوەی بووە مایەی کاولکاری و شەڕ و وێرانەیی بۆ ئەورووپا، چەندین جەنگی خوێناوی بە دوای خۆیدا هێنا پاشان ڕەوانەی خۆرهەڵاتیان کرد. هزری نەتەوەیی جگە لە کاولکاری هیچی تری پێشکەشی ئەورووپا نەکرد. وەک ئەوەی «ولیم کامدن»ی بەریتانی و «لیبنزی» ئەڵمانی و هۆکاری کوژرانی ملیۆنان کەس و وێرانبوونی تەواوی ئەورووپا دەگەڕێننەوە بۆ دەمارگیریی نەتەوەیی و هزری نەتەوەییی ڕادیکاڵ.

---

(١) هموم الداعیة ص ٧٣.

لەو قۆناغەدا خۆرئاواییەکان بە شێوەیەکی مەترسیدار ڕۆ چووبوون لە هزری نەتەوەیی بە شێوەیەک وەک ئایین لێیان دەڕوانی، بە جۆرێک ئەڵمانییەکان ئایینی پێشووی خۆیان گۆڕی بە بیانووی ئەوەی کە پەیامبەرەکە ئەڵمانی نییە. هەر لەم بارەیەوە پرۆفیسۆری ئەڵمانی «ئاترنی» دەڵێت: "لەبەر چی ئێمە منداڵەکانمان فێری مێژووی نەتەوەیەکی بێگانە بکەین، بۆچی و لەپێناوی چیدا چیرۆکی ئیبراهیم و ئیسحاقیان بۆ باس بکەین؟" هەر بەمەوە ناوەستێت تاوەکوو ئەوەی دەڵێت: "پێویستە کە خواکەیشمان ئەڵمانی بێت"[١] تاوەکوو ئەوەی ئەم جۆرە لە بیرکردنەوە و دونیابینییە نازییەتی بە دوای خۆیدا هێنا کە بەهۆیەوە قۆناغێکی مێژوویی ڕەشی بە سەر ئەورووپادا بهێنێت. دواتر ئەم هزرە کاولکارییە ڕەوانەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی کرا، وەک ئەوەی «حەبیب کورانی» یەکێک لە بیرمەندانی هزری نەتەوەیی عەرەبیی دەڵێت: "شوێنەواری یەکەمی شارستانیەتی خۆرئاوایی لە ژیانی هاوڵاتییانی عەرەبدا، زیندووکردنەوەی هزری نەتەوەییی عەرەبی بوو."[٢] دواتر چەندین کۆمەڵە و پارتی نەتەوەییی لە سەر ئاستی تەواوی وڵاتاتی ئیسلامی دامەزراند بە تایبەتی لە دوای ساڵی ١٨٨٠ زۆرێک لە ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵانە لەو گەنج و لاوانە بوون کە دەرچووی کۆلێژە پرۆتستانییەکانی سووریا و لوبنان بوون.

پەیدابوونی هزری نەتەوەیی لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی بە گشتی و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی ڕاستەوخۆ پەیوەندیی هەیە بە کاریگەرییەکانی خۆرئاواوە. ئەم بزووتنەوانە دەورێکی کاریگەرییان بینی لە لاوازکردن و ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی. لە قۆناغەکانی سەرەتای لاوازبوونی دەوڵەتی

---

(١) بڕوانە: احذروا الأساليب الحديثة، ص ١١٦.

(٢) بڕوانە: الإسلام والحضارة الغربية، محمد محمد حسين دار الفرقان بالسعودية_ الرياض. ص ١٢٨

عوسمانی چەندین بیرمەندی ڕادیکاڵی نەتەوەیی دەرکەوتن کە کاریان لە سەر سڕینەوەی هەستی ئایینی دەکرد و هەوڵیان دەدا هزری نەتەوەیی و یەکێتیی نەتەوەیی بکەنە جێگرەوەی یەکێتیی ئایینی. هەر یەک لە «فرنسیس مراش» و «شبلی شمیل»[1] لە گرنگترین ئەو کەسایەتییانەن کە هزری عالەمانی و نەتەوەییان لە نێو وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاو دەکردەوە و بەتوندی دژی دەسەڵاتی عوسمانی وەستانەوە. دەتوانین هزری هەر یەک لەو دوو کەسایەتییە بە سەرەتای لەدایکبوونی ڕێبازی عالەمانی بزانین لە وڵاتانی ئیسلامیدا. لە تەرابلوس و شام فرح ئەنتوان [2] -١٩٢٢یەکێک بوو لە بانگەوازکارانی هزری نەتەوەیی و عالەمانییەت.[3] پێشتریش لە سەردەمی سوڵتان «عەبدولعەزیز»دا

---

(١) «شبلی شمیل» ساڵی ١٨٥٣ لە شاری کفرشیمای لوبنانی لەدایک بووە، دوای خوێندنی زانستی پزیشکی لە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت ڕووی کردە پاریس، لەوێ سەرقاڵ بوو بە لێکۆڵینەوە لە سەر تیۆری پەرەسەندنی داروین (نظریە التطور) دواتر گەڕایەوە میسر و تووشی چەندان ڕووبەڕووبوونەوە بوو لەگەڵ خەڵکانی مەسیحی و موسڵمان لەوانەش ئەفغانی دواتر پەرتووکی (شکوی وامل) ـی ئاراستەی سوڵتان حەمیدی کرد تێیدا بە ڕوونی بۆچوونەکانی خۆی خستەڕوو هێرشی کردە سەر سیستەمی دیکتاتۆری پێی وا بوو سیستەمی دیکتاتۆری تاکەکانی کۆمەڵگە فێری ڕوپامایی دەکات و دەیان گۆڕێت بۆ بەندە گەلێکی کوێر دواتر چوە پاڵ کۆمەڵەی (ترکیاە الفتاە) . ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوای کردووە. بڕوانە: پێشەکیی پەرتووکی (فلسفة النشوء والارتقاء)

(٢) «فەرەح ئەنتوان ئەلیاس ئەنتوان» نووسەر و ڕۆژنامەنووس و یەکێک لە گەورەترین بانگەوازکارانی هزری نەتەوەیی و عالەمانیەت و سەرسەخترین دوژمنانی هزری خەلافەتی عوسمانی ساڵی ١٨٧٤ز لە تەرابلوسی شام لەدایک بووە، دواتر دەچێتە ئەسکەندەریە و گۆڤاری (الجامعە) دەردەکات و دەبێتە سەرنووسەری (صدی الاهرام) بە ئاشکرا بانگەوازی جیاکردنەوەی ئایینی دەکرد لە دەسەڵات، پێی وا بوو تێکەڵاوکردنی ئایین و سیاسەت دەبێتە هۆکاری لاوازبوونی ئایین، هەر لە سەر ئەم بۆچوونە ڕووبەڕووی گفتوگۆیەکی توند بووەوە لەگەڵ شێخ موحەمەد عەبدە لە بەرانبەر عەبدەدا شکستی هێنا. ساڵی ١٩٢٢ کۆچی دوایی کردووە لە نووسراوەکانی (ابن رشد و فلسفتە، الدین والعلم والمال) زیاتر لە بیست و پێنج ڕۆمان، سەدان بابەتی ڕۆژنامەوانی بڕوانە: الاعلام خیر الدین الزرکلی بەرگی پێنج لا ١٤١.

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: العرب والدولة العثمانیة، الدکتور علي حسون لا٢٢٣ و دواتر.

جوولەکەکان بە هاوکاریی خۆرئاواییەکان، پشتیوانیی ناوخۆیی کۆمەڵەی «ئیتیحاد و تەرەقی»یان دروست کرد، تەواوی توانایی و دارایی و مەعنەویی خۆیان خستە خزمەتی ئەم ڕێکخراوەوە. بانگەشەکارانی ئەم کۆمەڵەیە کاریان دەکرد لە سەر تۆخکردنەوەی هزری تۆرانیزم دروستکردنی نیشتمانێکی تۆکمە بۆ تورکەکان دوور لە هەر هەژموون و دەسەڵاتێکی عەرەبی و نەتەوەکانی تر و تێدا تاکی تورک بە تەنیا دوور لە ئایین بکرێتە سەنتەری کار و گرنگیپێدان. ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن جوولەکەکانەوە پشتیوانییەکی توندیان لێ دەکرا، تاوەکوو ئەوەی لە کۆتاییدا سەرکەوتوو بوون لە دوورخستنەوەی سوڵتان «عەبدولحەمیدی دووەم» لە دەسەڵات.

زایۆنییەکان بە تایبەتی دوای کۆنگرەی بازل[1] مەبەستیان بوو هەر چۆن بێت سوڵتان «عەبدولحەمیدی دووەم» لە سەر کار لاببەن، چونکە ئەوان سوڵتان «عەبدولحەمید»یان وەک بەربەستێکی گەورە دەبینی لە بەردەم خواستەکانی خۆیان کە خۆی لە دروستکردنی نیشتمانێک بۆ جوولەکەکان دەبینییەوە لە فەلەستین و پێشتریش بۆ ئەم مەبەستە چەندین جار پێشنیاری دارایی گەورەیان لەم بارەیەوە خستبووە بەردەم سوڵتان «عەبدولحەمید»، بەڵام ناوبراو تەواوی پێشنیارە داراییەکانی ڕەت کردەوە، لە کاتێکدا دەوڵەتی عوسمانی بە خراپترین و دژوارترین قۆناغی داراییدا تێ دەپەڕی، لە وەڵامی «تیۆدۆر هێترزل»دا وتە بەناوبانگەکەی کە دەڵێت: "ئەو زەوییەی بە خوێن ئازادمان کردووە، تەنیا بە خوێن و لاشەمان بەرگریی لێ دەکەین.» کۆمەڵەی «ئیتیحاد و تەرەقی» سەرکەوتوو بوو لە بەدەستهێنانی ئامانجی بزووتنەوەی زایۆنیستی. تورکەکانیش کاریان دەکرد لە سەر زەقکردنەوەی بانگەوازی تۆرانیزم بەو

---

(١) ساڵی ١٨٩٧ز کۆنگرەی زایۆنیی جیهانی لە شاری بازل لە سویسرا، بە سەرۆکایەتیی هرتزل و ئەندامێتیی زیاتر لە ٤٠٠ حاخام و گەورەپیاوی بازرگانیی جوولەکە بەسترا بڕیاری دروستکردنی دەوڵەتێکیان بۆ جوولەکە و کۆنترۆڵی جیهانیان گەڵاڵە کرد، ئەویش لەڕێی مەحفەلە ماسۆنییەکانیانەوە، کە بە گشت لایەکی وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاویان کردبوونەوە.

واتایەی هەموو ئەو گەلانەی هاوڕەگەزی تورکن و لە دەرەوەی دەسەڵاتی تورکیان، دەبێت یەک بگرنەوە و ڕابردووی پڕ لە سەروەری و شانازیی خۆیان بژێننەوە دوور لە هەر هەستێکی ئایینی. تۆرانییەکان بە چاوێکی سووک و بێڕێزییەوە لە تەواوی گەل و نەتەوەکانی تریان دەڕوانی.

زمانی عەرەبییش پارێزاو نەبوو لەم هێرشانە. هەر لەم چوارچێوەیەدا «جەلال نووری بەگ» یەکێک لە بانگەشەکارانی سەرسەختی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پێویستە وڵاتانی حیجاز و یەمەن و سووریا و عێراق بەشێک بن لە قەڵەمڕەوی تورکیای نوێ و دەبێت لە جێگەی زمانی عەرەبی زمانی تورکی تێیاندا بسەپێنرێت.[1]

تورانییەکان تا ئەوپەڕی سنوور دژایەتیی نەتەوەکانی دەرەوەی خۆیان دەکرد. لە لایەکی ترەوە ئیمپریالیستی خۆرئاوایی لە جەبهەی دەرەوە پشتیگریی هەر هەوڵ و جووڵانەوەیەکی میللەت و نەتەوەکانی سنووری دەوڵەتی عوسمانیان دەکرد. لە سەروبەندی شۆڕشی عەرەبی لە ساڵی ١٩١٦ بە سەرکردایەتیی «شەریفی کوڕی حوسەین» لە مەککە دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاستەوخۆ ئینگلیزەکان دەستیان دایە هاوکاریکردنی. ساڵی ١٩١٦ چەندین کەشتی پڕ هاوکاری و چەکی لەپێناو سەرخستنی شۆڕشەکە گەیاندە حیجاز تاوەکوو ئەوەی شەڕێکی خوێناوی لەنێوان تورک و عەرەبدا دروست بکەن.

«شەریف حوسەین» بەوریاییەوە ئاگاداری یارییەکە بوو، ویستی هەر چۆن بێت خۆی لە شەڕ لا بدات و کێشەکان بە شێوەیەکی هێمنانە چارەسەر بکات، بۆیە هەر زوو ئینگلیزەکان وەلایان نا و دۆخەکەیان دایە دەستی «فەیسەڵ»ی کوڕی.

دواتر «فەیسەڵ» و تەواوی نەیارانی تری دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتوو

---

(١) بڕوانە: دراسات في المذاهب الفكرية المعاصرة أحمد علي عبد العال، ص ١٥٠.

بوون لە ڕووخاندن و شکستپێهێنانی دەوڵەتی عوسمانی، پاشان تەواوی وڵاتانی ئیسلامیی ناوچەکە لاواز بکەن، بۆیە گرنگییەکی بەرچاویان دا بە کەمینە ئایینی و نەتەوەییەکانی ناوچەکە لە نموونەی دورزی و عەلەوییەکانی شام و لوبنان و کەمینە نەتەوەیی و ئایینییەکانی تری وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئاسیا و هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی شارستانیەتی فیرعەونی و وەلاتانی زمانی پاراوی عەرەبی و هەوڵدان بۆ جێگیرکردنی شێوەزاری میسری وەک بەدیل و زیندووکردنەوە و گرنگیپێدانی ئاشوورییەکانی عێراق و پشتگیریکردن لە بزووتنەوەی نەتەوەیی و ڕادیکاڵ و چەپەکانی وڵاتانی ئیسلامی و کارەکتەر و کارێزماکانی ئەم بزووتنەوانە، لە نموونەی پارتی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکی و بە سەرکردایەتیی «مێشیل عەفلەقی» مەسیحی لە عێراق و سووریا و «جەمال عەبدولناسر» لە میسر و «موعەممەر قەزافی» لە لیبیا و ئەوانی تریش کە هەمیشە لەلایەن خۆرئاواییەکانەوە ئاراستە کراون و بە کار هێنراون. لە بەرانبەر گرنگیدان بە بزاوتە چەپ و ناسیۆنالیستەکان بە توندی دژی هەر بزاوت و جووڵەیەکی ئیسلامی دەوەستانەوە کە ویستبای ڕەسەنایەتی و پیرۆزییەکانی ئایین و نەتەوە بپارێزێت، دواتریش بە توندی دژی هەر کەس و لایەنێک دەوەستانەوە کە ببوایەتە ڕێگر لە بەردەم ویست و پاوانخوازییەکانیان، بۆیە سەرکەوتوو بوون لەوەی تەواوی وڵاتانی ئیسلامی بخەنە ژێر دەستی خۆیانە.

پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) چەندین سەدە پێش ئێستا تاک و کۆمەڵی لە مەترسیی دەمارگیریی نەتەوەیی ئاگادار کردووەتەوە و فەرموویەتی: «جیاوازیی نییە لەنێوان عەرەب و عەجەمدا.» و بانگەشەی نەتەوەیی وەک بانگەشەیەکی جاهیلی ناو بردووە، وەک فەرموویەتی: «لینتهين أقوام يفتخرون بابائهم انما هم في جهنم الذين ماتوا انما هم فحم جهنم أم ليكونن اهون عند الله»[1]

---

(١)رواه الترمذي ٣٩٥٥

واتە: «واز دەهێنن ئەو کەسانەی کە خۆیان هەڵدەکێشن بە باووباپیرانیانەوە، چونکە ئەوان پشکۆی دۆزەخن یان زۆر لەوە کەمتر دەبن لەو مێروولەیەی کە پیسایی بە لووتی هەڵدەگرێتەوە.» جیهانبینیی پەیامبەر(ﷺ) بە شێوەیەکە کە فەرموویەتی: «سەلمان لە ئێمەیە لە ئەهلی بەیتە.» بۆ «سوهەیب»یش بە هەمان شێوە... بۆیە «سەلمانی فارسی کاتێک گوێی لە خەڵکانێک بوو کە بەشانازییەوە باسی هۆز و خێڵی خۆیان دەکرد، ئەویش فەرمووی:

أبي الإسلام لا أب لي سواه إذا افتخروا بقيسٍ أو تميمِ

واتە: باوک و ڕەچەڵەکم تەنیا ئیسلامە لە کاتێکدا خەڵکی شانازی بە قەیس و تەمیمەوە دەکەن.

ئیسلام لە چەندین جێگە لەڕێی قورئان و فەرموودەوە جەختی کردووەتەوە لە سەر گرنگیی یەکڕیزیی موسڵمانان، خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بوون لە مراندانی هەست و سۆزی ئایینی و بووژاندنەوەی هزری نەتەوەیی و ناوچەیی. خۆرئاواییەکان زوو تێگەیشتن لە مەترسیی ئەم بابەتە بە جۆرێک ئێستا لە تەواوی خۆرئاوادا شانازیکردن بە نەتەوە و هۆزی و خێڵەوە وەک جۆرێک لە شوورەیی لێی دەڕوانرێت. دوای تێپەڕبوونی چەند قۆناغێک و شکستی نەتەوەپەرستی چەمکی نیشتمانپەروەریيان هێنایە پێشەوە وەک جێگرەوەی هەستی نەتەوەپەرستی. ئەگەر بڕیار بێت نیشتمانپەروەری خۆشویستنی خاک و وڵات بێت، ئەوا بەدڵنیایی خۆشویستنی خاک و نیشتمان بەشێکە لە هەستێکی ئاساییی مرۆڤ و ئیسلام بە دروستی پێشوازیی لێ دەکات، بەڵام ئەگەر نیشتمانپەروەری گوزارشت بێت لە خۆشویستنی نیشتمان، ئەوا ئیسلام پێش هەر ئایین و ئایدیۆلۆژیا و ڕەوت و قوتابخانەیەکی هزری موسڵمانانی هان داوە لە سەر ئەم بابەتە.

ئەوەی جێگەی نیگەرانییە، دوای پەیماننامەی سایکس پیکۆ سنوورەکان

دیاری کران، وڵاتانی ئیسلامی بە تەواوی دابەش کرا. ئەم جارە دەمارگیریی نیشتمانی بووە جێگرەوەی دەمارگیریی نەتەوەیی بە جۆرێک خەڵکی وڵاتانی دراوسێ هاوئایین و هاوزمان وەک بێگانە سەیر دەکرێن، تەنیا لەبەر ئەوەی سنووری نیشتمانیان جیاوازە، بە جۆرێک لەم نێوەندە بەهێزەکان وەک کۆیلە و ژێردەستە لە لاواز و بێدەستەکان دەڕوانن وەک ئەوەی لە ئەدەبیات و دونیابینیی خۆرئاواییەکاندا هاتووە، کاتێک دەڵێن: «مانەوە بۆ بە هێزەکانە.» واتە ئەگەر لە کێبڕکێی ژیاندا بەهێز نەبیت، ئەوا دەبیتە پارووی بەهێزەکان. تەنانەت لە سەر ئاستی ژیان و گەشتدا، دەبینین هاوڵاتییانی خۆرئاوای بە شێوەیەکی ئاسایی بێ بوونی هیچ بەربەستێک بە خۆرهەڵات و خۆرئاوای زەویدا دەگەڕێن و هیچ کەس ناتوانێت ڕێگرییان لێ بکات، تەنانەت بەشێکیان بەبێ بوونی هیچ ڤیزەیەکی پێشوەختە سەردانی بەشێکی زۆر لە وڵاتانی دونیا دەکەن، بەڵام هاوڵاتییانی بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئیسلامی، وەکوو کۆیلە و گول و هاوڵاتیی نمرە سێی جیهان سەیر دەکرێن و بە هیچ شێوەیەک ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە وڵاتانی خۆرئاوا بە شێوەیەک هەر وڵاتێک ئابوورییەکەی لاواز بێت هاوڵاتییانی بە چاوێکی کەمەوە وەک کۆیلە تەماشا دەکرێن.

دەکرێت خوێنەر ئەو پرسیارە ڕاستەقینەیەی لا دروست بێت، بۆچی موسڵمانان هزری نەتەوەپەرستی ڕەت دەکەنەوە؟ وەڵامەکە ئەوەیە موسڵمانان هیچ گرفتێکیان نییە لەگەڵ خۆشەویستیی نیشتمان، چەندین فەرموودە و هەڵوێستی پەیامبەر(ﷺ) خۆشەویستی بۆ نیشتمان پشتڕاست دەکەنەوە. پەیامبەر (ﷺ) و هاوەڵان بە شێوەیەکی سەیری هۆگری مەککە بوون، بە شێوەیەک لەگەڵ کۆچیان بۆ مەدینە لە سەرەتاوە کاتەکانیان بە دژواری لەبەر تێدەپەڕی، هۆکاری ڕەتکردنەوەی ئەوەی پێی دەگوترێت نەتەوەپەرستی دوور و نزیک پەیوەندیی بە خۆشەویستیی نیشتمانەوە نییە، بەڵکوو ڕەتکردنەوەی ئەم بابەتە بەهۆی ئەو ئامانج و پاڵنەرانەوەیە کە خۆرئاواییەکان پێوەی گرێیان

داوە کە مەبەستی سەرەکییان کردنی ئەم بابەتەیە بە جێگرەوەی هەست و سۆزی نەتەوایەتی. بە جۆرێک تاکێک بەرهەم دەهێنێت کە تەنیا هاوسۆز بێت لەگەڵ هاوڵاتیانی سنووری وڵاتەکەی خۆی و ئەو مرۆڤانەی تر کە پەیوەندیی ئایینی پێکەوە دەیانبەستێتەوە بە هیچ شێوەیەک جێگەی بایەخ و گرنگیپێدان نییە. دۆخێک خوڵقاوە کە موسڵمانان هەست و سۆزیان بەرانبەر یەکتر نەماوە، گەر بە دەیان هەزار موسڵمان بە دەستی بوزییەکان لە ناو ببرێن، نابێتە جێگەی خەم و حەسرەتی موسڵمانان بە بیانووی ئەوەی کە ئەم بابەتە کێشەی ناوخۆیی ئەو وڵاتەیە و پەیوەندیی بە موسڵمانانەوە نییە.

ئەو ژمارە زۆرەی موسڵمان لە سەرانسەری دونیادا لەو دۆخە خراپەدا، وڵاتانی موسڵمان هیچ هەڵوێستێکیان نییە، تەنیا بەیاننامەیەکی نارەزایی دەردەکەن و هیچی تر. ئەوەی ڕوو دەدات لە فەڵەستین و تورکستانی شەرقی، هیچ پەیوەندیی بەوانەوە نییە بەو پێیەی کە لە وڵاتی ئەواندا ڕوو نادات. بەم جۆرە خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بوون لە چەسپاندنی هزری نەتەوەپەرستی و لاوازکردنی هەستی ئایینی و نەتەوەیی. بێگومان ئەگەر وڵاتانی موسڵمان بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی سنووری جوگرافییان کەوتووەتە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە بەم شێوەیەی ئێستا پارچەپارچە نەکرانایە، ئەوا بێگومان دۆخی کورد لەم نێوەندەدا بەم ئاقارە نەدەگەییشت. دیسان ئەو پرسیارە دەخەینەوە پێشچاو کە کێ هۆکاری ئەم هەموو نەهامەتییەی کوردە؟ نەهامەتییەکانی کورد لە کەی و لە کوێوە دەست پێ دەکات؟ لە ڕاستیدا لە قۆناغی دابەشکردنی کوردستان دوای پەیماننامەی سایکس بیکۆ بە سەر وڵاتانانی پاشماوەی خەلافەتی عوسمانیدا، دۆخی کورد کەوتە قۆناغێکی مەترسیدارەوە، کوردەکان دووچاری مەترسییەکی گەورە هاتن، بە شێوەیەک تا ئێستایشی لەگەڵ بێت پێوەی دەناڵێنن. بەرپرسیارێتیی ئەم دۆخەی ئێستای کورد بە شێوەیەکی سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی وڵاتانی زلهێزەوە، بەدڵنیایی گەر

سیاسەتی بەرژەوەندیخوازی ئەوان نەبووایە، ئەوا بێگومان دۆخی کورد وەکوو نەتەوە بەم شێوە ئاڵۆزەی ئێستا نەدەبوو، تا ئێستایشی لەگەڵ بێت، نەک هەر پەندمان لە مێژوو وەرنەگرتوە، بەڵکوو خۆرئاواییەکان بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بە کارمان دەهێنن.

هەڵبەت بۆچوونمان لەبارەی نیشتمانپەروەرییەوە بۆچوونێکی دروست و مامناوەندە، بەو واتایەی حاڵەتێکی ئاساییە مرۆڤ شانازی بە نیشتمان و نەتەوەی خۆیەوە بکات و بەرگری لە مافی ڕەوای نەتەوە و نیشتمانەکەی بکات، کارەسات لەوەدایە تەنیا هاوڵاتییانی وڵاتەکەت بە خاوەن ماف بزانیت و تەواوی میللەت و نەتەوەکانی تری دونیا بە چاوێکی سووک سەیر بکەیت، دەمارگیرییەکی کوێرانەت بەرانبەر نەتەوە و نیشتمانەکەت هەبێت و بە هۆی ئەم دەمارگیرییەوە حەقت لێ ببێت بە ناهەق و ناهەقیش بە هەق، ئیتر گرفتێک نییە خەڵکانی وڵاتانی تر چییان لێ دێت و بە چ ئاراستەیەکدا هەنگاو دەنێن، وەک ئەوەی یەکێک لە شاعیرانی دەمارگیر دەڵێت:

سلام على كفر يوحد بيننا وأهلاً وسهلاً بعده بجهنم

سڵاو لە کوفرێک کە یەکمان دەخات دوای ئەوە با بە خێر بێت دۆزەخ.

یان

هبوني عيدا يجمع العرب أمة وسيروا بماني على دين برهم

یان

بلادک قدِّمها على كـلِّ ملّـة ومن أجلها أفطِر ومن أجلها صُم!

بە ڕوانینێکی خێرا بە نێو وڵاتانی عەرەبیدا تێ دەگەین لەوەی عەرەبەکان بە هۆی ڕۆچوونیان لە هزری نەتەوەپەرستی و ناسیۆنالیستی دووچاری خراپترین دۆخ هاتوون.

سەپاندنی عالەمانییەت بە زۆر بە سەر جیهانی ئیسلامیدا چالاکی و پەرۆشیی خۆرئاواییەکان لە هەمبەر عالەمانییەت و هەوڵدان بۆ سەپاندنی بە سەر جیهانی ئیسلامیدا جێگەی پرسیار و هەڵوێستەکردنە. ئەورووپییەکان کە خۆیان مەسیحیین چۆن و بە چ هۆیەک بەم شێوە حەماسەوە هەوڵی سەرخستنی عالەمانییەت دەدەن؟ بۆچی بەم شێوەیە هەوڵی چەسپاندنی دەدەن؟ لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا و بۆ ئەم مەبەستە تەواوی ڕێوشوێنە جیاوازەکان دەگرنە بەر؟ ئایا عالەمانییەت بە واتای حەقیقی و ڕاستەقینەکەی ئایینێکە دەکرێت لە تەواوی لایەنەکان ببێتە شوێنگرەوەی ئیسلام؟ یاخود ئیسلام تەنیا ئایینێکی ڕۆحییە و بابەتەکانی پەیوەست بە سیاسەت و حوکمڕانی لە خۆ نەگرتوە؟ ئەمەنانە و چەندین پرسیاری تری پەیوەست بەم پرسە، هەوڵ دەدەین لەم بەشەدا بیانخەینە ڕوو.

# عالەمانییەت

پێش ئەوەی دەست بکەین بە پێناسەی عالەمانییەت وەک ئایینێکی سەربەخۆ و چەمکێکی زیندووی ئێستای نێو جیهانی ئیسلامی، سەرەتا پێویستە تیشک بخەینە سەر بابەتی چەمک، بەو پێیەی زۆرێک لەو ئاڵۆزیی گومڕاییانەی عالەمانییەکان دروستی دەکەن، لە خودی پێناسەی چەمکەوە سەرچاوە دەگرێت. وەک ئەوەی «موحەممەد عەلی تەهانەوی» دەڵێت: "زۆرترین هۆکار بۆ بەدەستهێنانی شارەزایی و بەرچاوڕوونی بریتییە لە جیاکردنەوەی تەواوی چەمک و زاراوەکان لە یەکتر، بەو پێیەی هەموو بابەتێک چەمک و زاراوەی خۆی هەیە، ئەگەر لێکۆڵەر ئاگایی دروستی نەبێت، ئەوا بەدڵنیایی دووچاری سەرلێشێوان و جۆرێک لە بێئاگایی دێت و ناتوانێت وەک پێویست لە بابەتەکە تێ بگات."[١] زانایان و لێکۆڵەرانی ئیسلامی بە گرنگییەوە لە زانستی موستەڵەحاتیان ڕوانیووە و چەندین پەرتووکیان لەم بارەیەوە نووسیووە، لە نموونەی (مفتاح العلوم)ی «خەواریزمی» (الحدود الأنيقة والتعريفات الدقيقة) ی شێخ «زەکەریای ئەنساری» (الحدود الفقهية) «ئیبن عەرەفە (الشامل في أصول الدين) جوەینی و دەیانی تر پەرتووکی گرنگیان پەیوەست بەم بوارە نووسیوە، قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا تیشکی خستووەتە سەر گرنگیی چەمکەکان و چۆنیەتیی بەکارهێنانیان وەک دەفەرمووێت: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ﴾ [يوسف: ٤٠]

واتە: «بزانن ئەوانەی دەیپەرستن لە غەیری خودا، تەنیا چەند ناوێکی

---

(١) موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم، محمد على التهانوى مكتبة لبنان ناشرون، بيروت-لبنان. ج: ١ -ص ١

بێناوەڕۆکن، خۆتان و باووپیرانتان ناوتان ناوە و کردووتانە بە خودا، ئەگینا خوا هیچ بەڵگەیەکی ڕاستی بۆ پەرستنی ئەوان دانەبەزاندوە.» جگە لەمە پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) لە چەندین فەرموودەی ڕاستدا تیشکی خستوەتە سەر گرنگیی ئاگایی موسڵمانان لەبارەی چەمک و زاراوەکان و چۆنیەتیی بەکارهێنانیان و مامەڵەکردن لەگەڵیان و دیسان موسڵمانانی ئاگادار کردووەتەوە لەوەی کە لە کۆتاییی زەماندا زاراوەی شتەکانی دەوروبەرمان وەک خۆیان نامێننەوە. وەک دەفەرمووێت: «لیشربن أناس من أمتي الخمر يسمونها بغير أسمها»[1] واتە: «خەڵکانێک لە ئوممەتی من پەیدا دەبن مەی دەخۆنەوە و ناوەکەی دەگۆڕن بۆ ناوێکی تر.» بۆیە پێویستە بە شێوەیەکی دروست ئاگاییمان هەبێت بەرانبەر ئەو چەمک و زاراوانەی کە لە سەردەمی نوێدا بە کار دەهێنرێن، وەک ئاماژەیەک بۆ جیهانی زەمەنی واتە ژیانی دونیایی وەک ئەوەی یەکێک لە لێکۆڵەرانی زانکۆی «برنتسون» ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: "کڵێسا پیرۆزەکان وشەی (saeculam) وەک بابەتێکی قێزەونتر سەیر دەکەن، بەوەی کە چەمکێکە لێوانلێوە لە شێتی و نەخۆشی و ناڕەحەتی و تۆڵەسەندنەوە."[2]

وەک دەردەکەوێت ئەم زاراوەیە لە سەرەتاوە بۆ شتگەلێکی خراپ بەکارهاتووە، پیاوانی کڵێسا ئەم وشەیەیان بۆ مەبەستێک بەکارهێناوە کە پیاوی ئایینی بێت، بەڵام گوێیان بە یاسا و ڕێساکانی ڕەهبانیەت نەدا. کەواتە ئەم زاراوەیە سەرەتا بۆ خراپە و جۆرێک لە قێزەونی بەکارهاتووە، دواتر دراوەتە پاڵ ئەو پیاوە ئایینییانەی کە بنەماکانی ئایینیی خۆیان بە هەند وەرناگرن. پاشان قۆناغ بە قۆناغ ئەم وشەیە گواستراوەتەوە و دراوەتەوە پاڵ هەر شتێک کە بیەوێت

---

(١) اخرجه ابوداود ٣٦٨٨ وابن ماجة ٤٠٢٠ واللفظ له.

(٢) العلمانية طاعون العصر كشف المصطلح وفضح الدلالة د. سامي العامري ب: تكوين للدراسات والأبحاث الطبعة الثانية السعودية ٢٠١٨، ص ٥٣

لە ژێر هەژموونی جیهانی ئایینی بێتە دەرەوە و ببێتە کارەکتەرێکی باوەڕبوو بە ناپیرۆز و ناموقەدەس، دواتریش وشەکە گۆڕانکارییەکی تری بە خۆیەوە بینی. ئەویش بریتییە لە جیاکردنەوەی هەموو هێزێکی کڵێسایی و ئایینی لە تەواوی کایەکانی پەیوەست بە ژیانی خەڵکی و نەهێشتنی دەسەڵاتی ئایینی بە سەر ژیانی خەڵکی و جیاکردنەوە و وەلانانی تەواوی ئەو بابەت و تێگەیشتنە ئایینییانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی خەڵکییەوە هەیە."[١]

کەواتە وشەی (Secularism) واتە جیهان و لە سەرەتاوە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهات کە دوور بوون لە ئایین و دواتریش بۆ ئەو کەسانە بەکارهێنرا کە ئایینیان نییە. کەواتە دەبوو بگوترایە عالەمانی یان عالمانی، بەڵام لە بریی ئەمانە وشەی عالەمانی بەکارهاتووە، تاوەکوو ئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان لە نێو خەڵکیدا قەبووڵکراو بێت. ئەو کەسانەی کە ئایینیان نییە و بڕوایان بە هیچ پیرۆزییەک نییە لە بریی ئەوەی پێیان بگوترێت دوور لە ئایینی و بێئایین پێیان بگوترێت عیلمانی و پاڵدان بێت بۆ لای زانست و زانیاری، بەڵام خەڵکانی لێکۆڵەر بە دروستی لەوە تێ گەیشتوون کە عالەمانییەت واتە بێئایینی و دووری لە ئایین.

بە شێوەیەکی گشتی عالەمانییەت بەکارهاتووە وەک هەنگاوێک بۆ ڕەواج پەیداکردن و شاردنەوەی ئەو شوورەییەی کە بە نێو چاوی خەڵکانی دژە ئایینەوەیە بە تایبەتی لە دوای هێرشی داگیرکاری ئینگلیزی لە ساڵی ١٩٣٧.[٢]

کەواتە (عیلمانییەت) بە هەڵە وەرگێڕاوە وشەی (Secularism)ی

---

(١) تفكيك مصطلح العلمانية: مقال لعبد الرحمن السليمان . الرابط:
http: //www. atida. org/forums/showthread. php?t=10552

(٢) بڕوانە: المعجم العربي بين الماضي والحاضر، عدنان الخطيب، مكتبة لبنان ناشرون، الطبعة الثانية ١٩٩٤، ص ١٦٦.

ئینگلیزی و (Secularite)ی فەرەنسییە و دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکی بە سەر زانستەوە نییە. بەو پێیەی زانست (عیلم) لە زمانی ئینگلیزیدا بەرانبەر وشەی (Science)ـە و مەزهەبی زانستی وشەی (Scientism) بەکاردێت. لە فەرەنسیدا بەرانبەر زانست وشەی (Scientific) یاخود (Scientifique) بەکاردەهێنرێت. لە قامووسە بەناوبانگەکەی (Oxford) وشەی عالەمانییەت (Secularism) بەم شێوەیە شی دەکاتەوە و دەڵێت: «عالەمانییەت تێگەیشتنێکە بە پێویستی دەزانێت کە خوو و ڕەوشت و ئەخلاق و زانست و فێربوون لە سەر بنەمایەکی دوور لە ئایینی بێت.» زۆرێک لە عالەمانییەکان ئەسڵی ئەو وشەیە دەگێڕنەوە بۆ زانست (علم)، هەر بۆیە دەڵێن عیلمانی کە پێیان وایە ئەم بزوتنەوەیە زانستخوازن و لە هەوڵی برەودانن بە زانست و زانیاری و پێشکەوتنە پیشەسازییەکان!! تەواوی فەرهەنگە بیانییەکان پێچەوانەی ئەم بانگەشەیە دەسەلمێنن.

بە شێوەیەکی گشتی بەکارهێنانی وشەی عالەمانییەت هەڵەیەکی بەربڵاوە بە بەردەوامی زۆرێک لە لێکۆڵەرەوان دووبارەی دەکەنەوە، بەو پێیەی بە تەواوی دژی ئەو تێگەیشتنەن کە بۆی دانراوە: زاراوەی گونجاوتر بەکارهێنانی «بێئایینەکان» یاخود «دونیاییەکانە» بەڵام بەو پێیەی ئێستا لە سەرانسەری دونیا ئەم بابەتە بەم شێوەیە پەرەی سەندوە و لە تەواوی ناوەندە زانستی و هەواڵی و کۆمەڵایەتییەکاندا بەم شێوەیە بە کار دەهێنرێت، بەناچاری ئێمەیش هەر بەم شێوەیە بە کاری دەهێنین. جگە لەوەی ئەم زاراوەیە دژی خودی ئەو مەبەستەیە کە لەپێناویدا داتاشراوە، هاوکات پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەیە کە بۆی دانراوە. واتە دژی بنەما زانستییەکانی زانستی زمانی سەردەمە وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، زانست لە زمانی ئینگلیزدا بە وشەی سیکۆلار ناگوترێت و بە فەرەنسییش بە هەمان شێوە. هاوکات لە زمانی عەرەبیشدا گەر ناوێک پاڵدراو بوو واتە دەداتە پاڵ شتێک، وەک وشەی (علم)، بە هیچ جۆرێک ناکرێت ئەلف و نوونی بۆ

زیاد بکەیت، بەو پێیەی لە دەرەوەی پێوەر و بنەماکانە تەنیا بە بیستن لە عەرەبەوە بیستراوە. تەنیا چەند وشەیەکی کەمی وەک نوورانی و ڕۆحانی هاتووە، کەواتە ناتوانرێت بگوترێت عالەمانی و بەکارهێنانی بەم شێوەیە هەڵەیەکی تەواو زەقە. بەڵام وەک گوتمان ئەم زاراوەیە بۆ مەبەستی بەلاڕێدابردن بەکارهاتووە، ئەمە تەنیا وەک وەستانێک لە سەر زاراوەی عالەمانی، قۆناغی دواتر پێویستە بزانین عالەمانییەت چییە و عالەمانییەکان کێن.

عالەمانییەت بە درێژایی مێژوو چەندین پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، هەم لەلایەن خۆرهەڵاتییەکان و هەم لەلایەن خودی خۆرئاواییەکان خۆیانەوە. لێرەشدا هەوڵ دەدەین بەشێک لەم پێناسانە بخەینە ڕوو. لە دائیرەی مەعاریفی بەریتانیدا هاتووە دەڵێت: عالەمانییەت (Secularism) بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتییە و ئامانج و مەبەستی ئەوەیە خەڵکی ڕوو وەربگێڕن و دوور بخەنەوە لە گرنگیدان بە ڕۆژی دوایی بۆ گرنگیدان تەنیا بە کاروباری دونیایی و بەردەوام ئەم بزاوتە دژی ئایین کاری کردووە.[1]

هەر لە دائیرەی مەعاریفی بەریتانی لە پێناسەیەکی تردا هاتووە «عالەمانییەت بریتییە لە بێدینی و دنیاپەرستی، هەروەها بریتییە لەو بانگەوازەی کەهەوڵ دەدات بۆ دامەزراندن و پێکهێنانی ژیانی مرۆڤەکان لە سەر بناغەی بێدینی.» دیسان دائیرەی مەعاریفی بەریتانی لە پێناسەی وشەی عالەمانییەتدا (سیکۆلاریزم- عالەمانییەت) دەڵێت: "چراندنی خەڵکییە، لە بایەخدانیان بە ڕۆژی دوایی و مەشغوڵکردنیان تەنیا بە ژیانی دونیا." لە قامووسی ئینگلیزیدا هاتووە کە عالەمانییەت بریتییە لەو بیردۆزەی کە دەڵێت: نابێت ڕەوشت و فێرکردن لە سەر بناغەی ئایینی بەرپا بکرێن و نابێت پەیوەندییان بە دینەوە هەبێت، بەڵکوو دەبێت لادینی بن.

---

(١) دائرة المعارف البريطانية لا ١٩ وەرگیراوە د. سفر الحوالي العلمانية.. نشأتها وتطورها و الآثارها في الحيـــاة الإسلامية المعاصرة، ص٢٢ دواتر.

«جۆرج یاکوب» دەڵێت: "عالەمانییەت لە هەوڵی بەرەوپێشبردنی لایەنی جەستەیی و ڕەفتاری و فیکری سروشتی مرۆڤە تا بەرزترین پلەی گونجاو." لە فەرهەنگی (العالم الثالث الجدید) هاتووە: کە وشەی سیکولاریزم عالەمانییەت بە دوو مانا دێت: واتا گیانی دونیاگەرایی، یان ڕێڕەوی دونیاگەراکان. بە کورتی و بە پوختی بە مانای ئەوانەی کە تەنیا باوەڕیان بە دونیا هەیە- بڕوابوون بەوەی کڵێسا و ئایین هیچ پەیوەندییەکیان بە کاروباری ئیداریی وڵاتەوە نییە، بە تایبەتتر لە بوارەکانی پەروەردەی گشتیدا.

فەرهەنگی (ئۆکسفۆرد) ڕوونتر تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەت و بەم شێوەیە پێناسەی سیکولاریزمی کردووە: سیکولاریزم واتا دونیاگەرایی یان مادەگەراییەک کە دین و ڕۆحی نەبێت. یان لە پێناسەیەکی تریدا هاتووە: سیکولاریستی بریتییە: لە حوکومەتی دژ بە دین و دژ بە کڵێسا و دژ بە بەندایەتیکردن بۆ خودای پەروەردگار. هەر لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردا هاتووە: سیکولاریزم هەڵگری ئەو پەیام و بەیداخەیە کە نابێت دین بناغەی ڕەوشت و پەروەردە دەبێت.

لە فەرهەنگی (معجم الدولي الثالث الجدید) هاتووە سیکۆلاریزم، ڕێڕەوێکە لە ژیانێک کە بەڕێوەچوون و کاروبارەکانی لە سەر ئەو بنچینەیە بنیات نراون کە نابێت ئایین و خەڵکی دیندار دەست وەربدەنە حوکومەت و کاروباری دەوڵەتەوە. هەروەها دەڵێت: سیکولاریزم، بریتییە لە سیستم و ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی، بۆیە لەبارەی ڕەوشتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییەوە دەڵێت: پێویستە ئاکار و ڕەوشت و بەها ڕەوشتییەکان ڕەچاو نەکرێن، بەڵکوو تەنیا خواست و بەرژەوەندییەکانی ژیانی نوێ و هاوچەرخیان لە بەرچاو بگیرێت.

هەر لە چوارچێوەی پێناسەی عالەمانییەتدا «گارت وارد شلدون» دەڵێت: «عالەمانییەت فەلسەفە و بیرۆکەیە کە جەخت لە سەر مرۆڤ دەکاتەوە

لە بەرانبەر ئاییندا.»[1] تەواوی ئەم پێناسانە ئەوەمان پێ دەڵێن کە پوختەی عالەمانییەت گوزارشتە لە بانگەشەی جیاکردنەوەی ئایین و دەسەڵاتی ئایینی و مەرجەعیەتی ئایینی لە ژیان و سیاسەت و یاسای دونیای خەڵکیدا.

بەکورتی عالەمانییەت لە دیدگا ئیلحادەوە جێگرەوەی ئایینە. کەواتە دەتوانین بڵێین عالەمانییەت هیچ پەیوەندیی بە عیلمەوە نییە و هەڵەیشە بگوترێت عیلمانی، زۆر هەوڵم دا بزانم وشە عالەمانی لە کوێوە هاتوە کە جارویار گوێبیستی دەبین لێرە و لەوێ هیچم بەرچاو نەکەوت، بەڵکوو تەواوترە بگوترێت: بێدینی (اللاديني) یان دونیاویستی (الدنيوية). هەر بەڕاستیش کاتێک لە بنەمای فیکر و کارکردنیان ڕوون دەبینەوە ئەو کاتە دەردەکەوێت باشترین وشەی وەرگێڕراو لە بەرانبەر عالەمانییەت، بێدینی و دونیاویستییە، بەو پێیەی عالەمانییەت هەوڵ دەدات ئایین پەراوێز بخرێت لە کۆمەڵگا و تەنانەت ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەی ئەوان باسی دەکەن لەنێوان خالق و مەخلووقدا نابێت لە دڵی تاکەکانەوە تێ بپەڕێت و ڕەنگدانەوەی هەبێت لە سەر وتە و کرداردا. ئایین نابێت کاریگەریی لە سەر تاکەکان و کۆمەڵگا هەبێت لە بیروباوەڕیان لە فیکر و بۆچوونیان، تەنانەت لە زانست و زانیاری و ئەخلاق و خوو و ڕەوشتیان.

گوشراوی پێناسەکان:

أ- بە کوردی عالەمانییەت لە ڕووی زمانەوانییەوە واتە: دونیاگەرایی، دونیاگەرێتی، دونیاپەرستی، بێدینی، بێئایینی، دونیاویستی، بێباوەڕی، خوانەناسی، ئیلحادی.

ب- بە عەرەبی واتە: اللادينية، الدنيوية.

ج- بە لاتینی واتە: سیکولاریزم، سیکوریسم، سیکولاریست، سکولاریزم، لائیک.

---

(١) العلمانية طاعون العصر، ص ٩٥.

د- لە ڕووی زاراوەییەوە واتە:

بڕوابوون بە کاروباری ژیان و دونیایەکی ماتریالی (ماددی) ڕووت و ڕەها، بە پێچەوانەی بەرنامە و یاسا و بیروباوەڕە ئاسمانییەکان.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عالەمانییەت لە خۆرئاوا

مێژووی سەرهەڵدانی عالەمانییەت دەگەڕێتەوە بۆ پاش شۆڕشی فەرەنسیی ساڵی ١٧٨٩ی زایینی. هەروەها لە پاش شۆڕشی بەلشەڤیکییەکانەوە کە ڕێگەی بۆ سەرهەڵدانی ئەورووپای نوێ خۆش کرد. وەک تەواوی سەرچاوە مێژوویییەکان ئاماژەی پێ دەکەن، ئەورووپا بە درێژاییی مێژوو خاوەنی ئایین بوون و لە سەر ئایینێکی تایبەتی ڕۆیشتوون، تا ئەو کاتەی مەسیحییەت تێدا بڵاو بووەوە، ئایینی نوێ بە شێوەیەکی خێرا لە تەواوی ئەورووپا پەرەی سەند و هەر لە سەرەتاوە پێشوازییەکی گەرمیان لە ئایینی نوێ کرد.

بەو پێیەی بانگەشەی جیهانێکی دوور لە توندوتیژی پڕ لە سۆز خۆشەویستی دەکرد دوای بڵاوبوونەوە ئایینی نوێ دووچاری دژایەتییەکی بەرچاو هاتەوە، بە تایبەتی لەلایەن جوولەکە و بتپەرستەکانەوە. تەواوی ئەم هەنگاوی دژایەتیکردنانە بوونە هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئایینی نوێ لەناو خەڵکیدا. دوای چەندن قۆناغ ساڵی ٣٢٥ زایینی ئیمپراتۆر قوستەنتین مەسیحییەتی کردە ئایینی فەرمیی دەوڵەتی ڕۆمانی. دوای قۆناغی پەیامبەر عیسا، مەسیحییەت بە هۆی هەوڵی جوولەکە و بتپەرستەکانەوە دووچاری جۆرێک لە شێواندنی سەرسوڕمانانە هات، هەتاوەکوو ئەوەی بانگەشەی ئەوەیان کرد کە عیسا کوڕی خودایە. ئەڵقەی ئەم گۆڕانکارییانە لە سەر دەستی «پۆلسی پەیامبەر» دەرکەوت. سەرەتا «پۆڵس» توندڕەوێکی یەهوودی بوو، کاری کرد لەسەر ڕکەبەرایەتیکردنی مەسیحییەت کە ئەو کاتە ئایینەکە

تازە پێگەییشتبوو. شاوڵ وای دەدانە قەڵەم کە کۆمەڵێکی یەهوودیی لە ئایین لادەرن کە هەڕەشەن بۆ سەر ئایینی فەرمیی جوولەکە، «پۆڵس» پاش مۆڵەت وەرگرتن لە پیاوانی جوولەکە، هەستا بە دواکەوتنی مەسیحییەکان تا دیمەشق تاوهکوو بە کەلەپچەکراوی بیانگەڕێنێتەوە.

لە سەر ڕێگەی دیمەشق و بەپێی بەسەرهاتەکەی پەیمانی نوێ، «پۆڵس» خەوێکی بە سەردا هات کە هۆکاری گۆڕانکاری ژیانی بوو ئەویش ئەوە بوو کە خودا کوڕەکەی خۆی پیشان دا. بە پێی ئەوەی خۆی باسی دەکات لە نامەکەیدا بۆ غەڵاتینەکان بە شێوەیەکی دیاریکراو وتی: "یەسووعی خودای دیوە لە پەڕتووکی کرداری نێرراوەکاندا باس لە بەسەرهاتەکە کراوە، دواتر لە کاتی ڕۆیشتنیدا کاتێک کە لە دیمەشق نزیک بووەوە، تیشکێک لە ئاسمانەوە دەوروخولی دا لە دوای ئەمەوە گفتوگۆیەک کەوتە نێوان «شاوڵ» و «یەسووع» ەوە کە تێیدا «یەسووع» دەتوانێت «شاوڵ» بێنێتە سەر ئەو ڕایەی کە ئەو مەسیحە پەیمانپێدراوەکەیە.

پاش ئەو بینینە تووشی کوێری بوو و برا بۆ دیمەشق لە سەردەستی «حەنانیا» دووبارە بینینی بۆ گەڕێنراوەتەوە، بەپێی بەسەرهاتەکەی پەرتووکی پیرۆز ئیتر لە کاتی بوونی بە مەسیحی «شاوڵ» بە «پۆڵس» ناسرا."

«پۆڵس» بەشێک لە ژیانی لە نیمچەدوورگەی عەرەبی بردووەتە سەر. جوولەکەکان گەلەکۆمەکێیان لێ کرد تا بیکوژن و چوونە لای دەسەڵاتداری ئەو کاتە و شکاتیان لێ کرد، بەڵام هاوڕێکانی ڕێگەیان بۆ خۆش کرد تا ڕا بکات لە شارەکە. ئیتر ئەوەی ئێستا دەبینرێت بە ناوی مەسیحییەتەوە هیچ نییە جگە لە شەریعەتی «پۆڵس.» دواتر شوێنکەوتوانی ناوبراو هەستان بە نووسینەوەی ئینجیلەکانی پاڵدراو بۆ لای عیسای مەسیح بە گەواهیی تەواوی مەسیحییەکان. تەواوی ئینجیلەکان سەد ساڵ دوای «عیسا» نووسراوەتەوە لە

کۆنگرە و مەجەمعە کلێساییەکان و زیاد و کەم لەم ئینجیلانە کراوە، تاوەکوو ئەوەی خودی مەسیحییەکان دان دەنێن بەوەی کە هیچ شتێک لە کاروکرداری «عیسا» نەماوەتەوە. وەک ئەوەی دائیرەتول مەعاریفی بەریتانی بە ئاشکرا ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: "ئەوەی کە واقیع بێت تەنیا بە سەیرکردنی ئینجیلەکان دەزانێت کە هیچیان ڕاست نین و لە یەکتر ناچن." بەو پێیەی مەحاڵە لە سەر زەوی ئینجیلێک دەست بکەوێت کە تەواوی مەسیحییەکان کۆک بن لە سەری، یاخود لە یەکتر بچن و گۆڕانکاری و تەحریف تێدا نەکرا بێت، یاخود لانی کەم هەر مەرجێک لەو مەرجانەی لە قورئاندا هەیە لە ئینجیلیشدا هەبن.

ئەوەی دەمانەوێت لێرەدا باسی لێوە بکەین تێچوون و گۆڕانکاریی ئایینی مەسیحییەت نییە، بەڵکوو ئەوەی جێی قسەی ئێمەیە کە ئەو ئایینەی خۆرئاواییەکان بە ناوی مەسیحییەتەوە وەریان گرتووە، دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئایینی ڕەسەنی مەسیحییەتەوە نییە. دروستتر وایە پێیان بڵێین ئایینی پۆڵسی، بەو پێیەی ئەو ئایینە بە لێڵی و شێواوی کەوتە دەستیان و ساڵی ٣٢٥ زایینی کرایە ئایینی فەرمیی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. بۆیە زۆر ئاساییە دوای ماوەیەک ئەوان پشت لە بەناو ئایینێک بکەن کە دوور و نزیک پەیوەندیی بە خودا و ئاسمانەوە نییە و بە هۆی نارەحەتی و پاڵنەرە سەختەکانی ژیانیان لە چوارچێوەی ئەم ئایینە و دامەزراوەی کلێسا و پیاوانی هەلپەرستی کلێسا بە شوێن جێگرەوەیەکدا بگەڕێن. سەرەکیترین هۆکاری سەرهەڵدانی عالەمانییەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زوڵم و زۆر و ستەمەی کە دامەزراوەی کلێسا و پیاوانی ئایینی دەیاننواند بەرانبەر خەڵکی بە تایبەتی دژی زانایان و لێکۆڵەران و داهێنەران. پیاوانی کلێسا ئەو پێگە ئایینییە بە هێزەی خۆیان قۆستبووەوە لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، بۆیە بە توندی دژی هەر هەوڵێکی پێشکەوتنی کۆمەڵگە دەوەستانەوە کە ببوایەتە هۆی پێشکەوتن

و کرانەوەی کۆمەڵگە. خەڵکیان بە تەواوی زەلیل کردبوو، تاوان و قۆرخکاری و خوێنرێژیی پیاوانی کڵێسا تەواوی سنوورەکانی تێپەڕاندبوو. هەزاران هەزار هاوڵاتیی مەسیحی لەپێناوی ویستی پاوانخوازی کڵێسا بۆ داگیرکاریی خۆرهەڵات بوونە قوربانی. دادگایی تەفتیشیان دامەزراند تایبەت بەو زانا و بیرمەند و داهێنەرانەی کە هەوڵەکانیان لەگەڵ ویست و بەرژەوەندیی پیاوانی کڵێسادا نەدەهاتەوە و بەم هۆیەوە چەندین زانا و بیرمەندی گەورە دووچاری سزای توند هاتن، ئەمانە هەموو سیمای دیاری ئایینی مەسیحی بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

سیستمی ئیقتاعی دەرەبەگایەتی یەکێک لەو سیستمانە بوو کە لە سەدەی هەشتەمدا لە ئەورووپا گەییشتە لوتکە، بە شێوەیەک سەرمایەدارێک چەندین پارچە زەویی گەورەی داگیر دەکرد، یاخود دەیکڕی یان لە دەسەڵاتی وەردەگرت. هەرچی سوود و داهاتی ئەو زەوییانە هەبوو بۆ ئەو دەبوو. دانیشتوانی نێو ئەو زەوییانەیش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبوونە کۆیلە و کرێکاری ئەو، لە بەرانبەریشدا خاوەن زەوییەکە تەنیا خواردن و ژیانێکی سادەی بۆ دابین دەکردن.[1] ئەم سیستمە هێندە نادادگەر و ستەمکارانە بوو دەبوو هەموو لایەک لە سەروو هەموویانەوە خەڵکانی ئایینداری لە دژی بجووڵانایەتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە نەک هەر دژی نەوەستانەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی توند پشتگیرییان کرد و لە هەر کوێش دەرفەرت هەبوایە خودی پیاوانی کڵێسا پەیڕەویان لێ دەکرد. بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ زۆرێکی زۆر لە زەوییەکانی ئەورووپایان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە. یەکێک لە ڕیفۆرمیستە مەسیحییەکانی ئەم بوارە، بە ناوی «ویکلف» ڕەخنەی توند لە کڵێساکان دەگرێت و لەم بارەیەوە دەڵێت: "کڵێساکان دەستیان بە سەر تەواوی زەویی ئینگلتەرادا گرتبوو، بەبێ

---

(١) بڕوانە: قراءة فی تاریخ و حضارة أوروبا العصور الوسطی، أشرف صالح، بیروت ٢٠٠٨ شرکة کتاب الألکترونی العربی.ص ٧٨

هیچ هۆکارێک هەستان بە فەرزکردنی باج بە سەر خەڵکیدا. لە ڕاستیدا پیاوانی کڵێسا و شوێنکەوتە قەیسەرەکان نەوەک شوێنکەوتەی خودا."(١) بەم شێوازە پیاوانی کڵێسا ستەمێکی بێشوماریان لە خەڵکی دەکرد. بە شێوەیەک خەڵکی هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ ئەوەی هەر چۆن بێت لەو ستەمە قوتاریان بێت. هەر جێگرەوەیەکی تری ئەو زوڵم و زۆرەیان قەبووڵ بوو، تەنانەت ئەگەر بە ڕیشەکێشکردنی خودی کڵێسا و ئایینی مەسیحییش بێت. هەر بەم هۆیەوە زانایان و بیرمەندانی خۆرئاوای چەندین فەلسەفە و بەرنامەی جیاوازیان لەپێناوی ئازادکردنی تاکی خۆرئاوایی خستە ڕوو کە بوونە هۆکاری دەرکەوتنی چەندین بەرنامە و پەیڕەو و پرۆگرامی جیاواز.

لەو کاتەی خەڵک لە کەنیسەی ڕۆمانی (کاسۆلیکی) بێزار بووبوون، چونکە وەک دەسەڵاتێکی زاڵبوو لەنێو کۆمەڵگە و وڵاتدا باجی زۆری دانابوو. بە دەر لە هێنانەکایەوەی بارودۆخی قورس و ناهەموار لە ڕووی ئابوورییەوە، هەروەها لە سەر ئاستی ڕۆحی و فکرییش کەنیسە کاریگەریی زۆری خستبووە سەر خەڵک. ئەمە وێڕای ئەوەی دادگاکانی سەر بە کەنیسە هێرشیان دەکردە سەر زانست و زانایان و حوکمی زۆریان بە سەریاندا دەسەپاندن و لە ناویان دەبردن.

کڵێسای کاسۆلیکی دژی هەر هەنگاوێک دەوەستایەوە کە دەکرا لە ڕێی ئەوەوە دۆزینەوەیەکی زانستی بێتە بەرهەم. بەو پێیەی پیاوانی کڵێسا دەترسان لە هەر پێشکەوتنێکی زانستی و هەر پێشکەوتنێکیان بە مەترسی بۆ سەر دەسەڵات و هەژموونی خۆیان دەزانی، ئەگەر مەسیحییەت ئایینێکی خودایی بێت و وەک خۆی مابێتەوە، ئەوا بە دڵنیایی هیچ کات پێچەوانەی زانست نابێت و چەندین تاوانی گەورەیان بەرانبەر زانایان و داهێنەران ئەنجام دا و

---

(١)تاريخ أوروبا فيشر ٢-٣٦٣ وەرگیراوە لە العلمانية سفر الحوالي.

پیاوانی ئایینی ببوونە بەڵایەک بە سەر شانی خەڵکەوە. چەند نموونەیەک لە توندڕەویی کڵێسا و پیاوانی ئایینی مەسیحی دەخەینە ڕوو لە مێژوودا:

١- «گالیلۆ» (١٥٦٤-١٦٤٢ز): یەکێک بوو لەو کەسانەی کە بانگەشەی بیردۆزی کۆپەرنیکۆسی دەکرد بۆ سووڕانەوەی ئەستێرەکان بە دەوری خۆردا و زەوی چەقی زەوی نییە، بەڵام لە ساڵی (١٦٣٢ز) لەلایەن کەنیسەوە فەرمانی گرتنی درا و حوکمی زیندانیی هەتاهەتایی بە سەردا سەپێنرا، هەروەها فەرمان درا کە نووسراوەکانی قەدەغە بکرێت. لە ماڵی خۆیدا مایەوە تاوەکوو مرد.

٢- «سافوناروڵا» (١٤٥٢-١٤٩٨ز): ڕاهیبێکی ئیتالیی چاکساز بوو. داوای چاکسازی لە فلۆرەنسا دەکرد و ڕەخنەی لە کەنیسە و کارەکانیان دەگرت. لەلایەن پاپاوە بانگ کرا بۆ ڕۆما بەڵام نەڕۆیشت، دواتر لە فلۆرەنسا دەستگیر کرا و لە ساڵی ١٤٩٨ز بە تۆمەتی ڕەخنەگرتن لە پیاوانی ئایینی و کەنیسە کوژرا و جەستەی سووتێنرا.

٣- «جوردانو برونو» (١٥٤٨-١٦٠٠ز): ڕاهیب و فەیلەسووف و چاکسازی ئیتالی. یەکێک لەو کەسانەی کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زەوی چەقی گەردوونە و بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە. ئەوە بوو حوکمی حیرمانی درا و لە (ڕۆما) دەرکرا، دواتر ٨ ساڵ زیندانی کرا. لە ساڵی (١٦٠٠ز) بە تۆمەتی کوفر زمانیان بڕی و سووتاندیان.

٤- «جان جاک ڕۆسۆ» (١٧١٢-١٧٧٨ز): نووسەر و فەیلەسووفی بەناوبانگ داوای چاکسازیی دەکرد لە ڕێی نووسینەکانیەوە، بەڵام لەلایەن کەنیسەوە فەرمانی گرتن و سووتاندنی پەرتووکەکانی بۆ دەرکرا ئەوە بوو ڕای کرد بۆ سویسرا و دواتر لەوێیشەوە ڕای کرد بۆ ئینگلتەرا و دوا جار گەڕایەوە بۆ فەرەنسا، دواتر نەفی کرا بۆ ئینگلتەرا و لە ساڵی (١٧٧٨ز) بە نەخۆشی مرد، کڵێساش ڕەتی کردەوە کە بە پێی نەریتی ئایینی بنێژرێت.

هەنگاوی دواتر پیاوانی کڵێسا هەستان بە قەدەغەکردنی خوێندنەوەی ئینجیل لە خەڵکانی ئاسایی، واتە بۆ هیچ کەس نەبوو ئینجیل بخوێنێتەوە و لێکۆڵینەوەی لە بارەوە بکات جگە لە خۆیان. بە جۆرێک هیچ ڕێگەیەکیان نەهێشتبووەوە بۆ گەیشتن بە خودا مەگەر بە نێوەندگیری ئەوان نەبێت. هەر کەس تاوانی کردبا دەبوو لای ئەوانە پەشیمانی دەرببڕێت. قۆناغی دواتر پیاوانی کڵێسا کەوتنە فرۆشتنی بەهەشت بلیتی تایبەتیان لەم بارەیەوە بە سەر کڕیاردا دابەش دەکرد کە پێی دەگوترا (صکوک الغفران) هەر کەس پارە و دارایی زیاتری بدایە جێگەیەکی باشتر و فراوانتریان لە بەهەشت پێ دەفرۆشت. دواتر بەڵگەنامەی کڕینیان پێ دەدا پاشان کڕیار بۆی هەبوو هەر تاوانێک بیەوێت ئەنجامی بدات. بە پێچەوانەوە هەر کەس پابەندی ڕێنماییەکانی کڵێسا نەوبوایە دووچاری نەفرەتی هەتاهەتایی دەهاتەوە، شوێنی لە دۆزەخ دیاری دەکرا. بە دەیان و بگرە بە سەدان ڕێگە پارەیان لە مەسیحییەکان دەکێشایەوە، تا وای لێ هات پیاوانی کڵێسا بوونە چینێکی دەوڵەمەندی کۆمەڵگە و پارە و داهاتی کڵێسا لە ژمارە نەدەهات، بە شێوەیەک لە داهاتی حوکوومەتی ئەو وڵاتانە زیاتر بوو. خەڵکیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەژارتر دەبوون. وەک «ویل دیورانت» لە پەرتووکی «مێژووی شارستانییەتەکان»دا دەڵێت: "زۆرترین و بەنرخترین موڵک و داراییەکان لە ژێر دەستی کڵێسادا بوون بە جۆرێک کڵێسا «فلدا» خاوەنی نزیکە ١٥٠٠٠ کۆشک بوو، کڵێسای «سانت جول» خاوەنی ٢٠٠٠ کۆیلە بوو. پیاوێکی ئایینی وەک «ئەلکۆین فیتور» زیاتر لە بیست هەزار کۆیلەی هەبوو. بەم شێوازە کڵێساکان ببوون بە بەشێک لە سیستمی ئیقتاعی دەرەبەگایەتی."[(١)]

قۆناغی دواتر لە بریتانیا ئەفسانەکەی «فرەنسیس بەیکۆن» سەربەخۆیی

---

(١) بڕوانە: موسوعة قصة الحضارة ول ديورانت ترجمته الدكتور زكي نجيب محمود : دار الجيل للطبع والنشر والتوزيع» ج١٤، ص ٤٢٥،

ڕاگەیاند. بە ئامانجی ڕزگارکردنی زانست لە کۆتوبەندی ئەفسانە کە لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی «پێشکەوتنی زانست» (١٦٠٥) دەیوت: "دەبێت هەموو ئەفسانەکانی ئایین ڕووبەڕووی ڕەخنە ببنەوە و لە کاتی ناکۆکی و بەریەککەوتنیاندا لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکاندا وەلا بنرێن." هەروەها زانای سروشتناس «جیوردانۆ برونۆ» خاوەنی بیردۆز (تیۆری)ی «کۆپەرنیک» لە هەوڵی داهێنانی تێلسکۆپدا بوو کە لەلایەن دادگای پشکنینی سەر بە کەنیسەوە دەستگیرکرا و ٦ ساڵ لە زینداندا مایەوە و پاش ئەوەی پێداگیریی لە سەر ڕا و بۆچوونەکەی خۆی کرد، حوکمی کوشتنیان بە سەردادا و پێشنیاریان کرد دڵۆپێک خوێن نەبینرێت؛ ئەوەیش بەو مانایەی بە زیندوویی بسووتێنرێت ئەمەیش ساڵی ١٦٠٠ ڕووی دا.

هەر لە درێژەی ئەم بابەتانەدا، چەندین تیۆریای فەلسەفی پەیدا بوون وەک ئیزدواجیەتی دیکارتی. «دیکارت» لەم تیۆرییەدا پێی وا بوو کە ئایین و زانست هیچ کامیان دەسەڵاتیان نییە بە سەر ئەوی تریان، بە شێوەیەک هەر کامیان واقیعیتر بوو، دەبێت وەر بگیرێت.[1] دواتر «جۆن لۆک» بووە بانگەشەکاری ئەم مەزهەبە و بانگەشەی ئەوەی کرد کە پێویستە وەحی ئایین شوێن عەقڵ و لۆژیک بکەوێت. دواتر تیۆریای هێزی ڕاکێشانی نیوتن دەرکەوت کە گەورەترین کاریگەریی بە دوای خۆیدا هێنا. پاشان لە کایە جیاوازە کۆمەڵایەتی و زانستییەکان چەندین تیۆریای نوێ سەری دەرهێنا کە هیچ کام لەوانە لەگەڵ بیرۆکە ئەفسانەییەکانی ئایینی مەسیحیدا یەکیان نەدەگرتەوە.

سەدەی هەژدەهەم دۆخەکە بە تەواوی گۆڕا، گومانەکان سەبارەت بە بابەتە ئایینییەکان زیاتر پەرەیان سەند بە شێوەیەک خەڵکی ئەورووپا لە

---

(١) بڕوانە: مقال عن المنهج رينيه ديكارت ترجمته محمود محمد الحضيري دار الكتاب العربي.

قۆناغی بەپیرۆزڕاگرتنی ئایینی و کڵیساوە بەرەو بەپیرۆزڕاگرتنی عەقڵ هەنگاویان نا. کەواتە هۆکاری سەرەکیی ڕاپەڕینی ئەورووپییەکان دژی کڵێسا دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی سەرکوتکەری ئایینی کڵێسا.

بە گشتی هەموو ئەو بەریەککەوتنانە کاریگەرییان لە سەر سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەورووپا هەبوو. بۆ نموونە بە گوێرەی ئەوەی لە سەرەوە باس کرا هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عالەمانییەت لە خۆرئاوا لەدایکبوونێکی سروشتی و بابەتی و واقعییانە بوو. دەرئەنجامی زۆرداری و زاڵێتیی پیاوانی کەنیسە بوو کە لە ژێر چەتری خوداپەرستیدا، کەڵک و سوودیان لە ئایین وەردەگرت بۆ هێنانەدیی حەز و ئارەزوەکانیان و مافی حەڵاڵ و حەرامیان بە سەر خەڵکیدا دەسەپاند. بۆ وێنە خەتەنەکردن واجب بوو پاشان حەرام کرا. هەروەها پەیکەرەکان بە «شیرک» دادەنران و پاشان بوون بە هێمایەک بۆ باوەڕداریێتی و... هتد.

# هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عالەمانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا

لە خۆرهەڵات و بە تایبەت خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، مەسەلەی سێکولاریزم و دەوری ئایین تا ڕادەیەک جیاوازە لە خۆرئاوا. پەلکێشانی سەرمایە لە ئەورووپاوە بەرەو خۆرهەڵات تەنیا کاڵای نەبرد، بەڵکوو پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و سەرخانی سیاسیی خۆرهەڵاتیشی لەبەریەک هەڵوەشاند. بۆ نموونە هەڵوەشانەوەی خەلافەتی ئیسلامیی عوسمانی یەکێک لە ئاکامەکانی بوو. بەڵام زاڵبوونی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری بە هەمان پرۆسەی دوورودرێژی سەرهەڵدان و کەڵەکەی سەرمایە و مانیفاکتۆرە و دروستبوونی یەکێتییە پیشەییەکان نەڕۆیشت کە لە ئەورووپا چەندین سەدەی خایاند. بە هەمان شێوە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و سەرخانی سیاسیی دەرەبەگایەتییش هەمان پرۆسەی ئاڵوگۆڕی شێنەیی و گۆڕینی نەریتە کۆنەکان بە نەریتی نوێ نەبینی. ئاڵوگۆڕەکانی خۆرهەڵات لە ژێر کاریگەریی فاکتەرەکانی پەیوەست بوونەوەبوو بە بازاڕی جیهانی سەرمایە و جێگاوشوێنی ئابووری و سیاسیی خۆرهەڵات لەو دابەشکردنە ئیمپریالیستییەی جیهاندا کە تێیدا خۆرهەڵات وابەستەی ئەورووپا بوو.

ئاڵوگۆڕی پەیوەندیی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری لە خۆرهەڵاتدا پێویستی بە دەستبەسەراگرتنی مادەی خاو و سەرچاوەکانی وزە و زەویوزار و هێزی کاری هەرزانی کرێکاران بوو. هاوکاتیش پێویستی بە دامەزراندنی ئیدارەیەکی مۆدێرنی سیاسی بوو. پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بە شێوەی ڕیفۆرمی دەوڵەتی ئەنجام دران. هۆکار و کەرەستەکانی

دروستبوونی عالەمانییەت لە خۆرئاوا لەبار بوون، ژینگەی سەرهەڵدانەکەی تەواو لەبار بوو، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: عالەمانییەت لە جیهانی ئیسلامی بۆ چی و لەپێناوی چیدا؟ لە کاتێکدا ئەو دۆخەی لە ئەورووپا هاتە پێش پەیوەست بە دەرکەوتنی عالەمانییەتەوە لە جیهانی ئیسلامیدا بوونی نییە. بە پێچەوانەی ئینجیلەوە بە کۆدەنگیی موسڵمانان و بە گەواهیی خودی مەسیحییەکان، قورئان بە هیچ شێوەیەک گۆڕانکاریی بە سەردا نەهاتووە، بەو پێیەی پەروەردگار پەیمانی پاراستنی داوە وەک قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ۝﴾ [الحجر: ٩]

سەربارەی ئەمە ئایینی ئیسلام ئایینێکی تەواو کامڵە و بە پێچەوانەی مەسیحییەتەوە هیچ زیاد و کەمێکی تێدا نییە. وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴾ [المائدة: ٣] واتە: «ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواوکردن و بە پایانم گەیاند، نیعمەتی خۆشم بۆ تەواو کردن، ئیسلامیش بە بەرنامەی ئایین بۆ هەڵبژاردن.» پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) ئایینی ئیسلامی بەبێ کەم و زیاد بەو شێوەی پەروەردگار داوای لێ کردبوو گەیاندە خەڵکی. وەک خۆی دەفەرمووێت: «تركتكم على المحجة البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها بعدي إلا هالك»[1] «جێم هێشتوون لە سەر ڕێگەیەکی ڕوونوڕەوان شەوی وەک ڕۆژی وایە -واتە هیچی شاراوەی تێدا نییە- هیچ کەس لێی لا نادات مەگەر دڵکرمۆڵ نەبێت.»

ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسووف و بیرمەندانی خۆرئاوا گەواهیی ئەم بابەتەیان داوە. نووسەرێکی گەورەی وەک «برنادشۆ» دەڵێت: "پێم وایە ئەگەر پیاوێکی وەک «موحەممەد» حوکم و دەسەڵاتی تەواوی جیهانی بکەوتایەتە دەست، ئەوە زۆر بە جوانی سەرکەوتوو دەبوو لە هەڵسووڕاندن

---

(١)رواه ابن ماجة ٤٣ واحمد والحاكم والطبراني .

و ئاراستەکردنی جیهان بەرەو جیهانێکی باشتر و تەواوی کێشەکانی دونیای چارەسەر دەکرد بە شێوەیەک جیهانی پڕ دەکرد لە خۆشگوزەرانی و خۆشبەختی."(١)

ئەو خۆشبەختی و خۆشگوزەرانییەی «بردناشۆ» باسی لێوە دەکات بۆ ئەو کاتەش دەبێت کە خەلیفەکانی ڕاشدین لە دوای یەک فەرمانەکانی ئەوی تریان وەک خۆی بێ کەم و زیاد جێبەجێ دەکرد، خەڵکی هەموو وەک دەنکی شانە پێکەوە دەژیان. بەو پێیەی لە ئیسلامدا هیچ کەس لە هیچ کەس زیاتر نییە، شتێک نییە بە ناوی پیاوی ئایینی و پیاوانی یاسادانان و پیاوی پیرۆز. هیچ کەس بۆی نییە ببێتە واسیتە و خاڵی پێوەندی لەنێوان خودا و خەڵکی. تەواوی خەڵکی پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە لەگەڵ خودای خۆیان. خوێندنەوەی قورئان تایبەت نییە بە کۆمەڵە و دەستەیەکی جیاواز، بەڵکوو بابەتێکی گشتییە بۆ تەواوی موسڵمانان لە ئیسلامدا، کەس بە زۆر موسڵمان ناکرێت. وەک ئەوەی قورئان بە ئاشکرا دەفەرموونێت: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ۖ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ۚ﴾ [البقرة: ٢٥٦]

زۆرەملێیی و تۆبزی لە ئاییندا بوونی نییە. لە ئیسلامدا خەڵکی ئازادە کە دیندار دەبێت.، یاخود بێدین وەک قورئان دەفەرموونێت: ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ﴾ [الكهف: ٢٩] ئیسلام نەک هەر دژایەتیی زانست و زانیاریی ناکات، بەڵکوو لە چەندین ئایەتی قورئاندا تیشک دەخاتە سەر گرنگیی زانست و زانیاری و بە چاوی ڕێز و تەقدیرەوە دەڕوانێتە زانایان. وەک دەفەرموونێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ﴾ [فاطر: ٢٨]، یان دەفەرموونێت: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾﴾ [آل عمران: ١٨]

---

(١)بڕوانە: الإسلام والرسول في نظر منصفي الشرق والغرب، آل بوطامي آل على، أحمدبن حجر، لا: ١٣١، مكتبة منار السبيل _الدوحة.

ئیسلام نەک ڕێگری لە بیرکردنەوە ناکات. بەڵکوو لە چەندین ئایەتی قورئاندا مرۆڤەکان هان دەدات بۆ بیرکردنەوە وردبوونەوە و تێفکرین لە شتەکانی دەوروبەرمان، وەک دەفەرمووێت: ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾﴾ [یونس: ١٠١] دیسان دەگەڕێینەوە سەر سەرەتای بابەتەکە، ئەویش بۆچی بەم شێوەیە عالەمانییەت لەنێو وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە، لە کاتێکدا ئایینی ئیسلام پێچەوانەی تەواوی بنەماکانی نەسرانییەتە، ئیتر بۆچی بەم شێوەیە عالەمانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بووەتەوە. لێرەدا بە کورتی تیشک دەخەینە سەر چەند هۆکارێک:

## یەکەم: هۆکاری دەرەکی

خۆرهەڵاتناسی ئەورووپی قەشە «جب» دەڵێت: "هەر لە سەرەتای هاتنی موحەممەدەوە لەنێوان شمشێرەکانی موسڵمانان و مەسیحییەکان پێکدادان ڕوویان دا، بۆیە بەردەوام جیهانی مەسیحیی خۆرئاوا، جیهانی ئیسلام بە یەکەم دوژمنی خۆی دەزانێت."[1]

ئەمە ڕاستییەکە هیچ کەس ناتوانێت نکۆڵی لێ بکات. جیهانی خۆرئاوایی بەگشتی و ئەورووپی بەتایبەتی هەڵگریی دوژمنایەتییەکی لەمێژینەن بەرانبەر جیهانی ئیسلامی. ئەم بابەتە نەک وەک بانگەشە، بەڵکوو وەک ڕاستییەک کە ژمارەیەکی بەرچاو لە زانایان و بیرمەندان و لێکۆڵەرانی خۆرئاوایی پشتڕاستییان کردووەتەوە، ئەو ڕاستییەیان خستوەتە ڕوو کە جیهانی خۆرئاوایی هیچ کات لەگەڵ جیهانی ئیسلامی و موسڵمانان دانوویان نەکوڵاوە و لە تەواوی قۆناغەکاندا دژایەتیی جیهانی ئیسلامییان کردووە، هەوڵیان داوە

---

(١)بڕوانە: وجهة الإسلام الحركات الدينية في١٩٩٣، مجموعة من المستشرقين مركز المسبار ص ١٧.

هێندەی پێیان دەکرێت بچووکی بکەنەوە تاوەکوو ئەوەی وەک ئێستای لێ هاتووە.

بە ڕوانین لە شوێنەواری جەنگ و هێرشی خاچپەرستەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئامانجی سەرەکیی خاچییەکان لە هێرشەکانیان بۆ سەر خۆرهەڵاتی ئیسلامی ئامانجێکی ئایدیۆلۆژیی لە پشتەوەیە کە خۆی لە لێدان و لاوازکردنی موسڵمانان و ڕماندنی دەوڵەتی ئیسلامی و هێنانەپێشەوەی بەدیلێک دەبینێتەوە. لە قۆناغەکانی داهاتوودا ئەو بەدیلە لە چوارچێوەی دیموکراتیەت و عالەمانییەتدا وەک تیۆریایەکی بەدیل خزێنرایە نێو جیهانی ئیسلامییەوە. خۆرئاواییەکان ئەو ڕاستییە باش دەزانن کە هەڵگەڕانەوەی موسڵمانان بە شێوەیەکی یەکجارەکی لە ئایینەکەیان بەرەو مەسیحییەت بابەتێکی مەحاڵە، بەو پێیەی پێشتر هەوڵەکانی پەیوەست بەم بابەتە* تاقی کراونەتەوە و ئامانجەکانیان شکستیان هێنا و موسڵمانان ئامادە نین واز لە ئایینەکەیان بهێنن و ببنە مەسیحی. بۆیە خستنەڕووی هزرەکانی وەک عالەمانییەت و دیموکراتییان وەک بەدیلی ئەم بابەتە خستە ڕوو. «جان جۆل ڕۆت» ئاماژە بەمە دەکات دەڵێت: "ئەو ژمارە زۆرەی خۆرئاواییەکان نێردراونەتە وڵاتانی خۆرهەڵات، مەبەست و ئامانجی سەرەکییان گۆڕینی بیروباوەڕی خۆرهەڵاتییەکانە."[١] جگە لە «ڕۆسۆ» ژمارەیەکی بەرچاوی تر لە زانایان و لێکۆڵەرەوانی خۆرئاوای ئەم بابەتەیان پشتڕاست کردووەتەوە. دوای هێرشی خاچییەکان و کوشتاری ژمارەیەکی بەرچاو لە موسڵمانان دوای ئەمەم هەنگاوە دوژمنکارییانە داگیرکەران هەستان بە هەڵپەساردنی دەستووری ئیسلامی و نووسینەوەی دەستوورێکی بەدیل و کارکردن لە سەر خستنەڕووی یاسایەکی وەزعیی لائیکی کە لەلایەن ناوەندە ئەکادیمییەکانی

---

(١) الاسلام فی الغرب جان بول رو، ت: نجده هاجر و سعید الغز، المکتب التجاري للطباعة والنشر، ص ٤٢.

خۆرئاواوە کاری لە سەر کراوە و نووسراوەتەوە. هیندستان یەکەمین وڵات بوو کە دوای هێرشی داگیرکەران دووچاری ئەم گۆڕانکارییە هات. بەو پێیەی تا ساڵی ١٧٩١ یاسای گشتی لەو وڵاتە یاسا گشتییەکانی ئیسلام بوون، دوای داگیرکاریی ئینگلیزەکان یاساکانی ئەم وڵاتەیان گۆڕی بۆ یاسای وەزعیی عالەمانی بە زەبری هێز لە وڵاتەدا چەسپاندیان.

دوای هیندستان جەزائیر دووچاری هەمان دۆخ هات, دوای ئەوەی ساڵی ١٨٣٠ دووچاری داگیرکاری فەڕەنسییەکان هات. فەڕەنسییەکان گورزێکی توندیان لە موسڵمانی جەزائیر دا. دوابەدوای داگیرکردنەکە ڕاستەوخۆ فەڕەنسییەکان دەستووری ئیسلامییان هەڵوەشاندنەوە و دەستوورێکی نوێیان نووسییەوە، دواتر ساڵی ١٨٨٣ زایینی لە سەر دەستی بەکرێگیراوانی فەڕەنسی تەواوی یاسا و دەستوورە ئیسلامییەکان هەڵوەشێنرانەوە.

قۆناغی دواتر، توونس دووچاری ئەم مەترسییە هات دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٠٦ لەلایەن فەڕەنسییەکانەوە داگیر کرا و تەواوی یاسا و دەستوورە ئیسلامییەکانی ئەو وڵاتەیان هەڵوەشاندەوە.

بە هەمان شێوە ساڵی ١٩١٣ مەغریب دووچاری هەمان مەترسی هات و داگیرکەران دەستووری ئیسلامییان هەڵوەشاندنەوە و دەستوورێکی وەزعیی عالەمانیان دامەزراند.

قۆناغی دواتر ناوچەکانی شام و عێراق و تورکیا دووچاری هەمان مەترسی هاتن، بە تایبەتی دوای ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی لە سەر دەستی «کەمال ئەتاتورک» ئیتر بابەتەکە چوارچێوەیەکی فراوانتری بە خۆیەوە بینی. تەواوی وڵاتانی ئیسلامی یاسا و دەستووری ئیسلامییان بە تەواوی هەڵوەشاندنەوە. تەواوی بەرنامە و پەیڕەو و پرۆگرامە ئایینییەکیانیان هەڵوەشاندەوە، زیاد لەمە «ئەتاتورک» لە تورکیا تەواوی شەعائیر ئایینییەکانی هەڵوەشاندەوە بە

شێوەیەک دامەزراوەی ئەوقاف و ماڵیاتەکەی هەڵوەشاندەوە، پیتی عەرەبی وەلا نا و پیتی لاتینیی کردە جێگرەوەی و مێژووی کۆچی هەڵوەشاندنەوە و مێژووی زایینی کردە جێگرەوی، تاوەکوو ئەوەی ئایینی کردە بابەتێکی لاوەکیی ناو کۆمەڵگە و تەواوی جومگەکانی یاسا و ژیانی گۆڕی بە جومگەی عالەمانی خۆرئاوایی، هەموو ئەم گۆڕانکارییانە بە پاڵپشتیی خۆرئاواییەکان و دامەزراوە زایۆنییە جیهانییەکان هاتە بەرهەم.[1]

بەم شێوەیە تەواوی وڵاتانی ئیسلامی بە پلانی خۆرئاوا و بەکرێگیراوەکانیان دەستووری وەزعیی عالەمانییان تێدا جێگیر کرا و ناوەندە ئیسلامی و زانستییەکانی موسڵمانان دووچاری ڕووخان و پەراوێزخستن هاتن.

## دووەم: هۆکاری ناوخۆیی

هۆکاری ناوخۆیی بە یەکێک لە دیارترین ئەو هۆکارانە هەژمار دەکرێت کە عالەمانییەکان لە ڕێیەوە جێپێیان لە نێو جیهانی ئیسلامی بەهێز بکەن. لەگەڵ ئەوەی سەرەکیترین پاڵنەری گەشەسەندنی عالەمانییەت لە جیهانی ئیسلامیدا هۆکار و پاڵنەری دەرەکییە، بەڵام لە ڕاستیدا پاڵنەری ناوخۆیی هیچی کەمتر نییە لە هۆکار و پاڵنەرە دەرەکییەکان.

هەڵەمان نەکردووە ئەگەر سادەیی و دڵسافیی خودی موسڵمانان بە دیارترین هۆکاری ناوخۆییی لاوازبوونی جیهانی ئیسلامی و بڵاوبوونەوەی عالەمانییەت دابنرێت، ئەمە جگە لە کێشمەکێشمی ناوخۆیی و ناتەبایی نێوان خودی موسڵمانان خۆیان و پەیدابوونی چەندین فیرقە و کۆمەڵەی جیاواز و ناکۆکییان

---

(١)بڕوانە: الرجل الصنم وەرگێڕانی عبدالله عبد الرحمن مؤسسة الرسالة، چاپی دووەم ١٨٩٢ کمال اتاتورک ئەم پەرتووکە بە گرنگترین سەرچاوە دادەنرێت کە وردەکارییەکانی ژیانی موستەفا کەمال ئەتاتورکی تێدا خراوەتە ڕوو.

لە سەر بابەتە ئاینییە زەقەکان و قووڵکردنەوەی چەندین بابەتی لاوەکی و پشتکردنە بابەتە گرنگەکانی پەیوەست بە ژیان و ژیاری موسڵمانانەوە کە لە کۆتاییدا هەموو ئەمانە بوونە مەترسی لە سەر شوناس و پێگەی موسڵمانان و کاریگەرییەکی نەرێنیی بەرچاوی دروست کرد لە سەر دەستووری و یاسایی ئیسلامی. دیارترین نموونەی نێو ئەم بابەتە دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەویی بوو بە ڕۆحیەتێکی شیعیی ڕادیکاڵەوە کە تەواوی ئامانجەکانی لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا دەبینییەوە و بە تەواوی پاڵپشتیی خۆرئاواییەکان بوون بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی. لە نیوە دوورگەی هیندیدا دەوڵەتی مەغۆلی بە هۆی ناحەکیمیی سەرکردایەتیی دەوڵەتەکە و خزاندنی چەندین بابەتی هۆزی و نەتەوەیی بۆ نێو کایەکانی دەوڵەتەوە کە بە ئاسانیی ئینگلیزەکان توانییان دەستی بە سەردا بگرن و کۆتاییی پێ بهێنن.

دەوڵەتی عوسمانی وەک فراوانترین و باشترین دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خۆیدا توانییان بە هۆی هەوڵ و تێکۆشانەکانیانەوە ئیسلام بگەیەنە زۆرێک لە ناوچەکانی ئەورووپا. توانییان بۆ ماوەی چەندین سەدە خۆرهەڵاتی ئیسلامی لە مەترسیی خۆرئاواییەکان بپارێزن، بەڵام دواتر بە هۆی ڕووداوە نەرێنییەکان دروستبوونی چەندین دۆخی خراپ لە نموونەی گۆڕانکاریی لە سیستمی بەڕێوەبردن و لادانی عەقیدی و دەمارگیریی و هۆزی و ناوچەییی دواکەوتوو و سەربازی و سیاسی و ئیداری و خەمساردیی بەشێکی بەرچاو لە سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی ئەم دەوڵەتە دووچاری لاوازییەکی بەرچاو هات. سەرکردەکانی وڵاتانی عەرەب ئەم لاوازییەی دەوڵەتی عوسمانییان قۆستەوە و کەوتنە دژایەتیکردنی لە بەری باکوور و خۆرئاواوە. ڕووسەکان و خۆرئاواییەکان کەوتنە هێرشکردن و داگیرکردنی ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە، تاوەکوو لە کۆتاییدا تەواوی ناوچەکانی ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانییان بە پیلانی سەربازی و سیاسی داگیر کرد. بەرئەنجام بۆ هەمیشە

کۆتاییيان بەم دەوڵەتە هێنا و تەواوی یاسا و دەستوورە ئیسلامییەکانیان هەڵوەشاندەوە و دەستووری و یاسایی لائیکییان کردە جێگرەوەی.

لەسەر ئاستی جیاوازی و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی نێوان کۆمەڵە و گرووپە ئیسلامییەکان گرژی و ئاڵۆزی و ناتەباییەکی بەرچاو لەنێوانیاندا دروست بووبوو، بەشێکی بەرچاو لە کارەکانیان لە هەوڵدان بۆ دژایەتیکردن و سڕینەوەی یەکیدا تەرخان کردووە و هەندێک جاریش تا ئاستێکی مەترسیدارتر خوێن و ماڵی یەکتریان حەرام کردووە. هاوتەریب لەگەڵ ئەم هۆکارانە دۆخی ئاڵۆزی نێوان ڕێبازە ئیسلامییەکان نێو جیهانی ئیسلامی هیچیان کەمتر نەبووە لە هۆکار و پاڵنەرە دەرەکییەکان. بەشێکی بەرچاوی ئەم ڕێبازانە بە توندی دژایەتیی یەکتریان کردووە، تەواوی هەوڵ و تواناکانیان لە دژایەتیکردنی یەکتریدا بە خەرج دەدەن کە تا ئێستایش جیهانی ئیسلامی بە دەست ئەم پەرتەوازەبوونەوە دەناڵێنێت. هاوکات ئاراستە هزرییەکان و قوتابخانە فەلسەفییەکان دەورێکی کاریگەرییان بینی لە لاوازکردنی هەژموونی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی عالەمانییەت و فەلسەفە جۆراوجۆرە خۆرئاواییەکان. لەم چوارچێوەیەدا نەتەوەپەرستێکی مەسیحیی وەک «ئەلبێرت حۆرانی» لەو بارەیەوە دەڵێت: "زۆرێک لە نووسەرانی مەسیحی بانگەشەی هزری عالەمانییان کرد و تەواوی هەوڵەکانیان لەپێناو سەرخستنی عالەمانییەت خستە گەڕ."[١]

لە سەر ئاستی تاکەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی داڕمانێکی بەرچاو بەرۆکی تاک بە تاکی کۆمەڵگای ئیسلامی گرتبوو، خۆرئاواییەکان سەرکەوتوو بوون لە لاوازکردن و داتەپاندنی شوناس و کەسایەتیی تاکی موسڵمان، بە جۆرێک موسڵمانان ئامادە بوون هەر هزر و بیروباوەڕێکی بێگانە قەبووڵ بکەن، جگە لە هزری ڕەسەنی ئیسلامی کە لە کۆتاییدا دەورێکی

---

(١) فكرة القومية العربية على ضوء الاسلام د صالح العبود. دار الطيبة للصبع والنشر والتوزيع السعودية ، ص ٨٠

کاریگەری بینی لە بڵاو بوونەوە هزری لائیکی و نائینی لە نێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا و لە سەر ئاستی دەستەبژێری ڕۆشنبیرانیش. ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیران و قەڵەمبەدەستانی جیهانی ئیسلامی بوونە بانگەشەکاری هزری عالەمانییەت و دژایەتیکردنی ئیسلام، لە کۆتاییدا توانییان جێپەنجەی خۆیان بە سەر کۆمەڵگەکانیانەوە جێ بهێڵن. بەشێک لەو نووسەر و دەستەبژێردانە پێشتر ڕوویان کردبووە وڵاتانی ئەورووپا و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کەوتبوونە ژێر کاریگەریی هزریی خۆرئاواییەوە، لەم قۆناغەدا لوبنان بووە سەنتەرێکی گرنگی پرۆژەی بەخۆرئاواییکردنی جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی دوای دروستبوونی پەیوەندییەکی توند لەنێوان هەر یەک لە ئەمیری دروزی «فەخردەینی دووەم» و لەگەڵ «بابا گریفواریوسی سیازدەهەم» کە بووە ڕێخۆشکەر بۆ چوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە فێرخوازی لوبنانی بۆ ڕۆما و کاریگەربوونیان بە هزری لائیکی خۆرئاوایی و دواتریش گەڕانەوەیان وەک بانگەشەکاری ئەو هزرە بەشێکی بەرچاو لەوانە بوونە ڕابەری هزری عالەمانی لە ناوچەکە.[1] دواتر ئەم جۆرە لە ناردنە دەرەوەی قوتابییان و فێرخوازان چەندین وڵاتی ئیسلامیی تری گرتەوە بە تایبەتی لە میسر کە ئەو کات سەنتەرێکی زانستی و مەعریفیی گرنگی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بوو.

زۆربوونی ژمارەی فێرخوازانی جیهانی ئیسلامی لە ئەورووپا و بڵاوبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە پەرتووک و نووسراو، بەرهەمی خۆرئاواییەکان لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامی جۆرێک لە ڕێخۆشکەری دروست کرد، تاوەکوو ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاو لە بیرمەندان و دەستەبژێرانی نێو جیهانی ئیسلامی بە ئاشکرا بانگەشەی عالەمانییەت و هەڵپەساردنی ئایین بکەن لە نموونەی

---

(١) تاريخ الموحدين الدروز السياسي في المشرق، منشورات المجلس الدروزي للبحوث والانماء لبنان، ص ١٤٢. وەرگیراوە لە پەرتووکی العلمانيون والقران الكريم الدكتور احمد ادريس طعان، دار ابن حزم الرياض ٢٠٠٧، ص ١٣٢.

«فرنیسیس مراش» له ١٨٦٧-١٨٧٣ و «خەلیل سعادە» و «بخیت حداد» ١٨٦٧-١٨٩٩ و «شبلی شمیل» ١٨٨٦ و «فەرەح ئەنتوان» له ١٨٩٧ و «یەعقووب سەروف» و «نیکۆلا حەداد» و «فارس نەمر» که هەر یەکێک لەمانە ڕەمزی بزاوتی عالەمانییەتن له خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.[1]

قۆناغی دواتر بزاوتی عالەمانییەت بەرەوپێشچوونێکی بەر چاوی به خۆیەوە بینیی به تایبەتیتر له سەر دەستی هەر یەک «تەها حوسەین» خاوەنی پەرتووکی (مستقبل الثقافة في مصر) و «سەلامە مووسا» خاوەنی پەرتووکی (الیوم والغد).

«تەها حوسەین» له پەرتووکەکەیدا به جۆشوخرۆشێکی بێ سنوورەوە بانگەشە بۆ هزری عالەمانییەت دەکات، به توندی پێداگریی دەکات له سەر ئەوەی که بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی مەحاڵە مەگەر به دوورخستنەوەی ئایین له ناوەندە گرنگەکانی ژیان و بەرجەستەکردنی عالەمانییەت نەبێت. له درێژەی ئەم بابەتانە چەندین هەوڵی هاوشێوە دەرکەوتن، لەو چوارچێوەیەدا کەسایەتییەکی دیاری ئەزهەریی به ناوی «عەلی عەبدولڕازیق» سالی ١٩٢٥ پەرتووکێکی بڵاوی کردەوە به ناوی (الاسلام واصول الحکم) ناوبراو لەم پەرتووکەدا تیشک دەخاتە سەر ئەوەی که ئیسلام جگە له پەیامێکی ڕۆحی هیچ بابەتێکی سیاسەت و دەوڵەت و فەرمانڕەوایی له خۆ نەگرتووە، بەڵکوو جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئیسلام و سیاسەتدا هەیە. موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) وەک پێغەمبەرانی تر تەنیا ڕابەرێکی ڕۆحییە و هیچی تر نه دەوڵەتی دروست کردووە نه سەرکردایەتیی دەوڵەتیشی کردووە. پەیامەکە وەک گشت پەیامەکانی پێش خۆی، بانگەشەی ئەوە دەکات «ئەوەی کاری قەیسەرە، با بۆ قەیسەر بێت؛ ئەوەی کاری خودایە، با بۆ خودا بێت.»

---

(١)العلمانية وانتشارها د. فتحي القاسمي، ص ١٧ الدراسات في المذاهب الفكرية المعاصرة، ص ١١٥.

«عەبدولڕازیق» بە چاوقاییمی باس لەوە دەکات کە دەسەڵات و حوکمی شەرعی بابەتێکی عورفی و کۆمەڵایەتییە لە ناو موسڵماناندا. دەنا لە بنەڕەتدا هیچ ڕەسەنایەتییەکی شەرعی نییە و هیچ بەڵگەیەک نییە لە سەر واجبوونی بەرپاکردنی دەسەڵات و حوکمی ئیسلامی.

# عالەمانییەت ئایینێکە لە ئایینەکان

ئەوەی ئاشکرایە ئامانجی سەرەکی و بنەڕەتی لە دروستبوونی عالەمانییەت دژایەتیکردنی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانە بە تایبەتی تر وەک کاردانەوەیەک دژی ئایینی مەسیحی، بەڵام لە سەردەمی نوێدا بابەتەکە تەواو گۆڕاوە. بە جۆرێک عالەمانییەت لە چوارچێوەی کاردانەوەی دژی ئایینی مەسیحییەت چووەتە دەرەوە و بە تەنیا بزاوتێکی کۆمەڵایەتیی ڕێگوزەر نییە، بەڵکوو ئایینێکی سەردەمی نوێیە و وەک تەواوی هەر یەکێک لە ئایینەکانی سەردەمی نوێی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی پێناسەیەکی لەم شێوەیە بۆ عالەمانییەت و ناساندنی وەک ئایین بابەتێکی سادە و ڕێگوزەر نییە، بەڵکوو بە پشتبەستن بە چەندین بەڵگەی زمانەوانی و فەرهەنگی و شەرعی و یاسایی وەک ئایین دەیناسێنن.

لایەنگرانی عالەمانییەت دەیانەوێت ئەو ڕاستییە بشارنەوە و عالەمانییەت تەنیا وەک قوتابخانەیەکی هزری و بزاوتێکی کۆمەڵایەتیی چاکسازیی دژە کڵێسا بناسێنن. هەموو ئەمانە تاوەکوو ئەوەی عالەمانییەت لەنێو جەماوەری موسڵماندا بە شێوەیەکی ئاسایی پێشوازیی لێ بکرێت و وەک بزووتنەوەیەکی چاکسازیی کۆمەڵایەتی و سیاسی مامەڵەی لەگەڵ بکەن و دووچاری هیچ بەریەکەوتنێکی ئایینی نەبێتەوە لەگەڵ ئیسلامدا. لە ڕاستیدا قورئان بە شێوەیەکی ئاشکرا دژی ئەم هزرە دواوە و بە ڕوونی تیشکی خستوەتەسەر، بەڵام موسڵمانان هەندێک جار وەک پێویست لە بابەتەکان تێ نەگەیشتوون. قورئانی پیرۆز کاتێک باس لە (اله) یان (تاغووت) دەکات بەشێکی بەرچاو لە موسڵمانان خودا و بوون و پەرستش تەنیا لە کڕنوشبردندا کورت دەکەنەوە،

یاخود مرۆڤ بتێک بخاتە پێش خۆی و کڕنووشی بۆ بەرێت و بیپەرستێت ئەو کات دەکرێت پێی بگوترێت هاوەڵپەیداکەر. ئەمە لە کاتێکدا هاوەڵپەیداکردن زۆر لەوە شاراوەترە کە خەڵکی دەیزانێت، وەک لە فەرموودەی پەیامبەردا (ﷺ) هاتووە کە هاوەڵ پەیداکردن بۆ پەروەردگار لە جووڵەی مێروو پەنهانترە. هەر بۆیە پەیامبەری خۆشەویست (ﷺ) هەمیشە نزای دەکرد و دەیفەرموو: «پەروەردگارا، پەنات پێ دەگرم لەوەی کە هاوبەشیت بۆ ئەنجام بدەم، لەوەی کە دەیزانم و لەوەی کە نایزانم.»

قورئانی پیرۆز ڕوونتر تیشک دەخاتە سەر چەمکی پەرستش و لە چوارچێوە تەقلیدییە باوەکەی دەیباتە دەرەوە، وەک لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا هاتووە، کاتێک ئایەتی پیرۆزی ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾ [التوبة: ٣١] دابەزی، «عەددیی کوڕی حاتەم» هاتە لای پەیامبەر (ﷺ) و وتی: "ئەی پەیامبەری خودا ئەوان هیچ کات ئەحبار و ڕوهبانەکانیان نەپەرستووە، ئەدی بۆچی خوای گەورە وا دەفەرمووێت؟" پەیامبەر (ﷺ) بە شێوەیەکی دروست مەبەستە قورئانییەکەی بۆ ڕوون کردەوە، تاوەکوو ئەوەی تێ بگات پەرستش بە تەنیا کڕنووشبردن نییە، لە وەڵامدا فەرمووی: «ئایا حەڵاڵی خوایان بۆ حەرام نەکردن، حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەکردن، ئەوانیش بە گوێیان دەکردن؟» «عەددی» گوتی: "بەڵێ هەر بەم شێوەیە." پەیامبەر (ﷺ) فەرمووی: «دەی پەرستش لەمە زیاتر دەبێت چی بێت.»[1] دەبینین پەیامبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا بە شێوەیەکی ڕوون چەمکی پەرستش لە واتا تەقلیدییەکەی لە کڕنووشبردن دەهێنێتە دەرەوە، بۆ واتا ڕاستەقینەکەی کە خۆی لە گوێڕایەڵیکردنی ڕەهادا دەبینێتەوە بۆ هەر یەکێک لە دروستکراوەکان جگە لە پەروەردگار.

---

(١)سنن الترمذي ٢٧٨-٥/ والبيهقي -الكبرى١٠/ ١١٦.

تاکی موسڵمان بە هۆی بێئاگاییەوە لە هەمبەر واتای دروست و ڕاستەقینەی چەمکەکان بە دیدی قورئان و فەرموودە دەکەوێتە هەڵەی زەقەوە. بێئاگایی بەرانبەر بە خودی ئیسلام و لە بەرانبەریشدا بێئاگایی بەرانبەر بەرنامە و ئایدیۆلۆژیا باوەکانی سەردەم. جۆرێک لە بێئاگایی و تێنەگەیشتنی بۆ تاکی موسڵمان دروست کردووە، بە شێوەیەک زۆر جار لە تێگەیشتنە ڕاستەقینەکانی قورئان دووری دەخاتەوە. هەوڵ دەدەین بە کورتی تیشک بخەینە سەر دیارترین ئەو بەڵگەنانەی کە دەکرێت حەقیقەتی عالەمانییەت وەک ئایین بناسێنین.

یەکەم: بەڵگەی زمانەوانی

وشەی (دین) چاوگ و مەسدەری (دان) یەکێکە لەو وشانەی کە هاوبەشە لەنێوان زۆرێک لە زمانە کۆنەکانی «سامییە»دا، لە زمانی عیبریدا دەڵێت (دین) لای ئارامییەکان دەگوترێت «دان» لای سوورییەکانەوە دەگوترێت (دان) لای ئاشوورییەکانیش دەگوترێت «دن»[1] لای حەبەشییەکانیش دەگوترێت هەموو ئەمانە مەبەستی پێی (التوجیه الملزم من المتبوع الی التابع لیخضع له بکل استسلام) واتە تەوجیهێکی مولزەمە لە سەرکردە و پێشەنگەوە بۆ شوێنکەوتووان، تا ملکەچی ئەو فەرمانە بن و بە تەواوی خۆیان ڕادەست بکەن، لە سەرچاوە و فەرهەنگە زمانەوانییەکاندا تەواوی واتاکانی ئایین لە سێ بابەتی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە.

١- (دانە دینا) واتە حوکمی کرد و خستییە ژێر دەستی خۆی.

٢- (دان لە) بە واتا بە قسەی کرد و ملکەچی بوو.

٣-یان (دان بالشیء) بە مانای کردی بە ڕێگە و ڕێچکە و مەزهەبی خۆی

---

(١)معجم مفردات المشترک السامي في اللغة العربیة، حازم کمال الدین، ص ١٧٧- من العلمانیة طاعون العصر.

و باوەڕی پێ هێنا و لە سەری ڕۆیشت. ئەم سێ مانایە هەر سێکیان بە کۆدەنگیی تەواوی شارەزایانی بوارەکە لە قوتابخانەی عالەمانییەتدا هەیە و هیچ کەسیش ناتوانێت نکۆڵی لێ بکات، بەو پێیەی عالەمانییەت حوکمی خەڵک دەکات و دەیەوێت تەواوی خەڵکی لە ژێر سایە و سێبەری خۆیدا کۆ بکاتەوە و تەواوی عالەمانییەکانیش پەیوەستن بەو دەستوورەوە و ئامادەن بە تەواوی ملکەچی بن. زیاد لەمە بە تەواوی باوەڕیان پێیەتی و بە دڵ پشتگیریی دەکەن و لە واقیعیشدا بانگەشەی.بۆ دەکەن و بە تەواوی کەرەستەکانی بەردەستیان بانگەشەی بۆ دەکەن و هەوڵی چەسپاند و بەرجەستەکردنی دەدەن، بە جۆرێک کەم هەبێت لەلایەنگرانی ئایینەکانی تر هێندە بە پەرۆشەوە بەرگری لە بیروباوەڕ و فەلسەفە و دونیابینیی خۆیان بکەن.

تەواوی بەڵگە زمانەوانی و فەرهەنگییەکان ئەو ڕاستییەمان بۆ دووپات دەکەنەوە کە عالەمانییەت ئایینێکە وەک تەواوی ئایینەکانی تر، تا ملکەچی ئەو فەرمانە بن و بە تەواوی خۆیان ڕادەست بکەن. لە سەرچاوە و فەرهەنگە زمانەوانییەکاندا تەواوی واتاکانی ئایین لە سێ بابەتی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە.

**دووەم:** قورئانی پیرۆز وەک سەرچاوەیەکی گرنگی ڕاڤە و پێناسەکردنی تەواوی دیاردە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان، پێداگری لە سەر ئەو ڕاستییە دەکات کە هەر پەیڕەو و پرۆگرامێک کە مرۆڤەکان بیکەنە پەیڕەوی خۆیان دەکرێت بە ئایین ناو ببرێت، بێ جیاوازی لەوەی ئەو ئایینە ئاسمانییە تێک دراوە، یاخود فەلسەفەیەکی هزریی خاوەن دونیابینیی تایبەتە بۆ تەواوی کایەکانی ژیان و کۆمەڵگە. قورئانی پیرۆز لە سورەتی یووسفدا کاتێک باس لە ڕووداوەکانی ژیانی پەیامبەر یووسف دەکات دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ [یوسف: ٧٦] واتە: «ئا بەو شێوە و نەخشە و پلانمان بۆ یووسف ئەنجام دام تا براکەی لای خۆی بیهێڵێتەوە.»

خۆ لە ئایینی پادشای میسردا نەدەبوو کە برای خۆی گل بداتەوە، بەڵام لە ئایینی یەعقووبدا هەبوو بۆیە کردی.

گەر بە ڕوونی لەم ئایەتە بڕوانین، دەبینین قورئانی پیرۆز بە ڕوونی یاسا و ڕێسا و حوکمی مەلیک بە ئایین ناو دەبات، ناوبردنی پەیڕەو و پرۆگرامی پادشا لەلایەن قورئانەوە بە ئایین ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە لە سەر ئەوەی کە هەر فۆڕمێک لە بەرنامەسازی بۆ ژیانی تاک و کۆمەڵگە دەکرێت بە ئایین ناو ببرێت و بناسێنرێت. وەک تیشک خستنە سەر ئەم بابەتە ئیمامی «قاسمی» لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: "ویستدل به علی جواز تسمیة قوانین ملک الکفر دینا لها"[١]

واتە: ئەم گێڕانەوەیەی قورئان دەکرێتە بەڵگە و پاڵپشت بۆ دروستیی ناونانی یاسا و پەیڕەو و پرۆگرامی میللەتان و نەتەوەکان بە ئایین.

قورئانی پیرۆز لە جێگەیەکی تردا تەواوی یاسا و پرۆگرامەکان بە ئایین ناو دەبات و بەڕوونی لە سوورەتی ئالی عیمراندا تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ [آل عمران: ٨٥] هەر کەس بێت جگە لە بەرنامە و شەریعەی ئیسلامی، ئایین و بەرنامەیەکی تر هەڵببژێرێت، هەرگیز لێی وەرناگیرێت لە دۆزەخیشدا لە ڕیزی زیانمەنداندایە.

بە ڕوونی لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت کە خوای گەورە ئیسلام و غەیری ئیسلامیشی بە ئایین ناو بردووە. خەڵکیشی ئاگادار کردووەتەوە لەوەی کە ئایینی ڕاستەقینە تەنیا یەک ئایینە و پێویستە تەنیا لە سەر ئەو ئایینە بڕۆن دەنا وەرناگیرێت و تەواوی ئایینەکانی تر شوێنکەوتوانی خەسارۆمەندن و سەرلێشێواون.

---

(١) محاسن التنزیل محمد جمال الدین القاسمي تفسیر سورة یوسف.

قورئانی پیرۆز لە جێگەیەکی تردا بەڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ۝٩﴾ [الصف:٩] واتە: «هەر ئەو خودایە خۆیەتی کە پێغەمبەرانی ناردوە بە ڕێنیشاندەری ئایین و ڕێبازی حەق و ڕاستی، تاوەکوو ئەوەی بە سەر گشت ئایینەکانی تردا زاڵ ببێت، ئەگەر چی هاوبەش پەیداکەران پێیان خۆش نەبێت و حەز نەکەن.» وەک دەردەکەوێت دەبنین دیسان خوای گەورە ئاماژە بە دابەشبوونی حەق و باتڵ دەکات و هەر دووکیانی بە ئایین ناو بردوە و ئامانجی سەرەکیی هاتنی پەیامبەرانیش لەوەدایە کە ئایینی ڕاستەقینە سەر بکەوێت بە سەر تەواوی ئایینەکانی تردا و بەرنامە و پرۆگرامی ئایینی ڕاستەقینە سەر بکەوێت بە سەر بەرنامە و پرۆگرامی تەواوی ئایین و بەرنامەکانی تردا. قورئانی پیرۆز تەواوی بەرنامە و پرۆگرامەکانی بەرانبەری ئیسلامی بە ئایین ناو بردووە.

سێیەم: تەواوی فـەرهەنگ و ئینسایکلۆپیدیا سـیاسی و کۆمەڵایەتییە باوەڕپێکراوەکانی دونیای خۆرئاواییەکان، بەتایبەتی تیشک دەخەنە سەر ئەوەی کە عالەمانییەت ئایینە. لەم چوارچێوەیەدا فەرهەنگی (مریام وابستر) ی کلاسیکی لە پێناسەی ئاییندا دەڵێت: "هۆکارێکە یاخود بنەمایەکە، یاخود بەرنامەیەکی دەستپێوەگیراوە کە بە جۆشوخرۆش و ئیمانەوە دەستی پێوە بگیرێت."[1]

بەدڵنیاییی واقیع ئەوەمان پێ دەڵێت کە عالەمانییەت هەم مەبدەئە و هەم هۆکار و ڕێکخستن و بەرنامەدانان و ئاڕاستەکردنە. لە هەمان کاتدا بیروباوەڕ و عەقیدەیشە. زۆرێکی زۆر لەلایەنگرانی بە جۆشوخرۆشە و بانگەشەی بۆ دەکەن و بەرگریی لێ دەکەن و دەستی پێوە دەگرن. لە ئینسایکلۆپیدیای

---

(١)العلمانية د. سامي العامري ص ٢١٣.

ئەدیاندا کاتێک تەعریفی ئایین دەکات دەڵێت: "ئایین ڕێکخستنی ژیانە لە ڕووی بیرۆکەیەکی دووری قووڵی بە ئەزموون کە ئەمەیش جیاوازە لە ڕووی شێوە و تەواوبوون و ڕوونیدا بە پێی ئەو ڕۆشنبیرییەی کە دەوری داوە."[١] بێگومان عالەمانییەت بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ئەم پێناسەیەی بە سەردا جێبەجێ دەبێت. ئەمە تەنیا وەک ڕێگوزەری خێرا بەنێو فەرهەنگە خۆرئاواییەکاندا. زۆرێک لە فەرهەنگ و ئینسایکلۆپیدیا عەرەبییەکانەوە دەگەڕێنەوە سەر خاڵی دووەم کە پەیوەستە بە بەڵگەی شەرعی و هەمان بۆچوون و تێڕوانینی قورئانی لەم بارەیەوە دەخەنە ڕوو.

چوارەم: زۆرێکی زۆر لە تیۆریست و بانگەشەکارانی عالەمانییەت خودی خۆیان ئەم بابەتانەیان پشتڕاست کردووەتەوە. لەم چوارچێوەیەدا «ڕوبرت ج ئینجر سول» دەڵێت: "عالەمانییەت ئایینی مرۆڤایەتییە و ئایینێکی تەواو لۆژیکییە. بە پێچەوانەی ئایینەکانی ترەوە، هیچ نهێنییەکی تێدا نییە و سرووت و پیاوی ئایینیی تێدا نییە دوورە لە هەموو خورافە و بابەتێکی پڕوپووچەوە."[٢] بەم ئاڕاستەیە لە سەروبەندی تێڕوانینەکانی بەرانبەر عالەمانییەت فەیلەسووفی فەڕەنسی «ئارنست ڕینان» دەڵێت: "بڕوای تەواوم هەیە و پێم وایە کە عالەمانییەت ئایینی داهاتوو و گونجاوترین ئایین دەبێت بۆ هەموو خەڵک."[٣]

پێنجەم: بەشێکی بەرچاو لە نەیارانی عالەمانییەت کۆدەنگن لە سەر ئەوەی کە عالەمانییەت ئایینە وەک تەواوی ئایین و پەیڕەو و پرۆگرامەکانی تر.

موسڵمانانی بە دونیابینیی ئیسلامی و زانستی خۆیان تیشکیان خستوەتە سەر تەواوی بابەتەکان و کۆدەنگن لەبارەی ناساندنی عالەمانییەت وەک

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٠

(٢) هەمان سەرچاوەی ڕابروو، لا ٢٣٤.

(٣)هەمان سەرچاوەی پێشوو. لا ٢٣٤.

ئایین، بەڵام ئەوە هەموو موسڵمانان نین عالەمانییەت بە ئایینێکی هاوتەریب لەگەڵ ئایینەکانی تر دەناسێنن، بەڵکوو ژمارەیەکی بەرچاو لە خودی لێکۆڵەران و بیریارانی مەسیحی بە هەمان شێوە ئەم بابەتە پشتڕاست دەکەنەوە. یەکێک لە پێشەوا ئینجیلییەکان بە ناوی «تیموسی و لهای» قەشەیەکی ئەمریکییە لەبارەی عالەمانیەوە دەڵێت: "ئایینێکە وەستاوە لە سەر زاتی خۆی. تەواوی مەرج و پێناسە و بنەماکانی ئایینی بە سەردا جێبەجێ دەبێت"[1] بە پێی تێڕوانینە یاساییەکانیش، عالەمانییەت وەک ئایین مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و لێی دەڕوانرێت. ساڵی ١٩٦١ دادگای باڵای ئەمەریکا دانی نا بە عالەمانییەتدا وەک ئایینێک لە ئایینەکان.

تەواوی ئەم بەڵگە جۆراوجۆرانە ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو کە عالەمانییەت ئایینێکی سەربەخۆیەوە وەک تەواوی ئایینەکانی تر. ئەمە وەک دەلاقەیەک بۆ ناساندن و بنکۆڵکردنی دوای ناساندنی وەک ئایین، پێویستە ڕوونتر ئاگادار بین لەوەی کە بزانین عالەمانییەت بیر و ڕای چییە و بە چ شێوازێک کار دەکات و دەجوولێت و ئامانج و دونیابینیی عالەمانییەکان چییە و چۆنە. پاشان باس لە کێشمەکێشمی نێوان ئیسلامی و عالەمانی دەکەین لەنێوان هەر دوو لادا.

---

(١)هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٦.

# کێشەی نێوان ئایینی عالەمانییەت و ئیسلام لە دید و بۆچوونی هەردوو لاوە

عالەمانییەت وەک ئایینێکی زەق بەرانبەر ئیسلام ئامانجی سەرەکیی لایەنگرانی لە قاڵبدان و سنووردارکردنی ئیسلامە. دەکرێت ئەو پرسیارەیش بێتە ڕووم بۆچی ئیسلام بە تایبەتی بەم شێوە زەقە بووەتە ئامانجی عالەمانییەت و عالەمانییەکانە؟

عالەمانییەکان دەیانەوێت ئیسلام لە سوچێکدا گۆشەگیر بکەن، هەر چۆنیان ویست بەو شێوەیە هەڵی بسووڕێنن لە تەواوی ناوەندە سیاسی و یاساییە هەستیارەکانی دەوڵەت و حوکوومەت دووری بخەنەوە. چالاکییەکانی بە شێوەیەکی سنووردار لەنێو وەزارەتێکی لاوەکیی وەک ئەوقاف بچووک بکەنەوە. تەواوی یاساکانی پەیوەست بە ژیانەوە تەنیا لە چوارچێوەی تەڵاق و نیکاحدا کورت بکرێنەوە. دواتریش سوپاسگوزاری عالەمانییەت بێت کە ئەو ماف و ئازادییەی پێ داوە کە ڕێگە بە بوونی دەدەن، ئەم سێ مافە تەنیا لە سێ کاتی دیاریکراودا دەدرێتە موسڵمانان:

١- یان ئەوەتا وڵاتەکە وڵاتی موسڵمانان بێت دەنا لە وڵاتانی خۆرئاوا شتێک نییە بە ناوی دەستوور و یاسایی ئیسلامی.

٢- دەبێت ئەو خەڵکانەی لەم سێ جێگەیە کاردەکەن یان عالەمانی بن یاخود موسڵمانێکی عاقڵ و بێزیان بێت.

٣- کاتێک ئەم سێ مافەی موسڵمانان لە وڵاتانی خۆیاندا دەبینی کە عالەمانییەتەکە عالەمانییەتێکی ماددیی دیموکراتیخواز بێت. ئەمە لە

کاتێکدا بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئیسلامی ئەو سێ مافە بچووکەیشیان نییە.
ئەوەی عالەمانییەتی نوێ کاری لە سەر دەکات نەهێشتنی ئەو سێ مافە و کۆتاییپێهێنانیانە بە شێوەیەکی یەکجاری و کۆتایی و ڕیشەکێشکردنی تەواوی سرووت و ڕووکەشە ئایینییەکان لە نموونەی بانگدان و باڵاپۆشی و بابەتەکانی تر.

عالەمانییەت دوژمنێکی گشتگیری تەواوی بنەما ئیسلامییەکانە بە تەواوی کایە جیاوازەکانی بیروباوەڕ و پەرستش و عیبادەت و ڕەوشت و شەریعەت و یاساکانەوە.

لێرەوە بە شێوازی ڕیزبەندی ئەم ڕاستییە دەخەینە ڕوو:

## عالەمانییەت و عەقیدە

«دورکایم» یەکێک لە تیۆریستە گەورەکانی بواری کۆمەڵناسی کاتێک باس لەو کۆمەڵگانە دەکات کە عالەمانییەت تێیاندا زاڵە و عالەمانییەت بە ڕێوەیان دەبات و ئاراستەیان دەکات و کۆمەڵێک کەسایەتیی خاوەن دەسەڵات دەستووری تێدا دەنووسنەوە، دەڵێت: "جیاوازیی نێوان ئەو کەسانەی دەستوور دەنووسنەوە لەگەڵ خەڵکانی ئاسایی وەک جیاوازیی نێوان خودا و مرۆڤەکان وایە بەو پێیەی خودا هێزێکە لە سەروو مرۆڤەکانەوە حوکم دەکات، دەسەڵاتی گرتووە بە سەر تەواوی کاروباری خەڵکییەوە و خەڵکیش شوێنی کەوتوون، بە هەمان شێوە لە کۆمەڵگەی عالەمانیشدا هەمان حوکمکردن و دەسەڵاتداری هەیە لەنێوان خەڵکی و یاسادانەراندا."

پاشان دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەی تەواوی ئایینەکان پێیان وایە کە تەنیا خودا موشەریع و یاسادانەرە، بەڵام مێژوو شاهیدە ئەو خودایەی کە خەڵکی دەیپەرستێت ئەو خودایە نییە کە لە ئاسماندایە، بەڵکوو خودایەکی ترە کە لە

ناو خەڵکیدایە و دەسەڵاتی تەشریع و ئاڕاستەکردنی تەواوی بە دەستە.»[1]

«دورکایم» سەرکەوتوو بووە لە گوزارشتکردن لە دۆخی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی دروست و واقیعی. گوزارشتێک دروست دەکات لە چەمکی خودا و خوداپەرستی. ئەم تێڕوانینە تەنیا تێڕوانینی «دورکایم» نییە، بەڵکوو تێڕوانینی زۆرێک لە فەیلەسووفانی خۆرئاواییە بۆ مانای خودا و ئایین. تاکی موسڵمان پێویستە ئەو ڕاستییە بزانێت کە پێناسە و تێڕوانینی ئێمە بۆ خودا تەواو جیاوازە لە تێڕوانین و پێناسەی عالەمانییەکان، ڕوونتر بڵێین ئەو خودایەی کە ئێمە دەیناسین و دەیپەرستین تەواو جیاوازە لەو خودایەی کە عالەمانییەکان دەیناسن و بیری لێ دەکەنەوە. بۆیە عالەمانییەت هیچ کات لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت، بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی خۆرئاوایی و ئەورووپی بەو پێیەی مەسیحییەکان و جوولەکەکان تەنانەت پێش دروستبوون و سەرهەڵدانی عالەمانییەت بە واتا ڕاستەقینەکەی خوایان نەپەرستووە، بەڵکوو وەک قورئانی پیرۆز بەڕوونی تیشک دەخاتە سەری دەفەرموونێت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ [التوبة: ٣١] واتە: «گەورە و پێشەوا ئایینییەکانی خۆیان لە بریی خودا دەپەرست.» بەو پێیەی ئەوان گەورە و پیاوانی ئایینیی خۆیان کردووەتە سەرچاوەی تەواوی یاسادانان و فەرمانکردن و ڕێگری و حەڵاڵ و حەرامێک، هەر بۆیە خودای گەورە سیفەتی پەرستنی داوەتە پاڵیان، وەک پەیامبەری خۆشەویستی( ﷺ) بەڕوونی تیشکی خستووەتە سەری.

هەر لەبەر ئەم هۆکارە، خوای گەورە فەرمان دەکات بە پەیامبەری خۆشەویست( ﷺ) بەوەی ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ﴾[المائدة: ٦٨] واتە: «بڵێ ئەی خاوەن

---

(١)العلمانية د. سامی العامري، ص ٢٠٣.

پەرتووک و نامەکان، ئێوە لە سەر هیچ بەرنامە و ئایینێکی ڕاست نین، هەتاوەکوو گوێڕایەڵی و حوکم دەکەن بە تەورات و ئینجیل کە فەرمانی پێ کردوون، شوێن موحەممەد -دروودی خوای لێ بێت- بکەون بەوەی کە خودا دایبەزاندوە لە قورئان.» زانایانی ئیسلام لەبارەی وشەی (تقیموا)دا دەفەرموون: (تعملوا بما فیها) واتە: هەتاوەکوو ئەو کاتەی کار بە ڕاستودروستیی ئەو پەیامە نەکەن کە خودا دای بەزاندوە، ئەوە ئێوە هیچ نین لەو شتانەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن و خۆتانی پێ دەپەرێننەوە.[1]

کەواتە جیاوازی و ناکۆکیی موسڵمانان لەگەڵ جوولەکە و مەسیحییەکان تەنیا لە بابەتی پێغەمبەرایەتیی «موحەممەد»دا (دروودی خوای لەسەر بێت) نییە، بەڵکوو جیاوازی سەرەکی و جەوهەری نێوان ئەهلی ئیسلام و مەسیحی و جوولەکەکان جیاوازییە لە پەرستنی خودا بەو پێیەی ئەوان لە پاڵ بانگەشەی پەرستنی خوای گەورەدا، خودای تریش دەپەرستن. بۆیە دەبینین خوای پەروەردگار جارێکی تر فەرمان دەکات بە پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) و پێی دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ ۚ﴾ [آل عمران: ٦٤] واتە: «بڵێ ئەی خاوەن، پەرتووکەکان وەرن با هەردوو لامان لە سەر وشە و بەرنامەیەک سوور بین کە بۆ هەردوو لامان یەکسانە لە پەرتووکی هەردوو لایشماندا هاتووە، ئەویش ئەوەیە جگە لە خودا هیچ خودایەکی تر نەپەرستین و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەین و با هەندێکمان هەندێکی ترمان لەبریی خودا نەپەرستین.»

بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم ئەگەر ئێمەی موسڵمانان ناکۆک و جیاواز بین لە پەرستنی خودا لەگەڵ جوولەکە و مەسیحییەکان کە ئەهلی پەرتووکن و

---

(١) تفسير الطبري سورەتی المائدة ٦٨.

پەیامبەریان بۆ هاتووە و بانگەشەی شوێنکەوتنی دەکەن لە بەرانبەردا، دە هێندە جیاوازین لە پەرستنی خودا لەگەڵ ئایینی عالەمانییەکان. خودای ئێمە (الله) یە لە سەرووی عەرشەوە خوای ئەوانیش لە فەرهەنگی ئێمەدا بە تاغووت ناو دەبرێت و ناوی دەبەین. چەمکی تاغووتیش وەک زانایانی ئیسلام پێناسەیان کردووە بریتییە لە: "هەر شتێک کە خەڵکی لە سنووری خۆی لای بدات لە پەرستن و شوێنکەوتن و گوێڕایەڵیکردن." زانایانی ئیسلام ڕوونتر تیشکیان خستوەتەسەر ئەم بابەتە و باس لەوە دەکەن کە تاغووتی هەموو گەلێک ئەو کەسەیە کە حوکم دەبەنە لای لەبریی خودا و پەیامبەرەکەی، یان دەیپەرستن لە جێگەی خودا و شوێنی دەکەون و گوێڕایەڵی دەکەن.)[1]

بێگومان عالەمانییەت حوکمکردن ناباتە لای خودا بە هیچ جۆرێک کە ئەوەیش بە کۆدەنگیی زانایان دەبێتە تاغووتی ئەوان، بەڵکوو بە دەقی ئاشکرای قورئان دەبێتە تاغووت بۆیان. خوای گەورە لە جێگەیەکی تری قورئاندا بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرموونێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾﴾ [النساء: ٦٠] واتە: ئەرێ ئەوانەت نەدیوە وا دەڵێن ئیمانمان بەو بەرنامە قورئانییە هەیە کە دابەزیوە بۆ تۆ و بەو پەیامەی پێش تۆش باوەڕیان هێناوە بە قسەی خۆیانە کەچی دەیانەوێت بۆ بڕینەوە کێشە و داواکانیان بۆ حوکم و حوکمڕانی بچنە لای تاغووت، بەرنامەی تاغووتان و ملهوڕان لە کاتێکدا فەرمانیان پێ کرابوو کە باوەڕ بەو بەرنامە و یاسایانە نەکەن و کاریان پێ نەکەن، بەڵام شەیتان دەیەوێت گومڕا و سەرلێشێواویان بکات بە گومڕاکردنێکی تەواو و بێسنوور.» بۆیە دەبینین باوەڕی بە خودا هەیە کەچی کار بە یاسای تر دەکات.

---

(١) بڕوانە: پێناسەی ئیبن قەیم لە پەرتووکی اعلام الموقعین بیروت دار الجلیل ١٩٧٣ بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٥٢

دەقی ئاشکرای قورئان کە ئەگەری هیچ لێکدانەوە و دوودڵییەکی نەهێشتوەتەوە، پێداگری دەکات لە سەر ئەوەی کە عالەمانییەکان موشریکن وەک ئەوەی قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾ [الشورى:٢١] واتە: «ئەرێ ئەوان بەڕاست خواپەرستن، یان چەند هاوبەشێکیان بۆ خودا داناوە، لە کاتێکدا چەند یاسا و بەرنامەیەکیان بۆ داناوە، لەلایەن ئەوانەی یاسایان بۆ نووسیونەتەوە، کراوە بە ئایین بۆیان، بەبێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک خوای گەورە مۆڵەتی دابن، خۆ ئەگەر بەڵێنی خودا نەبووایە کە دەبێت لە دواڕۆژدا سزا بدرێن، ئەوە هەر زوو لە دونیا بڕیار درابوو لەنێوان ئەمان و باوەڕداره ڕاستەکانی تر.»

## عالەمانییەت و عیبادەت

عالەمانییەکان پرۆگرام و دونیابینیی خۆیان سەبارەت بە تەواوی کایەکانی ژیان بەو شێوەیە دەخەنە ڕوو کە گوایە خاڵییە لە تەواوی سرووت و جۆرەکانی پەرستش و کڕنووشبردن و بەپیرۆزڕاگرتنی هەر بابەتێک. واتە دەیانەوێت ئەوەمان پێ بڵێن کە لە نێو چوارچێوەی عالەمانییەتدا شتێک نییە ناوی پیرۆزیی ئایینی بێت، بەڵام لە بەرانبەردا تەواوی ئایین و ئایینزاکان دەبێت ئازاد بن لە بەرجەستەکردنی تەواوی سرووتە ئایینییەکانی خۆیان ئەم دونیابینییەی ئەوان سەبارەت بە ئازادیی ئایینی تەواوی ئایین و ئایینزاکان ڕاستییەکی پەیڕەو کراوە بۆ تەواوی ئایین و ئایینزاکانی دونیا. جگە لە ئیسلام ئەمەیش لە بەر دوو هۆکاری دیار:

أ-تیۆریست و داڕێژەرانی هزری عالەمانی لە چەندین جێگەدا بەڕوونی هەڵوێستی خۆیان لەبارەی هەوڵەکانیان بۆ سنووردارکردنی ئیسلام و لەناوبردنی

بە تایبەتی لە ناو خودی خۆرھەلاتی ئیسلامی و پێداگرییان کردووە، لە سەر ئەوەی ھەر چۆن بێت پێویستە ئیسلام لەناو ببرێت، یاخود لانی کەم لە قالب بدرێت و ھەژموون و تواناکانی سنووردار بکرێت. تاوەکوو ئەوەی نەبێتە مەترسی لە سەر پلان و پرۆژەکانی ئەوان و بە ڕوونی تیشکیان خستووەتە سەر ئەوەی کە پێویستە ئەو ھۆکار و کەرەستانەی کە لە ڕێیانەوە موسلمانان گەشە دەکەن و ژمارەیان زۆر دەبێت دەستنیشان بکرێن و دواتر کار لە سەر بەرەنگاربوونەوەیان بکرێت، بە تایبەتی تر ئەو بابەتەی کە بە بنەمای گرنگ و گوزارشتن لە ڕەمزیەت و پیرۆزیی موسلمانان لە نموونەی بابەتەکانی حیجاب و بانگدان بە ئاشکرا و ھێشتنەوەی ڕیش و قوربانیکردن و حیجاب و فرەژنی و ڕۆژووگرتن و حەجکردن و چەندین جۆر پەرستشی تر بەشێکی بەرچاو لە ولاتانی خۆرئاوای نییە، مەگەر جۆرێک لەم پەرستشانەی تێدا قەدەغە کراوە.

ب-ڕێگەنەدانی عالەمانییەت و ڕێگریکردنی لەم جۆرە پەرستشانە پەیوەندیی بەو تێگەیشتنەوە ھەیە کە عالەمانییەکان دروست تێگەیشتوون کە تەواوی ئەم جۆرە پەرستشانە سنوورێکی فراوانتریان لە پەرستش ھەیە کە پەیوەندییان بە حوکمڕانی و سیاسەتی ولاتەوە ھەیە. بۆ نموونە زەکاتدان بە تەنیا بریتی نییە لە گواستنەوەی پارە لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی تر، لە دەستێکی دەولەمەندەوە بۆ دەستێکی ھەژار، بەلکوو زیاتر لەمە گوزارشتە لە سیستمێکی ئابووری و دارایی و کۆمەلایەتی کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە دامەزراوەی دارایی موسلمانانەوە ھەیە. ئەوەی لە جیھانی فیقھیدا بە «بەیتولمال» ناو دەبرێت و لە جیھانی نوێیشدا بە وەزارەتی دارایی ناو دەبرێت.

بابەتی کۆبوونەوەی موسلمانان لە مزگەوت تەنیا کۆبوونەوەیەک نییە تایبەت بە نوێژ کردن بێت وەک بنەمایەکی سەرەکیی ئیسلام، بەلکوو مزگەوت دامەزراوەیەکی گرنگی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و ڕامیاریی نێوان موسلمانە و ناوەندێکی گرنگی پەروەردەکردنی تاکی موسلمانە لە سەر ئاستی

هۆشیاری و سیاسی و پەروەردەیی. بە شێوەیەک دەتوانرێت وەکوو سەنتەرێکی گرنگی ئاراستەکردنی هەمەچەشنی موسڵمانان بەکاربهێنرێت. ئەو جۆرە لە پەرستش و سرووتە ئایینیانەی ڕێگەی پێ دەدەن تەنیا بە شێوەیەکی سنووردا و کرچوکاڵ ڕێگەی پێ دەدەن، بە شێوەیەک ئێستا ژمارەیەکی کەمی موسڵمانان لە ڕۆحی عیبادەت و پەرستشەکانیان تێ گەیشتبن. ئەمەیش خودی جەوهەری ئایینی عالەمانییە. لە چوارچێوەی پێشنیارەکانی دامەزراوەی «ڕاند» تیشک دەخەنە سەر ئەوەی کە پێویستە گومان بخەینە دڵی موسڵمانانەوە، بە شێوەیەک ئەو باوەڕە لای موسڵمانان دروست بکەین کە ئایا حوکمکردن و جێبەجێکردنی بنەماکانی شەریعەت لە بنەڕەتەوە واجبە؟

## عالەمانییەت و ڕەوشت

تاکە سەرچاوەی سەرەکی و بنەڕەتیی ئەخلاق لە دونیابینی عالەمانییەتدا بریتییە لە عەقڵ. بە شێوەیەک هەر بابەتێک عەقڵ بە دروستی بزانێت، ئەوا بە دڵنیایی باشە، هەر چییش عەقڵ بە خراپی زانی ئەوا بەدڵنیایی خراپ و قێزەونە. بەمجۆرە جگە لە عەقڵ تەواوی تێڕوانینە ئایینییەکان سەبارەت بە باشیوخراپیی بابەتەکان ڕەت دەکەنەوە. لە کاتێکدایە عالەمانییەت وەک خۆیان ئاماژەی پێ دەکەن لە ئاکار و ڕەوشتەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو لە ئامانج و مەبەستەوە دەست پێ دەکات. عالەمانییەکان پێیان وا نییە ئەو شوێنەوارە خراپانەی ڕەوشت دروستیان کردووە کێشەیەک بێت و پێویستی بە چارەسەرکردن هەبێت، بەڵکوو پێیان وایە تەواوی ئەو کێشانە دەگەڕێنەوە بۆ عەقڵییەت و بیرکردنەوەی مرۆڤەکان. لایان وایە شوێنەوارەکان عەقڵ و بیرکردنەوە دروستی کردوون نەوەک ئەخلاق و هەڵسوکەوت. لێرەوە ئیسلام تا ئەوپەڕی سنوور پێچەوانەی ئایینی عالەمانییەتە، بەو پێیەی ئیسلام پێی وایە

لەگەڵ ئەوەی عەقڵ دیارییەکی پەروەردگارە بۆ مرۆڤەکان، بەڵام توانایی عەقڵی مرۆڤەکان تەواو سنووردارە. وەک هەر هەستێکی تری ئاسایی مرۆڤەکان عەقڵ ناتوانایە لەوەی دەرک بە تەواوی بابەتەکان بکات، بۆیە هەر بابەتێک ببێتە مایەی مەترسی لە سەر عەقڵ و توانایی عەقڵ ئیسلام قەدەغەی کردووە وەک مەی و مادە هۆشبەرەکان و ئەفسانە و خورافات.

بە پێچەوانەی عالەمانییەکانەوە ئیسلام پێی وایە تەواوی کێشەکانی کۆمەڵگە پەیوەستن بە ئەخلاقەوە، گەر ڕەوشتی تاکەکانی کۆمەڵگە جوان بن، کۆمەڵگەیش جوان دەبێت و دروست دەبێت، بە پێچەوانەوە کۆمەڵگە بەرەو خراپە و ئاڵۆزی دەچێت. لەمەوە هەر ئەخلاق و خوو و ڕەوشتێک زیان بە تاک و گشتی کۆمەڵگە بگەیەنێت، قەدەغەی کردووە. بۆ نموونە دەرکەوتنی جەستەی ئافرەتان و خۆڕووتکردنەوەیان لای پیاوان کاریگەریی نەرێنی لە سەر تاک و کۆمەڵگە دروست دەکات و لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەبێتە مایەی مەترسی لە سەر ژیانی هاوسەریی خێزانەکان و سەر دەکێشێت بۆ لێکجیابوونەوە و هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکان، وەک ئەوەی ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا ڕوودەدات لە زۆربوونی ڕێژەی جیابوونەوەی نێوان خێزانەکان، بەوەی بەشێک لە پیاوان لە دەرەوەی سنووری خێزان پەیوەندیی ناتەندروست دەبەستن لەگەڵ ئافرەتانی تر یان هاوسەرەکەیان بە جێ دەهێڵێت و شوێن ئافرەتێکی تر دەکەون ئەمانە و دەیان کێشەی تری خێزانی کە یەکێک لە هۆکارەکانی خۆڕووتکردنەوەی ئافرەتانە، بەو شێوەیە و لەوێشەوە بۆ سەرکێشان بۆ داتەپینی تەواوی بەها کۆمەڵایەتی و خێزانییەکان بێدەنگیی دەسەڵاتە عالەمانییەکان لە دروستبوونی مەترسیی ڕاستەقینە لە سەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی.

جێگەی پرسیارە دروستتر بڵێین عالەمانییەت دوور و نزیک ئەم بابەتانەی بە لاوە گرنگ نییە و بە هەندیان وەرناگرێت و پێیان وایە بەشێکە لە ئازادیی مرۆڤەکان تەنیا شتانێک قەدەغەن کە ببنە مەترسیی ڕاستەقینە بۆ سەر

دەسەڵات و بوونی خۆیان. دەپرسین چەمکێک هەیە بە ناوی حەرام و قەدەغە لای عالەمانییەکان؟ دەکرێت نووسەری گەورەی ڕووسی «دوستوڤیسکی» وەڵامی ئەم بابەتە بداتەوە، کاتێک دەڵێت: "ئەگەر خودا مردبێت، دەبێت هەموو شت حەڵاڵ بێت."

## عالەمانییەت و شەریعەت

عالەمانییەکان وەک یەکێک لە بنەما گرنگەکانی بیرکردنەوە و دونیابینییان پێیان وایە پێویستە تەواوی ئایینەکان لە سەنتەری دەسەڵات دوور بخرێنەوە، بەتایبەتیتر ئیسلام، بەو پێیەی ئیسلام زۆرترین بنەمای حوکم و سیاسەت و بەڕێوەبردن و ئابووری لەخۆ گرتووە. لە سەردەمی ئیمپریالیستدا توانییان کار لەسەر ئەم بابەتە بکەن بە چەندین ڕێگەی جیاواز هەوڵی چەسپاندنی ئەو بیرکردنەوەیان دەدا لای موسڵمانان کە کرانەوە و پێشکەوتنیان مەحاڵە بێتە دی، مەگەر بە دوورخستنەوەی ئایین نەبێت لە ناوەندی دەسەڵات و حوکمکردن بە تەواوی تواناکانیان هەوڵیان دەدا، ئەو هەستە لای موسڵماندا بچەسپێنن ئەوەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامی و شەرعیدا پێی دەوترێت جێبەجێکردنی شەریعەت، ڕابردوو تێپەڕی جیهانی نوێی و پێداویستییەکانی مرۆڤی سەردەمی نوێ پێویستی بە جێگرەوەی شەریعەتە.

ئەم پلانە هەنگاوێکی باشی نا بەتایبەتی دوای کودەتای کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی بە سەرکردایەتیی «موستەفا کەمال ئەتاتورک» بە سەر دەوڵەتی عوسمانی و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەوڵەتە و ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیای نوێ، دواتریش بونیاتی دەوڵەتی عالەمانی سەری کێشا بۆ زۆرێک لە ناوچەکانی پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی.

هەوڵەکانی «ئەتاتورک» بە داینەمۆی بزاوتی عالەمانییەت هەژمار دەکرێت

کە بووە ئیلهامبەخشی سەرکردەکانی ناوچەکە. «ئەتاتورک» بە چاوقاییمی دەستی برد بۆ چەندین بابەتی هەستیاری پەیوەست بە شەریعەت و بیروباوەڕی موسڵمانانەوە، بە تایبەتی بابەتەکانی پەیوەست بە یاسای باری کەسێتی. لە نموونەی مەرجی باوەڕ بۆ هاوسەران و بابەتی فرەژنی و تەڵاقدان و هاوتاکردنی کچ و کوڕ لە میراتدا، دواتریش زۆرێکی تر لە وڵاتانی پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی پێ بە پێی «ئەتاتورک» کەوتنە جێبەجێکردن و بەرجەستەکردنی ئەم جۆرە بابەتانە و دوورخستنەوەی ئایین لە تەواوی کایەکانی ژیانی کۆمەڵگە. بە زمانێکی سادەتر دەیانەوێت پێمان بڵێن خودا هەیە، بەڵام بۆی نییە دەست بخاتە کاروباری مرۆڤەکانەوە. ئەوە مرۆڤەکان لە دەرەوەی خودا و هەژموونی ئایین کاروبارەکانی خۆیان ڕێک دەخەن.

ئەگەر بە زمانیش ئەم بابەتە نەڵێن، ئەوا بە دڵنیاییی بە زمانی حاڵ دەیڵێن. ئەمە بنەمایەکی گشتییە و تەواوی عالەمانییەکانی جیهان باوەڕیان پێیەتی و کاری لە سەر دەکەن، بەڵام زۆر جار لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا جۆرێک لە یاریکردن و ناڕوونی دروست دەکەن، تاوەکوو ئەوەی نەبێتە مایەی ڕق و جووڵاندنی هەستی ئایینیی موسڵمانان بۆ خۆبەدوورگرتن لە بەریەککەوتنیان لەگەڵ موسڵمانان و پێناسەی عالەمانییەت دەگۆڕن بۆ پێناسەیەکی نەرم و فراوان بۆ ئەوەی هەر چۆن بێت نزیک بێت لە واقیعی ژیانی خەڵکییەوە. تەواوی هەوڵەکانیان دەخەنە گەڕ، تاوەکوو ئەوەی جۆرێک لە بیرکردنەوە لای موسڵمانان دروست بکەن کە عالەمانییەت گوزارشتە لە پرۆگرامێکی سەردەمییانە لەپێناو ڕێکخستنی و باشترکردنی ژیانی مرۆڤەکان. وەک ئەوەی «عەبدولمەجید ئەلشرەفی» یەکێک لە عالەمانییە توندڕەوەکانی تونس لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئیسلام لە ڕووکەشدا ڕێگەی داوە بە عالەمانییەت و هزری عالەمانی خودی ئیسلامیش هەڵگری ئەو هزرەیە."[1] هەر لەم بارەیەوە

---

(١)المنهج وتطبيقه عبد المجيد الشرفي - تونس دار الجنوب للنشر الطبعة الثانية ٢٠١١،

بیرمەندی گەورەی عالەمانی «حەسەن حەنەفی» دەڵێت: «ئیسلام لە ڕواڵەتدا ئایینێکی عالەمانییە.»[1]

بەو پێیەی ئەوان وەک خۆیان دەڵێن ئیسلام بریتییە لە حەڵاڵکردن و حەرامکردن لە ناو دڵ و بیرکردنەوەی هەر کەس کە هاتبێتە نێو ئیسلامەوە. ئەو کەسەی کە دوور و نزیک پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نییە، هیچ پابەندبوونێکی ئایینی ڕووی تێ ناکات بەو پێیەی ئیسلام گوتار و خیتابە لەگەڵ تاک نەوەک کۆمەڵگە. بە مانایەکی ڕوونتر دەیانەوێت پێمان بڵێن بە گشتی ئایینەکان لە نێویشیاندا خودی ئیسلام گوزارشتن لە پەیوەندییەکی ئاسایی نێوان خودا و بەندەکانی.

بە ڕێگوزەرێکی خێرا بە ناو قورئاندا، نادروستیی ئەم بانگەشەیەمان بۆ دەردەکەوێت. بەو پێیەی سەدان ئایەتی قورئان کە ڕاستەوخۆ خیتاب ئاڕاستەی تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگە دەکات، گەر بێتوو بیانخەینە ڕوو پێویستی بە سەدان لاپەڕەیە. ڕوونتر بڵێین لە قورئاندا تاکە ئایەتێک بوونی نییە کە ڕووی لە تەواوی کۆمەڵگە نەبێت. لەم چوارچێوەیەدا، چەندین ئایەتی قورئانی بە ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ﴾ و ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەستی پێ کردووە، نەوەک بە گوتار بەرانبەر تاک. هاوکات قورئان کاتێک خیتاب لەگەڵ موسڵمانان دەکات هەمیشە لەو بابەتانەیە کە لە دوای تەوحید و بیروباوەڕەوە دێن، خیتابی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بۆ باوەڕدارانە بە واتا ڕاستەقینەکەی. ئەم جۆرە لە گوتار بۆ ئەو کەسانە نییە کە ئیسلامیان وەک عەقیدە و بیروباوەڕ هەڵنەگرتووە، ئەوانەی تر لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام لە نموونەی خەڵکانی بێباوەڕ و عالەمانی پابەند ناکرێن بە ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان لە نموونەی نوێژ و ڕۆژوو،

ص ٦٣ وەرگیرا و لە پەرتووکی العلمانية د. سامي العامري، ص ٢٧٦.

(١)حوار المشرق و المغرب - حسن حنفي و محمد عابد الجابري، ص ٣٨. وەرگیراوە. العلمانیە، ص ٢٧٨.

نەک بە واتای ئەوەی ئیسلام بۆ ئەو نەهاتووە و پەیوەندیی بەوەوە نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی کەسی بێباوەڕ سەرەتا پێویستە لە سەریان باوەڕ بە بنەماکانی ئیسلام بهێنن، قۆناغی دواتر پابەند دەکرێن بە ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییە کردارییەکان. بە پێچەوانەوە وەک حەرامکردنی تەڵاق وایە لە سەر کەسێک کە هاوسەری نییە، یاخود پێویستکردنی زەکات لە سەر کەسێک کە هەژار بێت. کەواتە ئەم جۆرە لە گوتارە کەسانی بێئایین ناگرێتەوە.

کاری سەرەکیی ڕۆشنبیرانی موسڵمان بریتییە لە تێکشکانی بانگەشەی عالەمانییەکان لە بابەتی پەیوەندیی ئایین تەنیا بە مرۆڤەکانەوە، ئەگەر ئەم بۆچوونەی عالەمانییەکان سەبارەت بە هەندێک ئایین و ئایینزای ڕۆحی دوور لە بنەماکانی یاسا و شەریعەت تا ڕادەیەک گونجاو بێت بەڵام بۆ ئایینێکی لێوانلێو لە بەڕێوەبردن و سیستمی ئابووریی و سیاسی و سەربازیی و فێرکاریی جیاوازی وەک ئیسلام، بە دڵنیایی تێڕوانینێکی تەواو هەڵەیە.

## عالەمانییەت لە دید و دونیابینیی عالەمانییەکانەوە

ئەوەی گرنگە هەموو لایەک بیزانین و ئاگامان لێی بێت ئەوەیە کە عالەمانییەت لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ تەواوی بنەما و تێڕوانینە ئایینییەکان جیاوازە، بە هەمان شێوە لە نێو خۆیشیدا چەندین قوتابخانەی جیاوازە و هەر قوتابخانەیەک دید و تێڕوانینی بۆ کایەکانی تری ژیان تەواو جیاوازە. بە جۆرێک عالەمانییەکانی خۆرهەڵات پرۆگرام و دونیابینییان جیاوازە لەوانی خۆرئاوا، ئەوانەی ئەمەریکای باکوور جیاوازن لەوانی ئەمەریکای باشوور. بە شێوەیەک هیچ دەستوورێکی عالەمانی لەگەڵ دەستوورێکی تر یەک ناگرێتەوە، بەڵکوو لە هەر قۆناغ و سەردەمێکدا لە ڕێی کۆمەڵێک یاسا و ڕێنماییەوە دەیانەوێت وڵات بەڕێوە ببەن و مرۆڤەکان ئاڕاستە بکەن.

مرۆڤەکانیان دووچاری جۆرێک لە ئاڵۆزی بیرکردنەوە کردووە بە جۆرێک ژمارەیەک لە مرۆڤەکان گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە سیستمی پادشایەتیی پێ گونجاوتر بێت لە سیستمی دیموکراتی، ئەزموونی خۆرهەڵات و خۆرئاوایی عالەمانییەکان تا ئەو ڕادەیە جیاوازە.

بە گەڕانەوە بۆ ناکۆکی و ئاڵۆزییەکانی نێوان خودی عالەمانییەکان، دەبینین دونیایەک لە ناکۆکی لەنێوانیاندا بوونی هەیە. لەم بارەیەوە ئاماژە بە چەند خاڵێک دەکەین.

١- ئایینی عالەمانی وەک بنەڕەت لەلایەن مەسیحییە لادەرەکانەوە بونیادنراوە و برەوی پێ دراوە، ئەم پەرتەوازەیییە درێژەپێدەری ئەو پەرتەوازەیی و پشێوییەی پێشووتری باپیرانیانە لە ئاراستە جیاوازە ئایینییەکانیان. وەک قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾﴾ [الحشر: ١٤] واتە: «دژایەتی نێو خۆیان دژایەتییەکی تەواو سەختە تۆ وا دەزانیت کە هەموو پێکەوەن و کۆن، بەڵام لە ڕاستیدا دڵەکانیان تەواو جیایە و یەک ناگرن، بە هۆی ئەوەی گەلێکی ناحاڵی و تێنەگەیشتوون.»

٢- ئەوەی نایەوێت تێ بگات لە حاڵی عالەمانییەت لە دیدی ئیسلامەوە، پێویستە لە پێناسە و دونیابینیی خودی عالەمانییەکانەوە لێیان تێ بگات. پێویستییەکی گرنگی هزری موسڵمانانە کە ئاگایان لە هزر و بیرکردنەوەی عالەمانییەکان بێت. دەربارەی ئەم بابەتە «عەلی حەرب» یەکێک لە ڕۆشنبیرانی عالەمانی لە پەرتووکی (الممنوع و الممتنع) دا دەڵێت: "ڕۆشنبیرە عالەمانییەکانی خۆمان هەمیشە ئەو یارییە دەکەن کە خۆرئاوا دەیسەپێنێت... ئەوان بە جۆرێک لە جۆرەکان دروستکراوی خۆرئاوان."[1] ئەمە دانپێدانانی یەکێکە لە ڕۆشنبیرە

---

(١)بڕوانە: الممنوع والممتنع علي الحرب وەرگیراو لە پەرتووکی العلمانيون العرب و موقفهم من الإسلام، مصطفى باجو، المكتبة الإسلامية ٢٠١٢ مصر، ص ٣٣٥.

دیارەکانی عالەمانی لە خۆرهەڵات و دوای بەدواداچوونێکی ورد گەییشتووەتە ئەو ڕاستییەی کە عالەمانییەکانی خۆرهەڵات دروستکراوی خۆرئاواییەکانن بە تایبەتی تیۆریست و بانگەشەکاران، بەڵام عالەمانییە ڕەشۆکەکان شەرەفی ئەوەیان پێ نەبڕاوە ببنە پیاوی خۆرئاوا، بەڵکوو دوای چەندین دەست و فلتەر عالەمانییەتیان پێ گەییشتووە. پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "گەر لە مێژووی هزری عالەمانی بڕوانین، دەبینین پڕۆژەیەکی شکستخواردووی نەزۆکە. هەمیشە بەشێک بووە لەو کێشانەی کە ویستوویەتی چارەسەری بکات. عالەمانییەکانی جیهان هەر یەکیان خاوەنی ئاڕاستەیەکی جیاوازن، هەر یەکیان پڕۆژەیەکی سەربەخۆ و جیاوازییان هەیە، هەر کامیان خۆی بە جێگرەوە و بەدیلی ئەوی تریان دەزانرێت. لە ڕاستیشدا لە کۆتاییدا هیچ کامیان دوور و نزیک پەیوەندییان بە واقیعەوە نییە، جگە لە کۆمەڵێک خەیاڵپڵاوی زیاتر شتێکی تر نییە، تاوەکوو ئەوەی دەڵێت عالەمانییەت بە هیچ جۆرێک پەیوەندیی بە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤەکانەوە نییە، زیاد لەمە لە دوای تاقیکردنەوە لە ژیانی خەڵکی شوێنەوارێکی نەرێنی و تێکدەری لە ژیانی مرۆڤەکان دروست کردووە.)[1]

وەک تیشکخستنەسەری زیاتری ئەم بابەتە «عەبدوڵڵا ئەلعەرەوی» لە پەرتووکی (الایدولوجیات العربیة المعاصرة) دا تیشک دەخاتە سەر کەسانی پشتی بانگەشەکارانی عالەمانییەوە و لەم بارەیەوە دەڵێت: "لە پشت هەموو پەیامبەر و بانگەشەکارێکەوە لە بانگەشەکارانی سەردەم، جویرەئیلێک لە پشتییەوە هەیە کە بەرنامەڕێژیی بۆ دەکات و بە تەواوی ئاڕاستەی دەکات لە پشتی «موحەممەد عەبدەوە» «لوثر وراء» هەیە لە پشت «لوتفی سەید«ەوە «مۆنتسکیۆ» هەیە لە پشت «سەلامە مووسا»وە «سبسنر» هەیە!" بەو مانایەی هیچ کەس لە بانگەشەکارانی هزری عالەمانییەت و بە ناو

---

(١)بڕوانە: أوهام النخبة، علي حرب، ص ٤٢.

نوێگەری و ڕیفۆرمخوازی خۆرهەڵاتی ئیسلامی نابینین، مەگەر بیرمەند و ئاراستەکارێکی خۆرئاوایی لە پشتەوەیە بێت. پاشان تیشک دەخاتە سەر ئەوەی نووسەران و ڕۆشنبیرانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی جگە لە دووبارەکردنەوەی ئەزموونی خۆرئاوایی کارێکی تریان نەکردووە و لەم بارەیەوە دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ نووسەرێکی ناوخۆیی عالەمانی نییە ڕاڤەی واقیع بکات بەبێ هزری دەرەکی یاخود هۆزەکی."[1] هەر وەک پشتکڕاستکردنەوەی ئەم بابەتە «تورکی عەلی الربیعو» دەڵێت: "شیکار و ڕاڤەی ڕۆشنبیرە عالەمانییە ناوخۆییەکان هەمیشە بۆ لابردن و ڕیشەکێشکردنی بەرانبەرە، بە ڕاستی تا ئێستا نەمان توانیوە خۆمان لەو جۆرە بیرکردنەوەیە قوتار بکەین.» پاشان درێژە دەدات بەم بابەتە و دەڵێت: "بزووتنەوە ئایدیۆلۆژییە عالەمانییە نوێیەکان هەمیشە و هەموو کات کار لە سەر ڕیشەکێشکردن و سڕینەوەی ئەوانی تر دەکەن لە هاوبەشیی کاری سیاسی بە بەهانەی ئەوەی ئەوانی تر خەڵکانی دواکەوتوون و هەڵگری هزر و بیرکردنەوەی کۆنن."[2]

پرسیارە ڕاستەقینەکە ئەوەیە پلان و ستراتیژی عالەمانییەکان چۆن و بەرەو کوێیە؟ ئایا عالەمانییەکان ئامانجەکانی خۆیان نەپێکاوە لە دوورخستنەوەی ئیسلام لە حوکم و بەڕێوەبردن و تەواوی کایەکانی نێو کۆمەڵگە و هەڵوەشاندنەوەی تەواوی یاسای ئیسلامییەکانی پەیوەست بە باری کەسێتی؟ دژایەتیکردنی زۆرێک لە سیما ئایینییەکان و ڕێگریکردن لە کۆبوونەوەی موسڵمانان لە نێو مزگەوت بۆ چالاکیی فێرکاری و تێگەیشتن لە ئایینەکەیان بە جۆرێک موسڵمانی ئەم سەردەمە منەتبارە بەوەی کە ڕێگری نوێژ و ڕۆژووی لێ

---

(١) بڕوانە: پەرتووکی الایدولوجیات العربیة المعاصرة: عبد الله العروي، ص ٦٥ وەرگیراو لە پەرتووکی العلمانیون العرب، ص ٣٤١.

(٢)بڕوانە: پەرتووکەکەی خۆی بە ناوی الحرکات الإسلامیة في منظور الخطاب العربي المعاصر، ب : المرکز الثقافي العربي ص ١١٣-١١٩- ١٣٦ .

ناکرێت. ئەمە جگە لە ناساندنی ئیسلام وەک مەترسییەکی ڕاستەقینە بۆ سەر ئاسایيشی کۆمەڵگەکان. بە دیوێکی تردا کتومت عالەمانییەکان ئەوەیان دەوێت کە تاکی موسڵمان بەرجەستەی پەرستشەکانی نێوان خۆی و خودا بکات، بەو مەرجەی دوور و نزیک پەیوەندیی نەبێت بە بابەتە زیندوەکانی ژیانی خەڵک بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە حوکم و بەڕێوەبردن. وەک ئەوەی بوزی و مەسیحی و ئێزیدییەکان تەنیا چالاکییەکانیان لە نێو پەرستگاکانیان بێ ئاگا لەوەی ئیسلام ئایینێکە لێوانلێوە لە ئەحکامی و بەڕێوەبردن و حوکمداری. دواتر بە پێدانی ئەو ئازادییە سنووردارەی کە دەکرێت موسڵمان لە ڕێیەوە پەرستشەکانی وەک نوێژ و ڕۆژ و ئەنجام بدات، ئەو بیرکردنەوەیە لە عەقڵیەتی موسڵماندا دروست دەکەن کە ئەگەر بێتوو ئاینداریی خۆت بکەیت ئەوا کەس حەقی بە سەرتەوە نییە.

لە ڕاستییدا ئەم جۆرە لە ئاینداریيە هیچ کات مایەی نیگەرانی و ڕێگریی ملهوڕان نییە، تەنانەت ئەگەر خودی پەیامبەر «مووسا» بە تەنیا ئەم جۆرە ئاینداریيەی ئەنجام بدایە بە دڵنیایی نەدەبووە مایەی نیگەرانی و ڕێگریی «فیرعەون».

«فیرعەون» لە خودی خواپەرستیی «مووسا» نیگەران نەبوو، بەڵکوو لە چالاکییەکانی «مووسا» لە ئاڕاستەکردنی خەڵکی هەڵدان بۆ ڕزگارکردنی هۆزی ئیسرائیل و لاوازکردنی پێگەی «فیرعەون» لەنێو جەماوەردا نیگەران بوو. ئەوەی دەگوترێت ئیسلام پەیوەندییەکی نێوان خودا و بەندەکانە هەمان ئەو پێناسە و ڕاڤەکردنەیە کە عالەمانییەکان دەیانەوێت، بە پێچەوانەوە لە پاڵ پەیوەندیی نێوان خودا و بەندەکان ئیسلام ئایینێکی گشتیگرە لە تەواوی کایەکانی پەیوەست بە ژیان و ژیاری مرۆڤەکان، ئابووریی، سیاسیی دەوڵەتدار، حوکمڕانی، کۆمەڵایەتی و بازرگانی قسە و دونیابینیی خۆی هەیە. عالەمانییەکان تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتوو بوون لە دەرکردنی ئەم

تێڕوانینە گشتیگرە بەرانبەر بە ئیسلام لە دڵی موسڵمانان، بەڵام ئەم بابەتە وەک حەقیقەتێکی قورئانی دەمێنێتەوە و هیچ کات ناتوانن لە پەڕەکانی قورئاندا دەری بهێنن و بیسڕنەوە.

لەبارەی کێشەی عالەمانییەکان لە بیرکردنەوە و لە دەستدانی ڕاستگۆییان لە سەر ئاستی کۆمەڵگە «خەلیل عەبدولکەریم» یەکێک لە نووسەرانی مارکسیی عالەمانی دەڵێت: "کێشەی سەرەکیی کەسە پێشکەوتووەکان (عالەمانییەکان) ئەوەیە کە تەنیا لە ڕووکەشدا پێش کەوتوون، بەڵام لە ئاکار و عەقڵ و بیرکردنەوەدا تەواو دواکەوتوو و کۆنەپەرستن، کەواتە کێشە لە خۆیاندایە کە ڕاستگۆییان لە دەست داوە".[١]

پرسیاری ڕاستەقینە سەبارەت بە ڕاستگۆییی عالەمانییەکان لەوێوە دەردەکەوێت چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە بتوانن کەموکورتیی عالەمانییەکان دەربخەین لە کاتێکدا تەواوی جومگە سەرەکییەکانی بەڕێوەبردنی وڵاتانی ئیسلامی یاسادانان و دەسەڵات و ڕاگەیاندن بە دەستی خودی عالەمانییەکان خۆیانەوەیە. ئەمە تەنیا وەک ڕێگوزەرێک بە نێو ڕەخنەی جیدی و ڕاستەقینەی خودی عالەمانییەکان لە عالەمانییەت.

زیاد لەمە کەسایەتییە گەورە و تیۆریستە دیارەکانی عالەمانییەت ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنەی جیدی هاتوون لەلایەن هاوبیرەکانیانەوە. بەوەی کە خەڵکانی لوتبەرز و خۆبەزلزان بە چاوێکی کەمەوە تەماشای کۆمەڵگە و ئەندامانی کۆمەڵگە دەکەن، لەم چوارچێوەیەدا بیرمەندی گەورەی عالەمانی «فوئاد زەکەریا» لەلایەن هاوبیرەکانییەوە دووچاری چەندین ڕەخنەی توند هاتووە بەوەی (لە فەیلەسووفەوە گۆڕرا بۆ پۆلیسی فیکر و چەندین دەربڕینی بێمانا و بێشعوور و بێبەرپرسانە دەردەبڕێت کە زۆر سادە و پووچن، لەوانە بە

---

(١)بڕوانە: الجذور التاريخيية للشريعة الإسلامية. خليل عبد الكريم، هينا للنشر، ص ٧ -٨.

چاوێکی کەمەوە سەیری موسڵمانان دەکات و پێی وایە خەڵکانی بێعەقڵ و نەفامن، لەبەرئەوەی بەرگێک دەپۆشن کە عادەتیان پێوە گرتوە.)[١] لە ڕاستیدا ئەمە بە تەنیا بیرکردنەوە و تێڕوانینی «فوئاد زەکەریا» نییە بەرانبەر بە موسڵمانان، بەڵکوو ئەمە بیرکردنەوە و تێڕوانینی زۆرێک لە بیرمەند و نووسەرانی عالەمانییە سەبارەت بە موسڵمانان.

ئەوەی جێگەی هەڵوێستە و نیگەرانیی، دەبینن عالەمانییەکان خەڵکانی موسڵمان بە هۆی هێشتنەوەی ڕیشەوە بەکرێگیراو و جاشی عەرەب ناو دەبەن لە کاتێکدا کە خودی خۆیان دوور و نزیک پەیوەندییان بە کەلتوور و ڕۆشنبیریی کوردییەوە نییە تەواوی بیرکردنەوە و تێڕوانینیان خۆرئاواییە، بەڵام ڕازی نین پێیان بگوترێت بەکرێگیراوی خۆرئاوایی. زیاد لە «فوئاد زەکەریا» چەندین کەسایەتی و بیرمەندی گەورەی تری عالەمانی لەلایەن هاوبیرەکانیانەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند بوونەتەوە، «نەسر حامید ئەبووزەید» یەکێک لە بیرمەندان و بانگەشەکارانی عالەمانییەت بە توندی ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێت کە تەواوی خەڵکی بە پێوەری هەندێک کەس دەپێوێت، تەواوی خەڵکی قیاس دەکاتە سەر هەندێک کەس و هیچ کەسی قەبووڵ نییە، جگە لە خۆی و خاوەنی دیکتاتۆریەتێکی هزرییە و بووەتە زیندانی هزری مارکسی و ئەرسەدۆکسییە، ئەمە جگە لەوەی خاوەنی زمانێکی زبر و درێژ بووە بەرانبەر بە نەیارانی بە تایبەتی لە پەرتووکی (التكفير في زمن التفكير)دا لێوانلێوە لە جنێو و قسەی زبر و ناشیرین و نووسینەکانی لێوانلێون لە گوتاری زبر و بێڕێزیکردن بەرانبەر بە موسڵمانان، بە جۆرێک بووە مارکسییەکی عەقڵبەستوو، زۆر جار لە سەر بێئاگایی و بێزانست بۆچوونەکانی دەردەبڕی.[٢]

---

(١)بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٧ -٨.

(٢) بڕوانە: رؤية معاصرة لعلوم القران يان استبدال هوية النص. بۆ سەرچاوەی قسەکان لە سەری بڕوانە: العلمانيون العرب ص ٣٦٠.

«سادق جەلال ئەلئەعزەم» یەکێکی ترە لەو بیرمەندە عالەمانییەی کە لەلایەن هاوبیرەکانییەوە دووچاری ڕەخنەی توند هاتووە و بە کەسێکی دژ بە یەک و گاڵتەجاڕ بە دەوروبەری ناوبراوە، تەنانەت یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆی بە ناوی «عەلی حەرب» بە کەسێکی خەیاڵپڵاو و دژی واقیع و مێژوو ناو دەبات. لەگەڵ ئەوەی مارکسییەکی توندڕەو بووە، هاوکات هاوبیرەکانی بە کەسێکی ئایدیۆلۆژیی عەقڵبەستوو و بێویژدان ناوی دەبەن.[1] دواتریش ژمارەیەکی بەرچاو لەو بیرمەدانی عالەمانیی دووچاری ڕەخنەی هاوبیرەکانیان هاتوون لە نموونەی «حەسەن حەنەف»، «تەیب تیزنی موحەممەد عبدالجابری»، «عەبدوڵلا عەرەوی»، «موحەممەد ئارگۆن» و «تەها حوسەین» و چەندین بیرمەندی گەورەی تر کە لەلایەن هاوبیرەکانیانەوە پێیان دەڵێن دەمارگیر و توندڕەو و بێویژدان و بێخزمەت و هەڵگری هزری سادە و بێ ئەرزش، ئەمە جگە لە چەندین هێرشی توند و تێکشکێنەر بۆ یەکتری. دەکرێت ئەوە وەڵامی ئەو پرسیارەمان پێ بداتەوە کە بۆچی عالەمانییەت لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا شکستی هێنا و بووە نەفرەت بۆ تەواوی دانیشتوانی خۆرهەڵات و خەڵکانی شکستخوارد و دەروونەخۆش سەرکردایەتیی بزاوتی عالەمانییەتی خۆرهەڵات دەکەن، بۆیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆرهەڵاتی ئیسلامی دووچاری داخزان و دواکەوتووی دێت ڕێک وەک ئەوەی شاعیر دەڵێت:

كبهيمة عمياء قاد زمامها أعمى على عوج الطريق الأعوجِ

لەگەڵ ئەوەی عالەمانییەت ئایینێکی لێوانلێوە لە شکست و بێپلانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەشێک لە لێکۆڵەرانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا هەر چۆن بێت هەر بە باشتری دەزانن لە ئایینەکانی تر، ئەویش بە بەهانەی بوونی دوو خاڵی ڕووکەش لە عالەمانییەتدا:

---

(١) بڕوانە: نقد النص علي حرب، ص ١٣١ - ١٣٢.

**١- تێکەڵکردنی ئیسلام و جیانەکردنەوەی لە دەسەڵاتە ئایینییەکانی خۆرئاوا:**

یەکێک لەو هۆکارانەی کە دۆخێکی ئاڵۆزی لای ژمارەیەک لە لێکۆڵەران دروست کردووە، بابەتی هەوڵی جیاکردنەوەی ئایینە لە دەوڵەت لەلایەن عالەمانییەکانەوە. ژمارەیەکی بەرچاو لە لێکۆڵەران کەوتوونەتە هەڵەوە و پێیان وایە بابەتی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت یەکێکە لە گرنگترین دەستکەوتەکانی عالەمانییەت، بەو پێیەی ئایین هەڵگری پیرۆزیی خۆیەتی و گوزارشتە لە پەیوەندییەکی دۆستانەی نێوان خودا و بەندەکانی. جیهان و ژیانی مرۆڤەکان هەمیشە و هەموو کات لە پێشکەوتن و گۆڕانکاریدان، ئایین ناتوانێت داخوازی و پێویستیی ژیانی مرۆڤەکان پڕ بکاتەوە، یاخود نابێت کاروبار و حوکم و بەڕێوەبردن تێکەڵی ئایین و پیرۆزییەکانی ئایین بکرێت لەبەر ئەوە پێویستە ئایین و دەسەڵات لە یەکتر جودا بکرێنەوە. هەڵبەت ئەم هەوڵەی خۆرئاواییەکان لە کاتێکدا بوو بۆ ماوەی چەندین سەدە جیهانی خۆرئاوایی و ئەورووپا بە تایبەتی لەلایەن پیاوانی ئایینی و کڵێساکانەوە بە ڕێوە دەبران. دەسەڵاتی ئایینی پاپایی چەندین کارەسات و نەهامەتی بە سەر خۆرئاواییەکاندا هێنابوو، بە جۆرێک تەواوی جومگەکانی دەسەڵاتیان مۆنۆپۆل کردبوو. ئابووریی و سیاسەت و فێرکردنیان خستبووە بەرژەوەندیی کڵێساوە بە و توندی دژی هەر هەوڵێکی زانستی و سیاسی و فەرهەنگی دەوەستانەوە کە بێتە هۆکاری لاوازبوونی پێگە و شکۆی کڵێسا. هەر بەم هۆکارە چەندین زانا و داهێنەری خۆرئاوایی بە دڕندانەترین شێوە لە ناو بران و هێندێکی تریان ناچار بە پاشەکشێ و خۆڕادەستکردنی کڵێسا کران.

تیۆریستە عالەمانییەکان و ڕابەرانی شۆڕشی فەرەنسی گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ئایینی مەسیحییەت و کڵێسا ئەستەنگی گەورەن لە بەردەم بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان، بۆیە پێویستە بە هەر نرخێک بێت هەژموون دەسەڵاتیان بە تەواوی سنووردار بکرێت و هەژموونیان بە تەواوی لە

ناوەند گرنگەکانی سیاسەت و بەڕێوەبردن دوور بخرێتەوە.

ئەوەی بیرمەندانی عالەمانی و ڕابەرانی شۆڕشی فەرەنسی لەبارەی گۆڕین سنووداركردنی هەژموونی كڵێساوە بیریان لێ دەكردەوە، هەنگاوێكی دروست بوو و تەواو لە شوێنی خۆیدا بوو. ڕوونتر بڵێین هەوڵێكی لەم شێوەدایە بۆ سنووردارکردنی دەسەڵاتی کڵێسا و هێنانەپێشەوەی جێگرەوەی سیاسی و حوكمڕانی بۆ ئەورووپا بڕیارێكی دروست و لە جێگەی خۆیدا بوو، بەڵام كێشەكە لەوێوە دروست دەبێت كاتێك هەوڵ بدرێت ئیسلام وەك ئایینێكی لێوانلێو لە سیاسەت و بەڕێوەبردن و ئابووری و بازرگانی و جەنگ و ئاشتی و یاسا و باری كەسێتی و ... هتد بەراورد بكرێن لەگەڵ ئایینێكی تێكدراوی هەڵوەشاوی بێ بنەمای وەك مەسیحییەت و دامەزراوەیەكی گەندەڵ و ئاڵۆزی وەك دامەزراوەی كڵێسای ڤاتیكانی. لە ڕاستیدا بەراوردێكی تەواو ناتەندروست و نالۆژیكییە. ئاخر ئیسلام لە بچووكترین بابەتەوە لە چوونە دەستشۆرەوە و پەیوەندیی هاوسەرگیری قسەوباسی خۆی هەیە تا دەگاتە كایە گرنگەكانی بەڕێوەبردن و حوكمداری و سیاسەت و دەوڵەت و جەنگ و ئاشتی و ئابووری و پەیوەندییە كۆمەڵایەتی و سیاسی و بازرگانی و ئابوورییەكان بەراورد بكرێت لەگەڵ ئایینێكی دەستكاریكراوی فشەڵی بێ دەست و زمانی وەك مەسیحییەت كە تێیدا دەگوترێت (دع مالقیصر لقیصر وما لله لله) بەراورد بكرێت لەگەڵ قورئانێك كە دەفەرموێت ﴿ان الحكم الا لله﴾ حوكم و بەڕێوەبردن تەنیا و تەنیا بۆ خودایە؟ گەر عالەمانییەت سەركەوتوو بێت لە بەرەوپێشبردنی خۆرئاوا و دەركردنی لە چنگی كڵێسا ئەوا بە دڵنیایی عالەمانییەت بۆ وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی پێچەوانەكەیەتی و بگرە بووەتە مایەی مەترسییەكی گەورە و ڕاستەقینە بۆ سەر تەواوی كۆمەڵگە و لێكترازان و پارچەپارچەكردنی تەواوی كۆمەڵگە و هەڵوەشاندنەوەی هەستی ئایینی لای تەواوی تاكەكانی كۆمەڵگە.

قۆناغی دواتر بەشێک لە عالەمانییەکانی عەرەب هاتنەوە هۆش خۆیان و دانیان بە هەڵە و شکستی هزریی خۆیاندا نا. لەم چوارچێوەیەدا «خالید موحەمەد خالید» یەکێک لە عالەمانییە دیارەکانی عەرەب و خاوەنی هەر دوو پەرتووکی (من هنا نبدأ) و (الدين في خدمة الشعب) دوای سی ساڵ لە خزمەتکردن و بانگەشەکردن بۆ عالەمانییەت وازی لە عالەمانییەت هێنا و پەشیمان بووەوە لە بیروبۆچوونەکانی ڕابردووی و پەرتووکێکی بە ناوی (الإسلام والدولة) نووسی و تێیدا سەرەکیترین هۆکارەکانی هەڵخەڵتاندن و بەهەڵەداچوونی خۆی لە پشتگیریی عالەمانییەت خستە ڕوو. ناوبراو بە وریاییەوە تیشک دەخاتە سەر جەوهەری هەڵەی خۆی لە پشتگیریکردنی عالەمانییەت بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە پێشتر جیاوازیی نێوان حوکمی ئیسلام و دەوڵەتی ئایینی کڵێسایی لە ئەورووپا نەکردووە، بۆیە عالەمانییەتی وەک بەدیلی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە ناسی.

٢- تێکەڵکردنی دەستووری خەلافەتی ئیسلامی و جیانەکردنەوەی لە دەستوور و بەرنامەی ئایینەکانی تر:

خاڵی جەوهەریی جیاوازیی نێوان ئیسلام و تەواوی ئایین و ڕێبازو و پرۆگرامەکانی تر لە بەڕێوەبردن خستنەڕووی بنەماکانی حوکمکردن و بەڕێوەبردندا خۆی دەبینێتەوە. ئایینەکانی تر خاڵی بوون لە دەستوور و یاسادانان و ئەم ئەرکە سپێررابوو بە حاکم و کاربەدەستان، پاپا یاخود فیرعەون، دانان و هەڵبژاردنیشیان بە هەمان شێوە لای حاکم و کاربەدەستان بووە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئایینی عالەمانی بە پێچەوانەی تەواوی ئایینەکانی ترەوەیە. بەو پێیەی لە سیستمی عالەمانییەتدا سەرچاوەی دەستوور و یاسادانان خەڵکە و هاوکات هەڵبژاردنی حاکم و کاربەدەستانیش بە دەستی خەڵکە، بەڵام ئیسلام تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ هەر دوو ئاڕاستە ئایینییەکەی تر لە ئیسلامدا دەستوور و یاسادانان لای خودایە نەوەک حاکم و کاربەدەستان و هەڵبژاردن و

دانانی حاکم لای خەڵکییەوە بە شوورا دەبێت.

ئیسلام لەوەدا جیا دەبێتەوە لە فیرعەون و پاپا و کاهینەکان کە خودی خۆیان یاسا دەنووسنەوە و خۆیشیان لە سەر حوکمکردن لەوەدا جیاوازن لەگەڵ ئایینی عالەمانییەت کە دەستوور و یاسادانان کاری خودایە نەوەک خەڵکی، بەڵام لەوەدا یەک دەگرنەوە کە هەر دوولا کاری دانان و هەڵبژاردنی حاکم دەدەنە دەستی خەڵکی. ئەمە وەک میکانیزمەکانی دانان و نووسینەوەی یاسا و دەستنیشانکردنی حاکم و دەسەڵاتدار، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە چۆنیەتیی بەرجەستەکردن و جێبەجێکردنی یاسا و دەستوورەوە ئیسلام تەواو جیاوازە لە ئاراستە ئایینەکانی تر و ئایینی عالەمانییەت و هەر دوولاش لەگەڵ ئیسلام جیاوازن.

لە ڕابردوودا لە ئایینەکانی فیرعەونییەت و پاپایی و کەهەنوتییەدا حاکم و دەسەڵاتدار و پێشەوای وڵات، هەڵگری هەر ئایین و بیروباوەڕێک بوونایە تەواوی خەڵکی بەناچاری پێویست بوو ئەو ئایینە قەبووڵ بکەن و بە تەواوی پەیڕەویی لێ بکەن. قەبووڵکردن و پشتگیریکردنی هەر ئایینێکی تر بە تاوان هەژمار دەکرا، پەیڕەوکاری ئایینەکانی تر جیاواز لە ئایینی حاکم و دەسەڵاتداران بە تاوانبار دەناسران و ڕووبەڕووی سزای مەرگ دەبوونەوە. بە پێچەوانەی ئەم جۆرە لە مامەڵە و بیرکردنەوە و لە ئیسلامدا بوونی نییە، بەو پێیەی لە ئیسلامدا شتێک نییە بە ناوی زۆرلێکردن و هیچ کەس ناچاری قەبووڵکردنی ئایین ناکرێت و بە زۆر ناکرێتە موسڵمان. هەر وەک چۆن قورئان بە شێوەیەکی ڕوون تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرمووێت ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ زۆرکردن و زۆرەملێی لە ئاییندا بوونی نییە. قورئانی پیرۆز لە جێگەیەکی تردا بە شێوەیەکی ڕوون تیشک دەخاتە سەر ئازادیی هەڵبژاردانی مرۆڤەکان لە هەڵبژاردنی ئایینی ڕاستەقینە.

لە ڕاستیدا ئەو ئازادییەی کە ئیسلام فەراهەم دەکات لە هیچ ئایینێکی تردا بوونی نییە، بە خودی قوتابخانەی عالەمانییشەوە. عالەمانییەت تەواوی دەستوور و یاسا و دونیابینیی خۆی بە زەبری هێز بە سەر تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگەدا بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازییە ئایینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانیان دەسەپێنێت. بە پێچەوانەی ئەم سەپاندنەوە، ئیسلام یاسا و پرۆگرام و دونیابینیی خۆی تەنیا بە سەر شوێنکەوتوان و لایەنگرانیدا فەرز دەکات، کاتێک پەیوەندیی بە کاروباری دەوڵەتەوە نەبێت. بۆ نموونە لە سەروبەندی دەسەڵاتداریی ئیسلام و بوونی دەوڵەتی ئیسلامی بابەتەکانی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و خێر و جیهاد و ... هتد فەرز ناکات بە سەر خەڵکانی غەیرە موسڵماندا، بە پێچەوانەی عالەمانییەکانەوە کە یاساکانی سوودی بانکی و ڕێگریکردن لە فرەژنی و لە ناو ژینگەی موسڵماندا بە زۆر دەسەپێنن بە سەر موسڵماناندا.

# تێڕوانینی عالەمانییەت سەبارەت بە حوکمڕانی و سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە ئیسلامدا

بە پێچەوانەی حەقیقەتی ڕاستەقینەی ئیسلامەوە، عالەمانییەکان پێیان وایە شتێک نییە لە ئیسلامدا ناوی سیستم و دەستوور و بەڕێوەبردن بێت، تاوەکوو ئەوەی خەڵکی لە ڕێیەوە کاروباری حوکمداریی دەوڵەت و وڵات بە ڕێوەبەرن. باس لەوە دەکەن ئیسلام ئایینێکی ڕۆحییە و گوزارشتە لە کۆمەڵێک پەیوەندیی سنوورداری نێوان خودا و ئەو مرۆڤە موسڵمانانەی کە باوەڕیان پێیەتی و بابەتێکی کەسییە و پەیوەندیی بە کۆمەڵگەوە نییە و دوور و نزیک پەیوەندیی بە کاروباری دونیاییی خەڵکییەوە نییە و بە تەواوی خاڵییە لە دەستوور و یاسا و حوکم و بەڕێوەبردن، هەر لەبەر ئەوە پێویستە ئایین بە تەواوی لە دەوڵەت و دەسەڵات و بەڕێوەبردن جیا بکرێتەوە و جێگەی دروستی ئایین، نێو ژیانی خەڵکی و دامەزراوەکانی دەسەڵات و بەڕێوەبردن نییە، بەڵکوو چوارچێوەی مزگەوت جێگەی ڕاستەقینە و دروستی ئیسلامە، وەک ئەوەی پێشتر سەرکەوتوو بوون لە لەقاڵبدانی ئایینی مەسیحییەت لە چوارچێوەی کڵێساکاندا، دەیانەوێت بە هەمان ئاڕاستە لە نێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان پەلوپۆی ئیسلام بکەن و بیخزێننەوە نێو مزگەوتەکان، دواتریش لە نێو مزگەوتەکانیش پەلوپۆ بکرێت و جگە لە ئەنجامدانی نوێژ تەواوی چالاکییەکانی تری موسڵمانانی تێدا قەدەغە بکرێت، وەک ئەوەی لە ئێستا لە زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەگوزەرێت کە چالاکیی نێو مزگەوتەکان تەنیا لە ئەنجامدانی نوێژی بە کۆمەڵ و وتاری هەینیدا خۆی دەبینێتەوە.

هەڵبەت ئەم جۆرە بۆچوونە تێڕوانینی عالەمانییە میانڕەوەکانە بەشێکی زۆر لەوانە لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەژین خۆیان بە موسڵمان هەژمار دەکەن، دەنا عالەمانییە ڕادیکاڵەکان لە بنەڕەتەوە بڕوایان بە بوون و هەژموونی ئیسلام نییە، تەنانەت بوونی ئیسلامیان لە چوارچێوەی مزگەوتەکانیش قەبووڵ نییە. بە شێوەیەکی گشتی جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لەنێوان عالەمانیی میانڕەو و عالەمانیی ڕادیکاڵ تەنیا جیاوازیی کاتی و شوێنی و تەکتیکی نەبێت، ئەو عالەمانییەی لە وڵاتانی موسڵماننشین دەژیێت، ناتوانێت ڕاستەوخۆ بانگەشەی هەڵتەکاندن و لە ڕیشەهەڵکێشانی ئایین بکەن، بەو پێیەی کات و شوێن ڕێگە نادەن بە بانگەشەیەکی لەو شێوەیە و شەرمنانە و دووڕوانە گوزارشت لە بۆچوون و دونیابینی دەکەن، بەڵام عالەمانییەکانی دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی ڕوونتر و بوێرانەتر بۆچوونەکانیان دەخەنە ڕوو. لە هەندێک دۆخدا خەڵکانێکی دیاری نێو جیهانی ئیسلامی بانگەشەی ئەم جۆرە بیر و بۆچوونانە دەکەن، لە نموونەی هەندێک کەسایەتیی ئەزهەریی کاریگەر بە هەژموونی زانستی و سیاسیی خۆرئاوا لە نموونەی «عەلی عەبدولڕازیق» بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئیسلام جگە لە پەیامێکی ڕۆحی هیچ بابەتێکی سیاسەت و دەوڵەت و فەرمانڕەواییی لە خۆ نەگرتووە، بەڵکوو جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئیسلام و سیاسەتدا هەیە. موحەممەد (ﷺ) وەک پێغەمبەرانی تر تەنیا ڕابەرێکی ڕۆحییە و هیچی تر، نە دەوڵەتی دروست کردووە نە سەرکردایەتیی دەوڵەتیشی کردووە، پەیامەکەیشی وەک گشت پەیامەکانی پێش خۆی بانگەشەی ئەوە دەکات "ئەوەی کاری قەیسەرە،با بۆ قەیسەر بێت؛ ئەوەی کاری خودایە، با بۆ خودابێت."[1] پاشان دەڵێت: "حوکم و بەڕێوەبردن لە سەردەمی پێغەمبەردا زۆر

---

(١)بڕوانە: الاسلام واصول الحکم: علی عبدالرازق، ص ٤٨ -٨٠ چاپی قاهیرە ئەم پەرتووکە لە سەردەمی خۆیدا کێشەیەکی گەورەی نایەوە، کە بە هۆیەوە نووسەرەکەی لە ڕیزی زانایانی ئەزهەر دوور خرایەوە، لەلایەن زانایانەوە چەندین وەڵامی زانستیی وردی ئەم پەرتووکە درایەوە لەوانە وەڵامی شێخ خزر حوسەین، بە ناوی نقض کتاب الاسلام واصول الحکم

نادیار و لێڵ و شاراوە و تێکەڵاو بووە."[١]

بەشێکی تریان باس لەوە دەکەن بە هیچ شێوەیەک نە لە قورئان و نە لە فەرمووودەدا باس لە یاسا و حوکمڕانیی دەستووری ئیسلامی نەکراوە، تەنیا کۆمەڵێک بابەتی لاوەکی و سەرپێیی نەبێت.[٢] یەکێکی تریان لە چوارچێوەی درێژەدان بەم بابەتە باس لەوە دەکات "ئیسلام خۆی نەداوە لە باسکردنی یاسا و حومکمڕانی و سیستم و بەڕێوەبردن، تەنیا کۆمەڵێک بابەتی شاز نەبێت" بەشێکی تریان باس لەوە دەکەن کە "ئیسلام بە هیچ شێوەیەک بنەمایەکی دیاریکراوی دەستنیشان نەکردووە بۆ چۆنیەتیی حوکمکردن و بەڕێوەبردنی سیستمی سیاسی و ئابووریی وڵات تەنیا بە شێوەیەکی سەرپێیی نەبێت، ئەویش لە کۆمەڵێک بابەتی دیاریکراودا و بە هیچ جۆرێک باسی لە وردەکارییەکانی حوکم و بەڕێوەبردن نەکردووە، تەنیا ئەوە نەبێت لێرەولەوێ تیشکی خستووەتە سەر هەندێک بابەتی ڕەوشتی کە پێویستە لە سەروبەندی حوکمکردندا پەیڕەوی لێ بکرێت. پاشان لە چەندین جێگە و شوێنی جیاوازدا باس لەوە دەکەن کە ئیسلام دوور و نزیک بە هیچ شێوەیەک ئاماژەی نەکردووە بە چۆنیەتیی حوکمڕانی و دەستوور و یاسا تاوەکوو داوا لە موسڵمانان بکرێت، پابەند بن پێوەی و ئیسلام بە هیچ شێوەیەک پەیوەندیی بە سیاسەت و بەڕێوەبردنەوە نییە."[٣]

لە ڕاستیدا گرفتی سەرەکیی بانگەشکارانی هزری عالەمانییەت

---

دواتریش د: محمد عمارة بە ناوی معركة الاسلام واصول الحكم.

(١) بڕوانە: الاسلام و اصول الحكم، ص ٤٦.

(٢)السلطات الثلاث في الدساتير العربية المعاصرة د. سليمان الطماوي وەرگیراو لە تحطيم الصنم العلماني محمد شاكر شريف دار البيقار، ص ٢٦.

(٣)بڕوانە: تحطيم الصنم العلمانية، ص ٢٧-٢٩ تێیدا تەواوی زانیارییەکان لەبارەی خاوەنی ئەم بیر و بۆچوونانەوە خراوەتە ڕوو.

گشتگیرییە، واتە بەشێوەیەکی گشتیگر دوور لە وردەکاریی بابەتەکان دەخەنە ڕوو. واتە ئەگەر پرسیاری ئەوەیان لێ بکرێت ئیسلام تیشکی نەخستووەتە سەر چ بابەتێک پەیوەست بە ژیان و بەڕێوەبردنی خەڵکی بە جۆرێک لە ئاڵۆزی وەڵام دەدەنەوە، ئەو یاسا و دەستوورە گشتیە چییە و کامەیە کە ئیسلام تیشکی نەخستووەتە سەر و سەر باسی لێوە نەکردووە. هەندێکیان باس لەوە دەکەن کە ئیسلام باس لە شوورا و دادپەروەری و ئازادیی گشتی و ئازادیی تاک و یەکسانیی نەکردووە. هەندێکی تریان باس لەوە دەکەن کە ئیسلام گرنگیی نەداوە بابەتەکانی ڕاوێژی سیاسی و مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکانی ناموسڵمان. ئەمە جگە لە هەندێک بابەتی سیاسی و حوکمڕانی کە عالەمانییەکان باس لەوە دەکەن گوایە ئیسلام باسی نەکردووە و تیشکی نەخستووەتە سەر.

# ئیسلام دەستوور و حوکمڕانیی خۆی باسکردووە و خەڵکیشی پێوە پابەند کردووە

بەدرێژاییی مێژووی دەرکەوتنی ئیسلام بە تایبەتی لەم قۆناغانەی دواتر زنجیرەیەک هێرشی ناڕەوا کراوەتە سەر ئیسلام و هەوڵ دراوە هەر چۆن بێت ڕۆحی بەڕێوەبردن و سەرکردایەتیکردنی لێ وەربگیرێتەوە. لە ڕاستیدا بانگەشەکارانی بیرۆکەی نەبوونی سیستمی حوکمڕانی و بەڕێوەبردن وەک ئەوەی هیچ کات قورئانیان نەخوێندبێتەوە، ئەم بانگەشەیەیش جگە لە پاڵنەری دوژمنایەتی پاڵنەرێکی تری نییە. ڕەواییی لەکوێدایە ئەو ژمارە زۆرەی دەقەکانی قورئان و فەرمووده پشتگوێ بخرێت، قورئانی پیرۆز بە دەقی ڕوون و ئاشکرا کە دەرفەتی تەئویلکردنی نییە لە چەندین جێگەی جیاوازدا حەقیقەتی ئەم بابەتەی پشتڕاست کردووەتەوە، ئەمە جگە لە بوونی سەدان فەرموودەی ڕاست لەبارەی حوکمداری و بەڕێوەبردن ئیسلام هەم داوای کردووە. هەمیش فەرمانی کردووە بە جێبەجێکردنی، هەمیش باسی لە شێواز و چۆنیەتیی تەواوی حوکمە شەرعییەکانی پەیوەست بە حوکمداری و بەڕێوەبردن کردووە. سەرەڕای ئەوەی لە چەندین جێگەدا بە وردی تیشکی خستوەتە سەر سروشتی دەسەڵات و پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و هاوڵاتییان و کاربەدەستان و چۆنیەتیی مامەڵەی کاربەدەستان لەگەڵ ژێردەستان و تەواوی دامەزراوەکانی تری دەوڵەت، ئەوەی لە فەرهەنگی ئیسلامیدا بە «ئیمام یان ئەمیر یان پێشەوای موسڵمانان» ناو دەبرێت. لێرەدا هەوڵ دەدەین دیارترین ئەو بەڵگانە بخەینە ڕوو کە لەبارەی حەقیقەتی دەسەڵات و یاسا و حوکمڕانی لە قورئاندا هاتوون:

یەکەم: خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ [البقرة: ٣٠] «ئەو کات بیر بێنەوە کە پەروەردگارت فەرمووی من جێنشینێک لە زەوی دادەنێم» «ئیبن کەثیر»ی ڕاڤەکاری قورئان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: "ئیمامی «قورتوبی» و جگە لەویش ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە بۆ واجبوونی دانانی خەلیفە و سەرکردەیەک، تاوەکوو ئەوەی کاروباری خەڵکی ڕایی بکات و حوکمیان لەنێواندا بکات."[١]

دووەم: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ﴾ [ص: ٢٦] «ئەی داود ئێمە بە ڕاستی تۆمان کردە جێنشین لە سەر زەویدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی، کەواتە تۆیش بە دادوەری حوکم بکە لەنێوانیاندا و شوێن هەواوهەوەس نەکەوی لە کاتی حوکمدا.» «ئیبن کەسیر» لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: "ئەمەیش وەسیەت و فەرمایشتی خوای گەورەیە بۆ کاربەدەستان کە حوکم بکەن لەنێوان خەڵکی بەڕاستودروستی و لانەدەن لێی، ئەو کات گومڕا و سەرلێشێواو دەبن".

سێیەم: خوای گەورە لە قورئاندا تیشک دەخاتە سەر گرنگیی حوکمکردن و بە یاسا و بەرنامەی خوای و هەڕەشە و مەترسی لەو کەسانەی کە پشت لە یاسا و بەرنامەی پەروەردگار دەکەن: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[المائدة: ٤٤] یان ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ [المائدة: ٤٥] یان ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ [المائدة: ٤٧] ئەم ئایەتانە ڕوونترین و ڕاشکاوترین ئایەتە لە سەر واجبوونی کارکردن بە حوکم و یاسا و ئەو بەرنامەی کە خوای گەورە ناردوویەتییە خوارەوە. ئەم ئایەتە جگە لەوەی بە دەقی ئاشکرا فەرموویەتی ﴿هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ﴿هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ﴿هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾

---

(١) تەفسیری ئیبن کەسیر.

سیاقی ئایەتەکە باس لە خاڵێکی گرنگ و جەوهەری دەکات کە ئێمە لێرەدا دەمانەوێت بیخەینە ڕوو. ئەم ئایەتانەی سەرەوە لە سیاقی باسکردنی ئەو کەسانەی کە ئەهلی کیتاب پێیان وایە باوەڕدارن و شوێن پەرتووکێکی ئاسمانی کەوتوون، بەڵام پەروەردگار لە چەند شوێنێکی ئەم سوورەتەدا باس لەوە دەکات ئەوان بە هیچ شێوازێک شوێن تەورات و ئینجیل نەکەوتوون، بەو پێیەی حوکمیان پێ نەکردووە و کاریان بە شەرعی خوا و حوکمی خودایی نەکردووە. وەک ئەوەی قورئان لە پێش باسکردنی ئەو سێ ئایەتە دەفەرمووێت: ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾﴾ [المائدة: ٤٣]

واتە: «ئەوان چۆن تۆ دەکەنە حاکم و بڕیاردەر لە کاتێکدا خۆیان پەرتووکی خۆیان (تەورات)یان لایە، زۆر بەڕوونی حوکمی خوای تێدایە، کەچی پشتی لێ هەڵدەکەن و کاری پێ ناکەن. نە حوکمی تەوراتی خۆیان و نە حوکمی بەرنامەی نێرراوی ئێمە. کەواتە ئەوانە بە هیچ جۆرێک موسڵمان و باوەڕدار نین.» خوای گەورە لەم ئایەتەدا زۆر بەڕوونی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ خاڵی جەوهەری لێرەوە دەست پێ دەکات کە دوای ئەو ئایەتە خوای گەورە لە سێ شوێندا یەک لە دوای یەک دەفەرمووێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾[المائدة: ٤٤] یان ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ [المائدة: ٤٥] یان ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ [المائدة: ٤٧] ژینگە و سیاقی ئەم ئایەتە هۆشداریی توند دەداتە ئەوانەی خۆیان بە موسڵمانان دەزانن و خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام، بەڵام حوکم بە قورئان و ئەو دەستوورەی خوا ناردوویەتی ناکەن. هاوشێوەی یەهوودی و نەسرانییەکان وان کاتێک دەیانوت کە ئەوان باوەڕدارن، بەڵام حوکمیان بە تەورات و ئینجیل نەدەکرد. بۆیە خوای گەورە فەرمووی ﴿وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ ئێوەیش بزانن کە هەر کەس حوکم نەکات بەوەی

کە خوا ناردوویەتی، ئەوا بە دڵنیایی ﴿هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ﴿هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ﴿هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝﴾ [المائدة: ٥٠]

«ئەرێ ئەمانە دەیانەوێت یاسا و بەرنامەی جاهیلیەتی پێش ئیسلام زیندوو بکەنەوە، بڕیار و بەرنامەی خوا لا بدەن و کاری پێ نەکەن، جا دەبێت بڕیار و بەرنامەی کێ باشتر و چاکتر بێت لە بەرنامەی خوا بۆ ﴿لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ دیسان خوای گەورە لە سوڕەتی (النساء)دا بە شێوەیەکی ڕوون تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرموویت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ۝﴾ [النساء: ٦٥] واتە: «نەخێر بەو شێوەیە نییە، بەڵکوو سوێند بە خودای تۆ ئەی موحەممەد، نابنە باوەڕدار هەتاوەکوو بۆ کێشەکانی نێوانیان تۆ و بەرنامەی تۆ دەکەنە دادوەر و یاسای خۆیان، ئەوسایش دەبێت هیچ نارەحەتی و تەنگییەک دروست نەبێت لایان بەرانبەر ئەو یاسا و بەرنامە و حوکمکردنەی تۆ و بە چاکییش دەبێت ملکەچ و ڕادەستی تۆ بن» دیسان خوای گەورە لە چەندین شوێنی تری قورئاندا ئەم بابەتە پشتڕاست دەکاتەوە و ڕوونتر پێداگریی لێ دەکات و دەفەرموویت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝﴾ [یوسف: ٤٠] واتە «هەر چی حوکم و بڕیارێک هەیە، **تەنیا** بڕیار و حوکمی خودایە و بۆ خودایە، دەبێت **تەنیا** ئەو حاکم بێت، بۆیە فەرمانی داوە کە **تەنیا** دەبێت ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵی ئەو بن، ئەمە ئایینی ڕاست و ڕەوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکی لێی بێئاگان.»

شێخولئیسلام «ئبن تەیمیەی حەڕانی» (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموویت: "بێگومان هەر کەسێک حوکم و یاسای خودا ڕەت بکاتەوە، پێی

واجب نەبێت،ئەوە بە دڵنیایی کافر و بێباوەڕە."[١] ئەمەی ڕابوورد، بەشێکی کەم بوو لەو ئایەتە قورئانییانەی کە بە ڕوونی تیشک دەخات سەر پێویستیی ڕێکخستن و حوکم و یاسا وەک ڕێگوزەرێکی خێرا ئاماژەمان پێ کرد، دەنا درێژەدان بەم بابەتە پێویستی بە زنجیرەیەک پەرتووکی سەربەخۆیە.

---

(١) بڕوانە: تەواوی قسەکانی شێخولئیسلام ئبن تەیمییە لە مجموعة التوحيد رسالة ١٢ ص ٤١٣.

# حەقیقەتی حوکمڕانی و دەسەڵات لە فەرموودەکانی پەیامبەردا

پەیامبەر(ﷺ) وەک پەیامبەر و سەرکردەی دەوڵەت لە یەک کاتدا هەر دوو ئەرکە خودایی و مرۆییەکەی بە باشترین شێوە جێبەجێ کردووە. جگە لە کاروکردەوەی خۆی کە بەشێکە لە سوننەت و بەهێزترین بەشی سوننەتە، یەک کاری دوای کۆچی بۆ مەدینە دامەزراندنی دەوڵەت و ڕێکخستنی حوکم و کاروباری خەڵکی بوو. جگە لەم ڕووە کردارییە، لە چەندین شوێندا بە گوتە تیشکی خستووەتە سەر ئەم بابەتە. وەک دەفەرمووێت: «كانت بنو اسرئيل يسوسهم انبيائهم كلما هلك نبي خلفه نبي وأنه لا نبي بعدي»[1] «هەمیشە پەیامبەرانی خودا سیاسەت و حوکمی هۆزی ئیسرائیلیان بە ڕێوە دەبرد، هەر کات پەیامبەرێک بمردایە پەیامبەرێکی تر شوێنی دەگرتەوە، بەڵام لە دوای من پەیامبەر نایەت» (واتە حوکمڕانییەکە لە ئیسلامدا دەگۆڕێت و خەڵکانی تر جێی پەیامبەری دەگرنەوە، بەو پێیەی لە دوای موحەممەد ئیتر پەیامبەری تر نایەت، بەڵکوو جێنشین و خەلیفەکان بە ژمارەیەکی زۆرەوە دوای ئەو دێن.) پەیامبەر(ﷺ) زۆر بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە یەکێک لە کارە گرنگەکانی پەیامبەران سیاسەت و حوکمکردن و بەڕێوەبردنی کاری خەڵکی بووە و یەکێک بووە لە ئەرکە پیرۆزەکانی پەیامبەرانی خودا و خودی خۆیشی. بەو پێیەی لە سەردەمی هۆزی ئیسرائیلدا وەحی ئاسمانیی کۆتایی نەهاتبوو، بۆیە هەر کات پەیامبەرێک وەفاتی دەکرد، یاخود شەهید دەکرا پەیامبەرێکی تر شوێنی دەگرتەوە، بەڵام لە دوای پەیامبەری ئیسلام(ﷺ)

---

(١) متفق عليه

ئیتر جارێکی تر پەیامبەر نایەت، بۆیە خەڵکانی تر لە خەلیفە و جێنشینانی شەرعی شوێنی دەگرنەوە و دەبنە درێژەپێدەری لە ڕێکخستنی کاروباری موسڵمانان. دواتر پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) درێژە دەدات بە بابەتەکە و لە بەشەکانی تری فەرمودەکەدا بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر پێویستیی گوێڕایەڵی خەڵکی بۆ فەرمانی باشەی حاکم و کاربەدەستان و ئەرکی ڕەوشتیی کاربەدەستان بەرانبەر تاک و کۆمەڵگەی موسڵمان و هاونیشتمانیی تری نێو کۆمەڵگەی موسڵمانان. ئایینەکانی تر حوکم و بەڕێوەبردنی وەک ئەرکێکی قورس و مەترسیدار هەژمار کردووە و دەسەڵاتداری وڵات بەرپرسیارن لە دۆخی تاک بە تاکی هاوڵاتییانی کۆمەڵگە، وەک دەفەرموێت: (فإن الله سائلهم عما استرعاهم). واتە: (خوای گەورە پرسیاریان لێ دەکات دەربارەی ئەو خەڵکانەی ئەوان بەرپرسیارن لە سەرپەرشتیکردنیان.)

هەموو ئەمانە ئاماژەی ڕوونن بە پێویستی و واجبوونی حاکم و بەرپابوونی حوکمڕانی. دواتر وەک فەرمان بە درێژەدانی گوێڕەیەڵیی دروستی خەلیفە و جێنشینانی دوای خۆی. لەم بارەیەوە لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: «عليكم بسنتي وسنت الخلفاء الراشدين من بعدي»[1] «دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی جێنشینە ڕاشیدەکانی دوای من.» لە پاشان لە جێگەیەکی تردا وەک ئاماژەیەک بۆ ڕێگریکردن لە دروستبوونی ئاڵۆزی و پشێویی سیاسی بەهۆی ململانێ لە سەر دەسەڵاتەوە دەفەرموێت: «إذا بويع لخلفتين فاقتلوا الآخر منهما»[2] «ئەگەر لە یەک کاتدا بەیعەت درایە دوو خەلیفە، ئەوا دووهەمیان بکوژن».

لە جێگەیەکی تردا دەفەرمووێ: «مابعث الله من نبي ولا استخلف من خليفة

---

(١) رواه أبوداود ٤٦٠٧ والترمذي ٢٦٦.

(٢) مسلم ١٨٥٣

الاكانت له بطانتان»[١] دیسان لە جێگەیەکی تردا دەفەرمووێت: «إنما الإمام جنة يقاتل من ورائه»[٢] پاشان لە جێگەیەکی تردا لە سەروبەندی دیاریکردنی بەرپرسیارێتیی پێشەوا و پێشەنگی موسڵمانان بەرانبەر بە کۆمەڵگەکەی دەفەرمووێت: «فاالأمير الذي على الناس راع وهو مسؤل عن رعيته»[٣] ئەمەو چەندین بەڵگەی تری فەرموودە کە بە شێوەیەکی ڕوون لە سوننەت و مەسانیدەکانی فەرموودەدا هاتووە و بە ئاشکرا تیشک دەخەنە سەر واجبوونی حوکم و دەسەڵات و سیاسەت و بەڕێوەبردن، ئەمە سەرەڕای وردەکارییەکانی پەیوەست بە سروشتی دەسەڵات و بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانی دەسەڵاتداران و هاوڵاتییان و شێوازەکانی چارەسەکردنی کێشەکان و سنووری دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوا و ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت و هاوڵاتییان و دەوڵەت و وڵاتانی تر.

هەندێکجار بە تەواوی دەگەینە ئەو بڕوایەی کە سەلماندنی ئەم بابەتە هێندە پێویستی بە خستنەڕووی بەڵگە نییە، بەڵکوو دەکرێت لە ڕێی پرسیارێکی سادەوە کۆتایی بەم بابەتە بهێنین. بە سادەیی دەپرسین یەکەمین کاری پەیامبەری ئیسلام (ﷺ) دوای کۆچی بۆ مەدینە چی بوو؟ بێگومان هەمووان کۆکن لە سەر ئەوەی دروستکردنی دەوڵەت و دامەزراندنی کیان و حوکوومەت یەکەمین کار بووە دوای دروستکردنی مزگەوت پێی هەستا. دیسان دەپرسین یەکەمین سەرکردەی ئەو دەوڵەت و کیانە کێ بوو؟ بێگومان هەمووان دەڵێن: پەیامبەر «موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا» (ﷺ)کەوایە خودی پەیامبەر ئەم بابەتەی بە گرنگ زانیوە و ئەم گرنگیزانینەیش لە بابەتێکی سادە و هەستێکی کەسییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکوو پشتبەستوو بووە بە وەحی و سروشتێکی خوایی،

---

(١) رواه البخاري ٦٧٧٣

(٢) مسلم ١٨٤١

(٣) متفق عليه

وەک قورئانی پیرۆز و وێنای دەکات ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝﴾ [النجم: ٣-٤] هەروەها پەیامبەر (ﷺ) تەواوی وردەکارییەکانی پەیوەست بەم بابەتەوە خستوەتە ڕوو، تاوەکوو ئەوەی خەلیفە و پێشەوایانی ڕێڕەوی ڕەسەنایەتیی پەیامبەر بە شێوەیەکی دروست لە سەری بڕۆن، دواتریش جێنشینانی ڕاشید وەک ڕێنماییەکانی خۆشەویست کاریان لەسەرکردووە و تەواوی وردەکارییەکانی پەیوەست بە بابەتی حوکمداری و بەڕێوەبردن لە سەرچاوە ئیسلامییە ڕەسەنەکان بەڕوونی باس کراون و قسەیان لە بارەوە کردووە.

دواتریش کاربەدەستە خاوێن و ڕەسەنەکان، پێبەپێی فەرمانڕەواییی پەیامبەری خۆشەویست(ﷺ) سیاسەت و حوکم و ژیانی موسڵمانیان بە ڕێوەبردوە، ئەحکامەکانی شەرعیان جێبەجێ کردووە و کاریان بە دەستووری خودایی ئیسلامی کردووە. کارکردن بە دەستووری خودایی لە سەردەمی پەیامبەر(ﷺ) و قۆناغی دواتر لە سەردەمی خولەفای ڕاشیدین، بە وردی ڕوون کراوەتەوە و کاری پێ کراوە و دواتریش موسڵمانان لە سەری ڕۆیشتوون. ئەو بابەتە جوزئی و لاوەکییانەی کە عالەمانییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن، گوایە ئیسلام قسەی لە بارەیانەوە نەکردووە مەحاڵە ئیسلام چارەسەر و قسەی هەبێت لە تەواوی وردەکارییە یاسایی و سیاسییەکانی پەیوەست بە حوکمڕانی و ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی زۆر جار هەندێک لە بەناو موسڵمانەکان ئەم قسەیە دەکەن باس لەوە دەکەن چۆن ئیسلام دەکرێت ببێتە یاسا و بەرنامەیەکی گشتگیر بۆ تەواوی ژیانی خەڵکی لە کاتێکدا ئیسلام هەزار و چوارسەد ساڵ پێش ئێستا دەرکەوتووە. ئەو کات ژیان جۆرێکی تر بووە، پێداویستییەکانی ژیان کەم بوون و جیاواز لە ئێستا و مرۆڤی سەردەمی نوێ، پێویستی بە یاسا و بەرنامە و دەستووری نوێیە، بۆ ئەوەی ببێتە وەڵامدەرەوەی داواکاری و پێویستییە هەنووکەییەکانی.

زۆر جار عالەمانییەکانی خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی ئیسلامی ئەم بابەتە وەکوو

گومان یاخود وەک پرسیارێکی بێوەڵام دەخەنەڕوو، چۆن دەکرێت لە جیهانی پێشکەوتوو و جیهانی سەردەمی نوێ، لێوانلێو لە پێشکەوتن و گەشەسەندن و پێداویستیی زۆر و گەشەی جیاواز لە سەر ئاستی ئابووری و سیاسی و یاسایی و ژیان و ژیاری. چۆن دەکرێت مرۆڤی ئەم سەردەمە بەم هەموو پێشکەوتن و پێداویستییە زۆرەوە، بە بەرنامە و شەریعەتێکی ١٤٠٠ پێش ئێستا ژیانیان ڕێک بخەین و حوکم و ئاڕاستەیان بکەین! بۆیە دەکرێت ئیسلام بۆ قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراوی ژیانی مرۆڤەکان گونجاو و لەبار بووبێت، بەڵام مەحاڵە بۆ ژیانی پێشکەوتوو و گەشەسەندووی ئەمڕۆی مرۆڤەکان سەرکەوتوو بێت.

ئیسلام باسی تەواوی یاسا و وردەکارییە سیاسییەکانی حوکمڕانیی کردووە. ئەو تۆمەتەی کە دەوترێت گوایە ئیسلام تەنیا کۆمەڵێک بابەتی گشتگیریی خستوەتە ڕوو، دوور و نزیک باسی لە وردەکارییەکانی پەیوەست بە یاسا و دەستوور و سیاسەتەوە نەکردووە و دوورە لە ڕاستییەوە.

أ- سەرەتا ئەوەی پێویستە تیشکی بخەینە سەر ئەوەیە کە ئیسلام خاوەنی قسەی کۆتاییە لە میکانیزمی دانانی دەستوور و فەرموویەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ ۝٥٧﴾ [الأنعام: ٥٧] واتە هەمووە حوکم و بڕیارێک هەر هی خودایە و هەر ئەویش بە باشترین شێوە هەق ڕوون دەکاتەوە و جیای دەکاتەوە.

ب- قورئان بە توندی ئەو بابەتە ڕەت دەکاتەوە کەسێک یاخود شەریعەت و یاسا و دەستوورێکی تر بکرێتە هاوبەشی یاسا و دەستووری پەروەردگار وەک قورئان بە ئاشکرا وێنای دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ [الكهف - ٢٦] واتە: «هیچ کەس هاوبەشی نییە لە کار و بڕیار و یاسادانان، لەگەڵ خودا.» ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە خودا نەک تەنیا خاوەنی شەریعەت و یاسا و دەستوورە، لە پاڵ ئەوەدا بە هیچ

شێوەیەک ڕازی نابێت هیچ کەس و لایەنێک ببێتە هاوبەشی لە حوکم و یاسادانان، ئایەتی دواتر ئەم بابەتە زیاتر ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ﴾ [الرعد: ٤١]

واتە: «تەنیا خودا حوکم و بڕیار دەردەکات و هیچ کەسیش ناتوانێت ڕێگەی لێ بگرێت.» دیسان لە شوێنێکی تردا وەک وێناکردنی بڵند و باڵای وتە و حوکمی پەروەردگار بە سەر تەواوی ئەوانی تردا قورئان دەفەرموێت: ﴿وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۝﴾ [التوبة: ٤٠] واتە «وشەی خودا و فەرمانی خودا بەرزە و دەبێت بەرز و بڵند بێت.»

تەواوی ئەم ئایەتانەی پێشتووتر کە باسمان کردن بە ڕوونی تیشک دەخەنە سەر ئەوەی کە خوای گەورە بە تەنیا سەرچاوەی سەرەکی و کۆتاییی دەستوور و یاسادانانە، تەواوی دەستوور و یاسا و ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان لای خودایە و هیچ کەس بۆی نییە یاسایەکی تر پەیڕەو بکات چ بگات بەوەی خۆی هەستێت بە نووسینەوە و دانان و فەرزکردنی بە سەر خەڵکیدا.

ج- قورئان بەگرنگییەوە باس لە دانانی کاربەدەستان دەکات بە مەبەستی ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی، دواتر مەرج دادەنێت بۆ ئەو کاربەدەستە کە دەبێت چۆن بێت. زیاد لەمە تیشک دەخاتە سەر پێویستیی پابەندبوونی خەڵکی بە بڕیارە دروستەکانی ئەو کاربەدەستەوە. وەک دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ ۖ﴾ [النساء: ٥٩] واتە: «ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، گوێڕایەڵی خودا و پەیامبەرەکەی بن، گوێڕایەڵی کاربەدەستان نێو خۆشتان بن.» بە وردبوونەوە لەم ئایەتە دەبینین خوای گەورە.

١- گرنگی و پێویستیی بوونی کاربەدەست بۆ ڕاییکردنی ئیش و کاروباری خەڵکی و چەسپاندنی دەستوور و یاسای خودایی.

٢- گرنگیی پابەندبوونی جەماوەر بە بڕیار و ڕێنماییەکی پێشەوا و کاربەدەستەوە

تا ئەو کاتەی لە سنووری خودا لای نەدابێت.

٣-هاوتاکردنی ئەو گوێڕایەڵییە بە گوێڕایەڵیی خودا و پەیامبەری خودا (ﷺ) وەک دەبینین لە ئایەتەکەدا بە شێوەیەکی پلەبەندی خراوەتە ڕوو.

دەستنیشانکردنی سروشتی خودی پێشەوا یاخود سەرۆک یاخود هەر ناوێکی تری لێ بنرێت بەوەی کە دەبێت موسڵمان بێت، واتە لە خودی موسڵمانان خۆیان بێت. (منکم) لە خۆتان (لا من غیرکم) وەک سەرەتای ئایەتەکە، خیتابە بۆ موسڵمانان و دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ کەواتە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا پێویستە کاربەدەستی موسڵمان سەرکردایەتیی وڵات و کۆمەڵگە بکات و بە هیچ شێوەیەک ڕێگەپێدراو نییە کەسانێکی ناموسڵمانان لە هەرەمی دەسەڵاتدا کاروباری حوکم و یاسای موسڵمانانیان پێ بسپێرێت. دواتر قورئان ڕوونتر تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە مەحاڵە خەڵکانی ناموسڵمان ببنە بەرپرسیاری یەکەم و حوکمکردنی موسڵمانان، وەک بەڕوونی دەفەرمووێت: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾﴾ [النساء: ١٤١] واتە: «هەرگیز خودا ڕێ نادات کە بێباوەڕان زاڵ و گەورە بن بە سەر موسڵماناندا.»

بێگومان هیچ ڕێگە و بەرپرسیارییتییەک هێندەی بەرپرسیارێتیی حوکم و فەرمانڕاوایی گەورە نییە، کەواتە ئەوەی گرنگە و مەرجی سەرەکییە دەبێت کاربەدەستی موسڵمانان، موسڵمان بێت ئەمە جگە لە چەندین مەرجی تر کە لە سەرچاوە فیقهییەکاندا بە ئاشکرا ڕوون کراوەتەوە و تیشک دەخەنە سەر کۆمەڵێک مەرجی تر لە نموونەی باڵغی و عاقڵی و دادپەروەرەوە ... هتد. هەریەک لەم مەرجانە چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای لە قورئان و فەرمووده لەسەرە کە لێرەدا دەرفەت نییە بۆ ئەوەی بە وردی تیشکیان بخەینە سەر. ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە هەوڵدان و کارکردن بۆ دانانی کاربەدەستێکی موسڵمان ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە، وەک

ئەوەی پەیامبەر (ﷺ) بەڕوونی تیشک دەخاتە سەر و دەفەرمووێت «من مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية»[1] واتە: «هەر کەسێک بمرێت و بەبێ هیچ ڕێگرییەک بەیعەتی پێشەوایەکی موسڵمانانی لە گەردندا نەبێت ئەوە بە مردنێکی نەفامی مردوە.» مانای ئەم فەرموودەیە و لە سۆنگەی بنەمای شەرعی (مالايتم الواجب الا به فهو واجب) هەر واجبێک نەدەهاتە دی، مەگەر بە واجبێکی تر نەبێت، ئەوا ئەو شتە خۆی دەبێتە (واجب) بە دڵنیایی حوکمکردن و بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان تەنیا بە کەسانی موسڵمان و پابەند دەکرێت.

د: ئیسلام بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر سروشتی پەیوەندیی نێوان کاربەدەستان و هاوڵاتییان، ئەگەری دروستبوونی ناکۆکی لەنێوانیان و شێوازی چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گرفتانەی کە ڕوودەدەن، واتە دەگونجێت و بگرە ئاساییە کە ئاڵۆزی و ناکۆکی و لێکترازان و نەگەیشتن لەنێوان کاربەدەست و هاوڵاتییان ڕوویدات. زیاد لەمە قورئان میکانیزی چارەسەرکردن و یەکلاییکردنەوەی ئەو کێشە و ئاریشانەی دەستنیشان کردووە، گەڕانەوەی بۆ لای قورئان و سوننەتی کردووە بە کلیلی چارەسەری کێشە و گرفتەکان وەک دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ [النساء: ٥٩] واتە: «ئەگەر لە شتێکدا کێشە و ناکۆکیتان هەبوو، ئەوە بیگەڕێنەوە بۆ لای خودا و پەیامبەرەکەی ئەگەر باوەڕتان بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە، چونکە ئەو گێڕانەوەیە بە جوانترین و چاکترین و پڕ خێرترینە بۆتان.»

هـ- ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە ماوەی حوکمڕانیی سەرۆک و پێشەوای وڵاتەوە پێچەوانەی ئەوەی ئێستا لە زۆرێک لە وڵاتان دەگوزەرێت، تێیدا ماوەی فەرمانڕەوایی سەرۆک بۆ چوار ساڵ یاخود هەشت ساڵ دیاری دەکەن،

---

(١) مسلم ١٨٥١

لە ئیسلامیدا شتێک نییە بە ناوی ماوەی کاتی حوکمڕانی، هیچ کات و زەمەنێکی بۆ دیاری نەکردووە، بە مەرجێک (سەرۆک، ئیمام، پێشەوا) پابەندی تەواوی ئەو مەرجانە بێت کە لە سەری پێویست کراون، لە بەرانبەردا هیچ کەس لە موسڵمانان لە سەر ئاستی تاک و دەستە مافی ئەوەیان نییە هەوڵی لادان جێ پێ لەقکردنی بدەن، هەر کەسیش کارێکی لەم شێوە بکات بێگومان لە دونیا و دوارۆژدا بەرپرسیار و تاوانبار دەبێت و بەر تووڕەیی خودا دەکەوێت، لە دوارۆژیشدا بە گومڕایی و بێ بەڵگە دەچێتەوە لای پەروەردگار. وەک ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێت) بە ڕوونی وێنای دەکات و دەفەرموێت: «من خلع يداه من طاعة لقي يوم القيامة ولا حجة له»[1] واتە: «هەر کەس دەست هەڵبگرێت لە گوێڕایەڵی و جیا ببێتەوە لە سەرۆک و پێشەوای باوەڕداران بەبێ هۆکارێک، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بەبێ بەڵگە و مایەپووچی دەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگار.»

و- ئیسلام بە دەقی ئاشکرا باسی لە میکانیزمی دانانی پێشەوا و دەسەڵاتداران کردووە بە وردی تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە و دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ [الشورى: ٣٨] واتە: «کاروباریان و ڕێکخستنی لەنێوان خۆیاندا بە شوورا و پرس و ڕاوێژە.» ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕوونی تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە تەواوی کاروبارەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانان، لە سەر و هەموویانەوە پرسەکانی پەیوەست بە حوکم و دەسەڵاتداری، بە دیاریکراویتر پرسی دەستنیشانکردنی ئیمام و پێشەوا پێویستە بە پرس و ڕاوێژ ئەنجام بدرێت. بەو پێیە بابەتێکی هەستیاری وەک دەستنیشانکردنی ئیمام و پێشەوا تەواو گرنگە و پەیوەندیی بە ژیانی تاک بە تاکی هاوڵاتییانی کۆمەڵگەی موسڵمانانەوە هەیە، بۆیە دەبێت بە ڕاوێژ دەستنیشان بکرێت. دیسان پرسیاری ئەوە دێتە پێشەوە میکانیزمی ڕاوێژەکە چۆنە و دەبێت چۆن بێت؟ لە ڕاستیدا ئەم

---

(١) مسلم ١٨٥١

بابەتە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، دەکرێت بەپێی کات و شوێن گۆڕانکاریی بە سەردا بێت، ئایا ئەو ڕاوێژە لە ناو کۆڕی شارەزایاندا بێت، ئەوەی لە فیقهی ئیسلامیدا بە ئەهلی حەلوعەقد ناسراوە، یاخود تاک بە تاکی هاوڵاتییان بە ڕێوشوێنێکی گونجاو دەستیان هەبێت لە دەستنیشانکردنی سەرۆک و پێشەوادا. دواتریش بابەتی پرس و ڕاوێژ درێژ دەبێتەوە بۆ تەواوی کایەکانی تری نێو کۆمەڵگە، بەتایبەتی تر کایەی سیاسی و ئابووری و سەربازییەکان، تاوەکوو ئەوەی درێژ دەبێتەوە بۆ کایە کۆمەڵایەتی و کەسییەکانی نێو کۆمەڵگە.

پێشەوا «ئیبن عەطیية» لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: "ڕاوێژکردن یەکێکە لە یاسا گرنگەکانی شەریعەتی ئیسلامی، هەر کاربەدەستێک بە ویستی خۆی کار بکات و پرس و ڕا بە پسپۆڕان خاوەن ئایین و زانست نەکات، ئەوە بە دڵنیاییی لابردنی واجبە، ئەم بابەتەیش هیچ خیلافێکی تێدا نییە."

هەر لەم چوارچێوەیەدا دەبینن پێشەوا «عومەری کوڕی خەتتاب» (ڕەزای خوای لێ بێت) لە دوای بریندار بوونی خۆی و پێش شەهیدبوونی چەند هاوەڵێکی هەڵبژارد وەک لیژنەیەکی شوورا و ڕاوێژکاری، تاوەکوو دوای شەهیدبوونی خۆی پێشەوایەک بۆ موسڵمانان دەستنیشان بکەن، ئەو هاوەڵانەیش دوای گەڕان و پرس و ڕاوێژکردن بە نێو خەڵکی مەدینە دواتر «عوسمانی کوڕی عەفان»یان هەڵبژارد. هەر بەم شێوەیە واتە بۆچوونی زۆرینەی زۆری بگرە هەموو خەڵکی «عوسمانی کوری عەفان»یان هەڵبژارد. کەواتە هەڵبژاردنی کاربەدەست لە ڕێگەی جەماوەرە بابەتێکی ئیسلامییە و ئیسلام لە سەدەی شەشەمی زایینییەوە هێناویەتە کایەوە، نەک ئەوەی هزری چەقبەستووی عالەمانی بانگەشەی دەکات گوایە ئەم میکانیزمە میکانیزمێکی دوای سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسی و ڕێنیسانس و بەرهەمی عالەمانییەتە.

لە ڕاستیدا میکانیزمی هەڵبژارد و دەستنیشانکردنی سەرۆک و پێشەوای

وڵات بە کەرەستەی عالەمانییەت، بابەتێکی شکستخواردوو و بێڕێزکردنە بە مافی زۆرێکی تر. لەوانەی تر بۆ نموونە ئەوەی لە جیهانی نوێدا باوە لە پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات زۆر جار زیاتر لە کەسێک، بگرە هەندێک جار چوار کەس و زیاتر خۆیان بۆ ئەو پۆستە کاندید دەکەن، ئەگەر بە شێوازێکی گریمانەیی بڵێین چوار کەس خۆیان کاندید دەکەن، لە کۆتاییدا باشترین کاندید و خاوەنی زۆرترین چانسی جەماوەری، لە سەدا چلی دەنگەکان دەهێنێت و یەکێکی تر لەسەدا سی و ئەوی تر لە سەدا حەڤدە ئەوی تر لە سەدا سیازدە بە کۆی گشتیی ڕێژەی دەنگی سەرۆکی هەڵبژێرراو دەگاتە لەسەدا چل، ئەمەیش واتای فەوتانی دەنگی لە سەدا شەستەکەی تری بەشداربووانی هەڵبژاردن. جگە لە مافی ئەو کەسانەی کە هەر لە بنەڕەتەوە بە هۆی بێ متمانەییان بەشدارییان نەکردووە. لە زۆربەی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە هۆی بێ متمانەیی خەڵکی بە هەڵبژاردن و دەنگدان ڕێژەی بەشداریکردن لە پرۆسەکانی دەنگدانان لە ئاستێکی تەواو نزمدایە، بە شێوەیەک لە هەندێک وڵات ڕێژەی بەشداریکردن لە سەدا چل تێناپەڕێت، ئەو ڕێژەیش دابەش دەبێت بۆ سەر چەندین کاندید و لە کۆتاییدا هەندێک جار سەرۆک بە لە سەدا دەی دەنگەکان دەبێتە سەرۆک، لە سەدا نەوەتی بەشداربووان و بەشدار نەبوون ئیتر مافەکانیان یەکسان دەبێت بە هیچ و دەنگیان دەچێتە زبڵدانەوە. هەڵبەت ئەمە لە کاتێکدایە کە پرۆسەکە بە خاوێنی و دوور لە ساختەکاری و بە شەفافی بە ڕێوە بچێت کە بابەتێکی لەم شێوەیە بە تایبەتی لە سیستمی عالەمانییەکانی خۆرهەڵاتییەکان، تێیدا هیچ هەڵبژاردنێک بەبێ ساختە و دەسکاریکردنی دەرئەنجامەکان بە ڕێوە ناچێت. دیسان بابەتەکە ئاڵۆز دەبێت کاتێک کە هەر حیزب و لایەنێکی کاندیدی خۆی دەستنیشان دەکات، ئەمە ئەگەر خودی دەسەڵات ڕازی بێت. لە کۆتاییدا ئەگەر تەواوی خەڵکی بە ئازادی و بێ ساختە و دوور لە ترس و تۆقاندن دەنگ بدەن هێشتا دەنگی زۆرینەی خەڵکی دەفەوتێت.

# ئیسلام دیدی خۆی هەیە لەبارەی تەواوی کایەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤەوە

کاتێک دەگوترێت ئیسلام گونجاوە بۆ هەموو کات و شوێنێک، یاخود دروستتر بڵێین هەموو کات و شوێنێک گونجاوە لەگەڵ ئیسلامدا، واتای ئەوەیە ئیسلام قسەی خۆی هەیە لە تەواوی کایەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤایەتی و چارەسەری گونجاوی هەیە بۆ تەواوی ئاریشە و گرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکان، بە گەواهیی خودی نەیاران. لەم چوارچێوەیەدا خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی «هانوتو» دەڵێت: "ئیسلام هەم ئایینە و هەمیش سیاسەت و بەڕێوەبردن، تەواوی موسڵمانان پێیان وایە دەسەڵات موڵکی خودایە و بۆ هیچ کەس نییە بیگرێتە دەست، جگە لە خودی موسڵمانان نەبێت"[1] بێگومان ئەوەی «هانوتو» لەبارەی ئیسلامەوە دەیڵێت دروستی گوتووە، دیسان وەک گەواهیدانێک لەم بارەیەوە «ئیمیل درمنجم» دەڵێت: "ئیسلام بریتی نییە لە بیروباوەڕێکی ماددی کە پێوەرە ماددییەکانی بە سەردا جێبەجێ ببێت، هاوکات بیروباوەڕێکی ڕۆحی نییە کە هیچ پەیوەندییەکی نەبێت بە ژیان و ماددەوە، بەڵکوو ئیسلام بیروباوەڕێکی گشتگیرە و بە گرنگییەوە دەڕوانێت لە ژیانی دونیا و ماددە و ڕۆح هەم دونیا و هەمیش دوارۆژ.

ئیسلام لە یەک کاتدا هەم ڕۆحە و هەمیش جەستە، هەم دەوڵەت و هەمیش ئایین، هەم ژیانە هەم پەنهانە. ئیسلام بیروباوەڕێکی بەرەوپێشبەرە نەک تەنیا لەبەرئەوەی پشتگیریی تیۆریاکانی کۆمەڵگەی ئێستا دەکات، بەڵکوو

---

(١) بڕوانە: اثر الفكر العلماني في المجتمع الإسلامي د. محمد رشاد عبد العزيز دار الكتب المصرية ص ١١٦.

لەبەر ئەوەی خودی ئیسلام هەمیشە تاکەکانی کۆمەڵگە بەرەو پێشکەوتن و بەرەوپێشچوون هان دەدات."(١)

بێگومان ئەمە پێناسەیەکی کرداریی دروستە بۆ ئیسلام و تەواوی لایەنەکانی مرۆڤایەتی و پێداویستیی مرۆڤەکان لە ئیسلامدا بوونی هەیە. لەلایەنی بیروباوەڕەوە هەزاران دەقی قورئان و سونەتی ڕاست بەرچاو دەکەون کە بنەماکانی عەقیدە و بیروباوەڕی موسڵمانان بونیات دەنێن و دەستنیشانی دەکەن. لەلایەنی حوکم و بەڕێوەبردن و سیاسەت و دەستوور و یاسادانانەوە لە ڕێگەی دەقەکانی قورئان و فەرموودەوە چەندین بنەما و دەستوور و یاسای جۆراوجۆری خستوەتە پێش چاوی موسڵمانان، تاوەکوو ئەوەی لە ڕێیەوە بتوانن سیستمی حوکمڕانی و دەسەڵات و بەڕێوەبردنی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن کە تا ئێستایش قوتابخانەی عالەمانییەت نەی توانیوە بە هیچ شێوەیەک پێی بگات.

لە یاساکانی پەیوەست بە بابەتە کۆمەڵایەتییەکاندا، ئیسلام چەندین یاسای جۆراوجۆری پەیوەست بە بابەتەکانی ژنخواستن و تەڵاق و پەیوەندیی نێوان هاوسەران خستوەتە ڕوو، بە شێوەیەک تێیدا مافی هەموو لایەکی تێدا پارێزراوە و نموونەی جوانی واقیعیەتی لە هیچ یاسایەکی دونیادا نییە.

لە هەمبەر پەیوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکان و ڕێکخستنی بازاڕ و سیستمی دارایی و ئابووریی چارەسەری هەژاری و هەڵئاوسانی ئابووری، ئیسلام چەندین یاسا و تیۆری و ڕێنماییی خستوەتە ڕوو بە شێوەیەک بە پەیڕەویلێکردنیان تەواوی کێشە و ئاریشە ئابووری و داراییەکان چارەسەر دەبێت. پتەویی ئەم یاسایانە بە شێوەیەکە، هەندێک جار لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا لەگەڵ ئەوەی یاسا عالەمانییەکان سەپێنراون، کەچی دەبینین هەندێک جار وەک ناچاری و بۆشاییی یاسا و بڕگە یاساییەکانی خۆیان پشت بە یاسا ئیسلامییەکان دەبەستن، بە تایبەتی لە بابەتەکانی پەیوەست بە یاساکانی باری کەسێتی.

---

(١) سقوط العلمانية انو الجندي، ص ١٩٦ وەرگیراو لە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# سەرچاوەکان

القرآن الكريم.

الكتب الحديثية وتشتمل على: صحيح البخاري، صحيح مسلم، سنن أبي داود، سنن ابن ماجه، سنن الترمذي، سنن البيهقي، مسند أحمد، معجم الطبراني وغيرها.

التفاسير المعتمدة وتشتمل على: تفسير الطبري، تفسير ابن كثير، تفسير القرطبي وغيرها.

الفرصة السانحة: ريتشارد نيكسون، ترجمته الى العربية أحمد صدقي مراد، طبعة القاهرة ١٩٩٢.

الدرر في اختصار المغازي والسير، لابن عبد البر، الناشر: المجلس الأعلى للشؤن الإسلامية بمصر_ القاهرة، سنة ١٩٦٦.

احذروا الأساليب الحديثة في مواجهة الإسلام، للدكتور سعد الدين صالح، مكتبة الصحابة١٩٩٨.

هموم الداعية، للشيخ محمد الغزالي، دار القلم، سنة ٢٠٠٦.

قادة الغرب يقولون دمروا الإسلام و أبيدوا أهله، جلال العالم الطبعة الأولى ١٩٧٤.

الإسلام دين المستقبل روجيه جارودي، ترجمه عبد المجيد بارودي، دار الإيمان للنشر والتوزيع ١٩٨٣ .

معركة المصحف في العالم الإسلامي، للشيخ محمد الغزالي، دار القلم

للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق سنة ٢٠٠٥.

الله أو الدمار، سعد جمعة، المختار الإسلامي بمصر _ القاهرة.

الفكر الإسلامى وسموم التغريب والتبعية، أنور الجندي, ,دار الفضيلة للنشر والتوزيع والتصدير، سنة١٩٩٩.

كيف هدمت الخلافة الإسلامية، عبد القيوم ذلول، دار الأمة للطباعة والنشر والتوزيع، الإمارات الطبعة الثانية سنة١٩٩٠.

شبهات حول الإسلام والرد عليها، لمحمد قطب، دار الشروق بمصر__ القاهرة سنة١٩٩٢.

الغارة على العالم الإسلامي، ا.ل□ شاتلية، لخصها ونقلها إلى العربية: مساعد اليافي، و محب الدين الخطيب، منشورات العصر الحديث، جدة سنة ١٣٧٧الهجري

ولتستبين سبيل المجرمين، للدكتور محمد يسري إبراهيم، دار اليسر بمصر__ القاهرة سنة ٢٠١١.

التبشير والاستعمار في البلاد العربية، للدكتور مصطفى خالدي، والدكتور عمر فزدح، الكتب العصرية بيروت، سنة ١٩٥٣.

الغزو الفكرى والتيارات المعادة للإسلام، علي عبد الحليم محمود، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية سنة١٩٨١.

غزو في الصميم، عبد الرحمن حسن حنبكة الميداني، دار القلم دمشق بيروت، سنة ١٩٨٢.

أساليب الغزو الفكرى للعالم الإسلامي، علي محمد جريشة، و محمد شريف الزيبق، دار الوفاء سنة ١٩٧٩.

التعليم ومستقبل المجتمعات الإسلامية في التخطيط الإسرائيلي ماجد عرسان الكيلاني، دار السعودية للنشر والتوزيع.

حصوننا مهددة من داخلها، محمد محمد حسين، مكتبه المنار الاسلاميه الكويت ١٩٦٨.

مجلة النيوزيک الأمريكية ژمارەی ١٤ مانگی یەنایەری ٢٠٠٤.

مجلة الصمود حرب على الإرهاب أم حرب على الاسلام و قيمه ٢٢-١٠-٢٠١٨

گوتاریک بتناوي بالصوت والصورة حرب على الإسلام أم حرب على الإرهاب نووسيني السعيد الخميسي ١١-٨-٢٠١٨ موقع نافذة مصر.

حرب القيم عبد الكريم بوفره، دار الأحمدية للنشر جدة سنة ٢٠٠٣.

لعبة الشيطان روبرت دريفوس، دار الثقافة الجديدة،

الدعوة الى الاسلام، سير توماس ارنولد، ترجمة: حسن ابراهيم حسن، وه عبد المجيد عابدين، وه اسماعيل النحراوی، مكتبه النهضه المصرية القاهره ١٩٧١،

قصة الحضارة ويل ديورانت، ترجمه محمد بدران، دار الجيل بيروت .

تأريخ الحضارات العام / اندريه ايمار_جنين، ترجمة فريد داغر، يوسف أسعد داغر، منشورات عويدات بيروت.

شمس العرب تسطع الغرب، سيغريد هونكه، : فاروق بيضون، و كمال الدسوقي، دار الجيل بيروت لبنان الطبعة الثامنة ١٩٩٣،

مجلة الأمان اللبنانية ژماره ٥٧ ساڵی دووەم ئازاری ١٩٨٠

مكانة المرأة فی الاسلام، للدكتو محمد عمارة، دار السلام بمصر سنة ٢٠١٠.

مسألة السفور والحجاب عبد الودود شلبى، هدية مجلة الأزهر١٤٠٥هـ

فتايتنا بين التغريب والعفاف د. الناصر العمر.

جريدة الأخبار ژمارة ٢٦ / محرم ١٣٣٧،

من مفاهيم العلوم الاجتماعية أنور الجندي، ، دار الكتاب اللبناني للطباعة والنشر والتوزيع.

مكانة المرأة بين المسيحية والإسلام: سعدية محمد أبورزيزة، رسالة مقدمة لنيل الدرجة العالمية ماجستير بجامعة أم القرى بالسعودية _بمكة، سنة ١٤٠٨هـ.

تحرير المراءة بين الغرب والإسلام، د. محمد عمارة، مكتبة الإمام البخاري للنشر والتوزيع بمصر سنة ٢٠٠٩.

المرأة والأسرة المسلمة، د. عماد الدين خليل عمر، مكتبة التفسير للنشر والإعلان بالعراق_ أربيل سنة ٢٠٠٨.

المذاهب الفكرية المعاصرة د. غالب العواجي، دار العصرية للطباعة والنشر والتوزيع بجدة سنة ٢٠٠٦.

صورة الإسلام في الإعلام الغربي، عبد القادر طاش، الزهراء للإعلام العربي بمصر ١٩٩٣.

المتلاعبون بالعقول، هربت شللير، ترجمه: عبد السلام رضوان، عالم المعرفة بالكويت ١٩٧٨ .

التربية الاعلامية كيف نتعامل مع الإعلام: فهد بن عبدالرحمن الشميري، مكتبة الملك الفهد الوطنية رياض. ٢٠١٠.

حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، لأبي نعيم الأصفهاني، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع.

صورة الإسلام في الغرب، بين حملات التشويه و واجب التصحيح، مجموعة من الباحثين طبعة ٢٠٠٦.

صورة الإسلام في الإعلام الغربي، للدكتور محمد بشاري، دار الفكر _ دمشق٢٠٠٤.

أثر الإرهاب في تشويه صورة الإسلام والمسلمين في الإعلام الغربي، الشيخ عبد الحق بن ملا حقي التركماني، رابطة العالم الإسلامي ٢٠١٥،

صورة الإسلام من وسائل الاعلام الغربية، محمد كمال الدين امام رياض١٤٠٥ الهجرية

لسان العرب، لابن منظور، بيروت الطبعة الأولى ١٩٩٠.

الاستشراق والتاريخ الاسلامي، فوزى، فاروق عمر، الأهلية للنشر، اردن ١٩٩٨ م.

الاستشراق والدراسات الإسلامية، دكتور علي بن ابراهيم الحمد النملة، مكتبة التوبة، رياض،١٤١٨.

الاستشراق ومنهجية النقد عند المسلمين المعاصرين في الاجتهاد، السيد محمد الشاهد، عدد ٢٢، السنة السادسة، شتاء عام ١٤١٤هـ/١٩٩٤م.

تاريخ حركة الاستشراق، الدراسات العربية والاسلامية فى اروبا حتى بداية القرن العشرين، المستشرق يوهان فوك، تعريف عمر لطفى العالم، دار قتيبة، دمشق، ١٤١٧.

فلسفة الاستشراق وأثرها في الأدب العربي المعاصر، أحمد سمايلوفيتش، القاهرة

الدراسات العربية والإسلامية في الجامعات الألمانية، رودي بارت، ترجمة مصطفى ماهر دار الكتاب العربي ١٩٦٧،

حفريات الاستشراق، سالم يفوت، المركز الثقافي العربي، دار البيضاء الطبعة الأولى،

الصورة الغربية والدراسات الغربية الإسلامية في تراث الإسلام، مكسيم رودنسون القسم الأول تصنيف شاخت وبوزورث، ترجمة محمد زهير السمهوري، الكويت: سلسلة عالم المعرفة، ١٩٧٨م.

تهذيب سيرة ابن هشام، عبد السلام هارون، المؤسسة العربية الحديثة الطبعة الثانية ١٩٦٤.

الاستشراق بين الموضوعية والافتعالية، قاسم السامرائي، الرياض دار الرفاعي ١٩٨٣.

المستشرقون، نجيب العقيقي، القاهرة: دار المعارف، بدون تاريخ.

بحوث في الاستشراق واللغة، سماعيل أحمد عمايرة، كلية الآداب الجامعية الأردنية دار وائل للنشر.

جهود المستشرقين في التراث العربي، محمد عوني عبدالرؤوف: المجلس الأعلى للثقافة ٢٠٠٤، ص ٢٣.

المؤتمرات الاستشراقية الحديثة مجلة الشريعة والدراسات الاسلامية الكويت عدد ٤٦.

مؤتمر المستشرقين الدولي الحادي والعشرون في المشرق، فؤاد افرام البستاني، السنة الثانية والأربعون، تشرين أول — كانون الأول ١٩٤٨.

الاستشراق: صورة الشرق في الآداب والمعارف الغربية، ضياء الدين ساردار، ترجمة فخري صالح نشر هيئة أبو ظبي للسياحة والثقافة الطبعة الأولى ١٤٣٣ هـ،

الاستشراق بحث للمستشرقين مالهم وما عليهم/ عمر فروخ: سلسلة كتب

الثقافة المقارنة بغداد العدد ١ بدون تاريخ طبع.

الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري، للدكتور محمود حمدي زقزوق، دار المعارف بمصر_القاهرة.

الاستشراق اهدافه و وسائله، للدكتور محمد فتح الله الزيادى، دار قتيبة ١٩٩٨.

جاذبية الإسلام مكسيم رودنسون، ترجمة: الياس مرقص، الطبعة الأولى دار التنوير للطباعة والنشر، لبنان.

الإسلام والحظارة الغربية، محمد محمد حسين، دار الفرقان بالسعودية_ الرياض.

دراسات في المذاهب الفكرية المعاصرة أحمد علي عبد العال.

موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم، محمد على التهانوى مكتبة لبنان ناشرون، بيروت_لبنان.

العلمانية طاعون العصر كشف المصطلح وفضح الدلالة د. سامي العامري تكوين للدراسات والأبحاث الطبعة الثانية السعودية ٢٠١٨.

تفكيك مصطلح العلمانية: مقال لعبد الرحمن السليمان .الرابط: http://www.atida.org/forums/showthread.php?t=10552

المعجم العربي بين الماضي والحاضر، عدنان الخطيب، مكتبة لبنان ناشرون الطبعة الثانية ١٩٩٤.

العلمـــانيــــة.. نشأتها وتطورها و آثارها في الحيـــاة الإسلامية المعاصرة، د.سفر الحوالي

قراءة فى تاريخ و حضارة أوروبا العصور الوسطى، أشرف صالح، بيروت

٢٠٠٨ شركه كتاب الإلكترونى العربى.

موسوعة قصة الحضارة، ول ديورانت، ترجمته الدكتور زكي نجيب محمود: دار الجيل للطبع والنشر والتوزيع.

الإسلام والرسول في نظر منصفي الشرق والغرب، آل بوطامي آل على، أحمدبن حجر، مكتبة منار السبيل _الدوحة.

وجهة الإسلام الحركات الدينية في١٩٩٣، مجموعة من المستشرقين .مركز المسبار.

الإسلام فى الغرب، جان بول رو، ترجمه نجدة هاجر، و سعيد الغز، المكتب التجاري للطباعة والنشر.

الرجل الصنم، ضابط تركي سابق، ترجمه عبدالله عبد الرحمن مؤسسة الرسالة، چاپی دووەم ١٨٩٢

فكرة القوميه العربية على ضوء الاسلام د صالح العبود. دار الطيبة للصبع والنشر والتوزيع السعودية.

العلمانيون والقران الكريم الدكتور، احمد ادريس طعان، دار ابن حزم الرياض ٢٠٠٧،

اعلام الموقعين، لابن القيم، بيروت دار الجليل ١٩٧٣.

العلمانيون العرب و موقفهم من الإسلام، مصطفى باجو، المكتبة الإسلامية ٢٠١٢ مصر.

الحركات الإسلامية في منظور الخطاب العربي المعاصر، لتركي علي الربيعو، المركز الثقافي العربي المركز الثقافي العربي.

الجذور التاريخية للشريعة الإسلامية، خليل عبد الكريم، هينا للنشر.

الإسلام وأصول الحكم، على عبدالرازق، القاهرة.

السلطات الثلاث في الدساتير العربية المعاصرة د. سليمان محمد الطماوي، دار الفكر العربي.

تحطيم الصنم العلماني، محمد شاكر شريف دار البيقار.

مجموع فتاوى لابن تيمية.

أثر الفكر العلماني في المجتمع الإسلامي د. محمد رشاد عبد العزيز دار الكتب المصرية.

الحركات النسائية في الشرق وصلتها بالاستعمار والصهيونية العالمية، محمد فهمي عبد الوهاب دار الاعتصام.

الاسلام قوة الغد العالمية، باول شمتز، ترجمة الدكتور محمد شامة، الناشر مكتبة وهبة بمصر.

مقال عن المنهج رينيه ديكارت، ترجمته محمود محمد الخضيري، دار الكتاب العربي)

# ناوەڕۆک

ئیسلام وەک ئایین و دونیابینی لە بەرانبەر خۆرئاوا وەک جوگرافیا و دونیابینی، لە چەندین قۆناغی جیاواز بە هەموو کەرەستە جیاوازەکانی جەنگ و بەرەنگاری و داگیرکاریی سیاسی و هزری، بەرانبەر یەکتری وەستاونەتەوە.

دوای ڕووخاندنی خەلافەتی عوسمانی و هەڵکشانی هێزی ئیمپریالیستیی خۆرئاوایی و پارچەپارچەبوونی جیهانی ئیسلامی، دەرفەتێکی لەبار دروستبوو بۆ ئەوەی خۆرئاواییەکان تەواوی ویست و پیلانەکانیان لە جیهانی ئیسلامیدا بەرجەستە بکەن. ئێستاش خۆرئاوا لە تەواوی ئاستە جیاوازەکاندا لە جەنگێکی کراوەی هزری و ئایدیۆلۆژی و سەربازی دایە بەرانبەر بە ئیسلام.

ئەم پەڕتووکە بەشێوەیەکی بابەتی تیشک دەخاتە سەر ئەو پیلانانەی کە خۆرئاواییەکان زیاتر لە سەدەیەکە کاری لەسەر دەکەن، بەتایبەتی بابەتەکانی پەیوەست بە کرانەوە و مافەکانی مرۆڤ و ئافرەتان و کێشەی کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکان. دواتر هەر لەم پەڕتووکەدا بە لەبەرچاوگرتنی پرەنسیپە زانستییەکان، تیشکخراوەتە سەر بابەتەکانی عالەمانییەت و حوکمڕانی و وەلانانی شەریعەت و بە خۆرئاوایی کردن و تیرۆر و ئیسلامۆفۆبیا و چەندین بابەتی کاریگەری تر.

نرخ : ٦٠٠٠ دینار